# ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب: دیوانی کەریم ئاغاوەیسی
- ناوی نووسەر: کەریم محەمەد ئەحمەد (کەریم ئاغاوەیسی)
- بابەت: شیعر
- تایپ: نووسەر
- هەڵەبڕی: یاسین کەریم محەمەد
- نەخشەسازی بەرگ: شێخ کامیل
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا
- ساڵی چاپ: ٢٠٢٢ زاینی
- تیراژ: (٥٠٠ ) دانە
- نرخ: (١٠ ٠٠٠) دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە سپاردنی ( ١٩١٣ ) ی ساڵی ٢٠٢٢ ی پێدراوە

# پێشکەشــە :

- بەو کەسانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەمدا وەك مامۆستایەك ئامۆژگاریان کردووم، سوودم لە وتەکانیان وەرگرتووە.
- بە سەرجەم نووسەران و شاعیران کە زۆر سوودم لە خوێندنەوەی بەرهەمەکانیان بینیوە.
- بە سەرجەم هاوڕێیان و شاعیران و نووسەرانی نیشتمانەکەم.
- بە هاوسەر و سەرجەم منداڵەکانم کە هاوکارم بوون لە جێبەجێ کردنی کارەکانمدا.

# سوپاس و پێزانین:

- سوپاس وستایش بۆ خوای باڵادەست کە ئەو بەهرەی پیَ بەخشیووم کە توانیوومە پێشتر بەرهەمێکی مێژوویی و ئێستایش ئەم بەرهەمەم بخەمە بەردەست خوێنەران و سەرخەرمانی کتێبخانەی کوردی.
- سوپاس و پێزانینم بۆ برای بەڕێز مامۆستا بەکر کانی هەمزەیی شاعیر، داواکارم لە خوای گەورە کە تەمەن درێژ و تەندروست باش بێت، کە هاوکارم بوو لە دیزاینی ناوەوەی ئەم بەرهەمەدا.
- سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە بە وشەیەکیش بێت هاوکارم بوون لە بەچاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمەدا.

# پێشەكی

بە درێژایی مێژوو شیعر هەڵگری سیحری زمانی دەربڕین بووە بەڵێ هۆنراوە دەزگایەكە بۆ ئەوەی مرۆڤ مانای لە خەیاڵێكی نازك و شیریندا پێ بداتەوە سۆزی خوێنەر وەكو كارەبا ڕاكێشێ و ڕۆحی بیسەری هۆنراوەكە بهەژێنێ ئەگەر ئەو هۆنراوە لەو ئاستەدا نەبوو بە هۆنراوە نادرێتە قەڵەم عەرەبەكان لەم بارەوە دەڵێن:

( اذا الشعر لم یهززك هذا لا یخال أن یقال له شعر ) ئەگەر هۆنراوە نەتهەژێنێ و نەتهێنێتە حەشۆكە وجۆشوخرۆش نابێت بە شیعر بیژمێریت و بیدەیتە قەڵەم شاعیرە گەورە و ناوەزەكانی كورد پەیڕەوی قوتابخانەی كلاسیك بوونە لە ئەدەبدا سەرتا سەرهەڵدانی ئەم چەشنە ئەدەبە وەك بزوتنەوەیەكی بە تەوژم لە ئەوروپادا خۆی نواندووە وردتر بڵێین.

لە ئیتالیادا سەری هەڵداوە ئەوروپایەكان كەوتنە ئەوەی خۆیان بە ئەدەبی كۆنی خۆیانەوە نەبەستننەوە و دەست بكەن بە مژینی شیلە و هەلاڵەی بیرفەلسەفەو داستان و كارەساتی ناو ئەدەبی یونانیەكان و ڕۆمانەكان ئەم بزوتنەوەیە لەسەر دەستی دانتی لە كۆمیدیای یەزدانی،، و بترارك و بوكا شێوە و بتەوانەكانی هەڵگیرا ، بەتایبەتی دوای داهێنانی چاپ و بە هۆی دەربەدەر بوونی زاناكانی (( بیزنطة )) دوای فەتح كردنی (( قسطنطینیة )) ١٤٥٣م ، لە لایەن سوڵتانی عوسمانی محەمەدی فاتحەوە و گیرسانەوەی ئەو زانایانە لە ئیتالیادا ئەم بزوتنەوەیە پەرەی سەند و فەرەنسا و بەریتانیا و وڵاتەكانی تریشی گرتەوە و بە تەواوی بوو بە پێوانەیەك و زاراوەیەكی تایبەتی بۆ

ناسینەوە و جیاکردنەوەی ئەدەبی کۆن و نوێ تا لەسەردەمێکی تازەترا بە تایبەتی لە سەدەی حەڤدەهەمدا ڕەخنەگر و لێکۆڵەرەوەکان زاراوەی کلاسیزمی نوێشیان داهێنا و داوایان لە شاعیر و نووسەرەکان دەکرد کە پەیڕەوی کۆنینەکان بکەن و لاسایی یونانەکان و ڕۆمانەکان بکەنەوە و بایەخی زۆر بە ژیری و چەسپاوی و فکری بە کەڵك و هێمنی بدەن...

بەڵێ ڕاستە پێوانەی ئەدەبی کلاسیکی ئەورووپی دەق و دەق وەك هەیە بە هەموو ڕەگوڕیشە و مەبەست و مانا و پەل و هاویشتنی لقوپەلێکەوە لەگەڵ ئەو چەشنە بەرهەمە ئەدەبییانەی کوردیماندا ناگونجێت و تەواو دەرناچێت ئەویش سەبارەت بە جیاوازی قووڵ و ئاشکرای نێوان باری ژیان و شێوەی ژیانی کۆمەڵگای ئەورووپی و کوردەواری بەڵام خۆ ئەمەش مانای ئەوە نیە کە سامان و کەلەپوری سەردەمێکی دوور و درێژی نەتەوەکەمان نابێ بە پێوانە زاراوەی کلاسیزمی یان (( کلاسیك )) بپێورێت، ئێمە ئەگەر بەوردی سەرنجێکی تابلۆی ڕەنگین و فراوانی ئەم چەشنە شیعر و ئەدەبەمان بدەین و بە شوێن چەند ڕەگو ڕیشەو مەبەستێکی ئەدەبی کلاسیزمدا بگەڕێین ئەوا بە ئاسانی چەند گەوهەر و هەوێنێکی سەرەکی و دیار دەکەوێ و بە تایبەتی لە شیعرەکانی حەزرەتی مەولەوی تاوگۆزی و بێسارانی و ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری و خانای قوبادی وچەندین شاعیری گەورەی تری میللەتەکەماندا و لە شیعری ئەم شاعیرانەدا بە تایبەتی گەوهەر و هەوێنی بابەتی ژیری و بیر و باوەڕی میسالی ئایینی و فەلسەفی و بایەخدانی تەواو بە ڕوخسار و وشەدەربڕین لەسەر حیسابی ناوەڕۆك لەلایەن هەندێکیانەوە بەو نەریت و دەستووره گرانو پێچیدەوە کە شاعیرانی کلاسیکی کوردی پەیڕەوییان کردووە بەم چەشنە دابڕان و تێ نەگەیشتنی بەرهەمەکانیان لە لایەن گشتەوە و مۆرکی ئەو ئەدەبە

بە ئەدەبی تایبەتی ناوزەد کراوە شیعری کلاسیکی کوردی لە لقوپۆکانیدا وەك غەزەلی پیاهەڵدان، هەجو، موناجات و خۆهەڵکێشان (فەخر)، و پرسەورەسادا بە شێوەیەکی ستوونی (عمودی) هاتووەتە خوارەوە بە پێی دەستوور و نەریتی قافیەی یەکگرتوو کە زنجیر و کۆتێکی سەخت و گران بووە بە دەست و قەڵەم و مێشکی شاعیرانی کورد و ئەم شێوەیە زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمی شیعری کلاسیکی کوردی گرتۆتەوە، و لەگەڵ ئەم حاڵەتە سەختەو دژوارەدا کە ڕووبەڕوی شاعیری کلاسیکی کورد بووەتەوە بەرهەمی بەرز و بایەخداریان خولقاندووە و مەولەوی تاوگۆزی سەرقافڵەی ئەم شاعیرانەیە لەم بوارەدا شاعیری کلاسیکی کورد لە بەیتەکانیدا چەشنە سەربەخۆیی یەکی پەیڕەو کردووە غەزەلی وا هەیە حەوت بەیتە بەیتی یەکەمی دڵدارییە دووەمی بێ وەفایی چەرخ و دونیایە بەیتی سێیەمی شاعیر سکاڵا لە دەست نەفسی ئەممارەی خۆی دەکات و ئەم حاڵەتە لە شیعری شاعیرە عەرەبەکاندا بە ڕوونی خۆی دەرخستووە و ئەمەیش لە قەسیدەکەی (( كعب بن زهير )) دا کە لە وەسفی پێغەمبەردا (ص) وتوویەتی و بە قەسیدەی (( البردة ))[١] بەناوبانگە بە ڕوونی و دەردەکەوێ ناوبراو وەکو نەریتی شاعیرە عەرەبەکان سەرەتای شیعرەکەی بە
غەزەل دەست پێکردووە و ڕوی کردووەتە خۆشەویستەکەی و دەڵێ:

بانَتْ سُعادُ فقَلْبي اليَوْمَ مَتبولُ مُتَيّمٌ إثرَها لم يُفْدَ مَكْبولُ
وَمَا سُعَادُ غَداةَ البَيْن إذْ رَحَلوا إلاّ أغَنُ غضيضُ الطَرْفِ مَكْحُولُ
هَيْفاءُ مُقْبلَةً عَجْزاءُ مُدْبرَةً لا يُشْتكي قِصَرٌ مِنها ولا طُولُ

---

[١] (ئەلبوردە) ناوی قەسیدەیەکی کەعبی کوڕی زوهەیرە کە خوێندیەوە بۆ پێغەمبەر (د.خ) پێغەمبەر (د.خ) پێی خۆش بوو، بوردەکەی خۆی بەخشی بە کەعب، بوردە واتا: عابا (ئەو پۆشاکەی دەیپێچا بە خۆیەوە) بەو هۆیەوە قەسیدەکە ناونرا (البردە).

بە لای ئەو شاعیرانەی کە بـە کێشی عـەروز (عـروض) شـیعریان وتـووە شـیعری ڕاستەقینە ئەو شیعرەیە کە لەسەر کێشی عەروزی عەرەبی بێت بـە لای تێکـڕای شاعیرانی کلاسیکەوە وەك قاڵب و چوارچێوەی شیعر غەزەل قەسیدە چوارینە و تاك و پێنج خشتەکی و مولەممەع و تەرجیع بەند و موعـەمما هەیـە و هـەبووە شاعیری سەرکەتوو تەواو بە دەستەڵات بە پێوەری کلاسیك بەو شـاعیرانە دەڵێن کە دیوانی شیعرەکانیان لە هەموو پیتێکی هیجایی وەك قافیە تیا بێـت ئەمـەش مانای ئەوەیە ئەو شاعیرە هونەرمەندە تەواو بەسـەر وشـەزمان و بـەکار هێنـانی قافیـە جیاوازەکـانی سـەر بـە هـەموو پیتـە هیجاکانـدا زاڵـە سـەلیقە و بـەهرەی شـاعیرانەی بـە چەشـنێك سـەرکەوتووە کـە بەرامبـەر بـە هـیچ وشـەیەکی ڕەق و دژوار و سەختی قافیە، دانامێنێ و پەکی ناکەوێت ڕێزدار کاك کەریم ئاغاوەیسی بەندە بە شاعیرێکی باش هەڵیدەسەنگێنم کەرەسەی شـیعرییەکانی لـە ئاسـتێکی بەرچاودایە و دەبینین لەسەر جەم لقوپۆکانی شیعری کلاسیکدا ئەسـپی تـاوداوە لەیرادا بـۆ نموونـە چـەند شـیعرێکی هەڵبـژێردراوی دەخەمـە ڕوو بـە بۆچوونی خـۆم هەڵسـەنگاندنەکەم سـەبارەت بـە کـاك کـەریم وەك شـاعیرێکی بـە توانـا دەسـەڵێنێ لـەم چـەندین شـیعرەدا سـەرجەم بابەتـەکانی شـیعری کلاسـیك بـە ڕوونی تێیاندا بەدەردەکەوێ سەیرکە

## لە وەسفی عێلەکەیدا کە عێلی گەورەی جافە چۆن پێداهەڵیداوە و دەڵێ:

سەربەرزیە بۆ من کە لە نەوەی ئێلی جافم
لە تیرەی ئاغاوەیسی و جافێکی سینە سافم

دەسـتپاکی و بەخشین و خـزمەتی مـیوان
خـەسڵەتێکن لـە نـەریتی بـاب و بـاپیـران

یاخـوا دیوەخان و دەواری جاف هـەربمـێنێ

جێگـەی پەنـابێ بۆ ئـەوەی پەنـای بۆ دێنێ

## ئەم چوارینەی لە شیعری (( مناجات ))دا

لەژێر ناونیشانی (ئەی پاکی بێگەرد) دەڵێ:

ئـەی پاکـی بێگەرد خـاوەنی هەمـوو عالـەم

ئـەی شــــیفـای دەردی دڵ بـە بـێ مـەرهەم

تـاعەتی کەمە کەریم قورسـە بـاری تـاوانی

لە ڕۆژی جەزا نیەتی نە ماڵ و نە دەرهەم

بـە چـاوی سـۆزەوە لـە کـردەوەی بڕوانـە

کە لاپەڕەی کار و کردەوەی، پڕ لـە تاوانـە

نائومێدی نەکەی لـە دەریای پڕ لـە سۆزت

کە سۆزی تۆ دەریایەکی بێ پەی و فراوانە

## لە خۆشەویستی نیشتماندا دەڵێ:

ئـاخ وەتەن بـۆ چی وەها فەوتـاوی

بـۆ چی بـەم شـێوە کـزو دامـاوی

خـۆزگـە ئەمـزانی هـۆکـاری چییە

وەهـا لـــە گـێژی خـەما خـنکاوی

دەسـتی نـاپاکە وەهـای لێ کـردووی؟

یاچارەنووسە بەم دەردەی بردووی؟

داخی بێکەسی یـان جەوری ڕۆژگار

وەها بەم شـێوە هەروەکو مـردووی؟!

هەرچەند ئەتبینم وەها بێ ڕەنگی
کە لێو بەباری و وەك سیا سەنگی
قاژەی جەرگم دێ بۆ زەبوونی تۆ
نازانم تاکەی وەها بێ دەنگی؟

ناکەس و ناحەز دەورەی لێ داوی
بە دەستی دوژمن گیرۆدەی داوی
بەڵام ئومێدت هەبی کە ئەڵێن
ستەم هەتا سەر نامێنی باوی

**ئەمیش پێنج خشتەکییەکە لەسەر شیعرێکی دۆستێکی بەناوی مامۆستا فایەق شێخ لەنگەریوە وتوویەتی:**

ئازیز بۆ تۆ پەرێشانم
دڵ پەشێو و سەرگەردانم
پێشکەشت بێ دڵ و گیانم
زۆر لەمێژە چاوەڕوانم
بۆ گوڵزاری حەزەکانم

باچەند ساتێك خەم بەبادەم
لەگەڵ شادی دەس لەمل کەم
بلێم ئۆخەی دوورم لە خەم
وەك پەپوولە گەشتێ بکەم
هێدی، هێدی، سەفەر بکەم

لەگـەڵ نەسـیمی بـەربـەیان
یان کـرێـوەی وەرزی زسـتـان
کـەوتوومـە ڕێ بـەبـێ وچـان
ڕێگەش دوورە، ڕووەو کوێستان...
بۆ هەر چوار پارچەی کوردستان...
بـۆ ئـازادی ئـەبـێ هـەوڵـدەم
بـەکـردەوە نـەك هـەر بـەدەم
ئەوسـا ئەبـێ بـۆنـی گوڵ کـەم
لــە لالــەزارێ پـشــوو بـەم
لەنـاو بـاخ و گـوڵـزارو چـەم
لەنێو گوڵ و گوڵاڵەی سوور
گشت بگەڕێم لەخوار و ژوور
سـنە و سـابـلاّخ، تـا شـارەزوور
بـە ئـازادی و بـەبـێ سـنـوور
بـبـڕم ڕێگـایـەکـی زۆر دوور

## سەبارەت بە خەم و پەژارە دەڵێ:

کاتێ منالّ بووم ئەمبیست وشەی خـەم
زۆر لام سـتەم بـوو، کـە لێی تێبگەم
وەکو وشــەیەك ئەمبیست دەمــاودەم
ئـەمـدا بـە ڕانـا و ئـەم وت داخـەکـەم

ئەم وت ئای خۆزگە خەم چییەو چۆنە
چۆنـە کـــە ئەڵــێن جێگای دەروونـە
خـۆزگـــە ئـەمـزانی ڕەنگی چ جــۆرە
ســپییە، ڕەشــە، شـــینە، یـان مـۆرە
کاتێ گـەورە بـووم گـەیـمە خزمەتـی
چـەشـــتم تــاڵاوی دەردو مـەینـەتـی
ئـەوسـاکە زانـیم نـادیارە و بـێ ڕەنگ
باری مەینەتە و دڵ ئەکات بە سـەنگ
دواتر بـووم دەرکـەوت چۆنە سیفەتـی
هـەنـاسـەی سـارد و ئـازاری سـەختـی
دووکەڵی سەختە ڕووی کردە هەرکوێ
ســتەمە ئـاســان شــادی تـیــا بـڕوێ
کــــە لـەنـێو دڵا ڕیـشـــــەی داکوتـا
ئـەبێتـە هــاوڕێ و ئـاشــنـا لەگەڵتـا
ســـتەمە ئــاســان بــەر بـدا یـەخـەت
بــاربـکـا لــەلات پـــەژارە و مـەیـنـەت

**دەربارەی سیاسەتوانانێکی نەخوێندەوار و بێ کەڵك کە سیاسەتیان ئازاربەخش کردووە دەڵێ:**

ئـای چەنـد ڕقمە لـە سیاسـەت
لــە گـەنـدەڵـــی و نـاعـەدالــەت
ئـای چـەنـد ڕقمە، لە کـەسانـێ
هـێـنـدە گـەوج بـێ کـە نـەزانـێ

بەردێ لەسەر بەردێ دانێ
هێندە تەمبەڵ بێ نەتوانی
تێبکۆشی بە شان و باڵ
بۆ بژێویی ماڵ و مناڵ
ئای چەند ڕقمە من لە چرووك
لە کەسانی ڕەزیل و سووك
ئای چەند ڕقمە، لە درۆزن
بێ جیاوازی پیاو بێ یان ژن
ئای چەند ڕقمە، من لە دووڕوو
ئای چەند ڕقمە، من لە جادوو
ئای چەند ڕقمە، لە مناڵێ
باوکی لە دەستی بناڵێ
ئای چەند ڕقمە لە ماستاوچی
چاکەت تەکێن، ئاژاوەچی
ئای چەند ڕقمە لە بێ پەیمان
لە کەسانی هەرزە و دوو زمان
هێندەی ئەم هەموو ڕقانە
ڕقمە لەوەی بێ ویژدانە

## لە غەزلیشدا دەڵێ:

وتم: ئەی دڵ بۆ وا داماوی
کامیان سەرنجی زۆر ڕاکێشاوی

بـــزەی ســــــــــــەر لـــێوی
یــان تـیـلـــــــمـەی چـــــــاوی
دڵ هـاتـە جواب بـە سـەد ئێشـەوە
بـە دەروونێکی پـڕ لـــــە ڕێشـەوە
وتی: من خۆمم پێشکەش کردووە
هیچ نیم بە تەنگی کێشمەکێشەوە

## دووبارە لە وەسفی ئێلەکەیدا دەڵێ:

پێناسەی ئێل و هۆزی گەورەی جاف
بۆت پێناسەکەم ڕاست و بێ خیلاف
گـــەورە و بچـووکی ڕۆژی تەنگانـە
شـــێرە، دلـێرە، مـەردی مەیدانـە
بـۆ وەعـد و بەڵـێن خـاوەن وەفایـە
بـۆ کەسی بێ کەس پشت و پەنـایـە
گـــەورە و بـچـــووکـیـان دڵــفـراوانن
خـاوەن ڕەوشـــت و ئـاکاری جـوانن
مـــەرد و دلـــێرن ســـەردار و شوانی
هەمـوو وەك بـران گشت تیـرەکـانی
خەسڵەتی جوان و خزمەتی میوان
خـاوەن کـەرەمن، خـاوەن  دیوەخـان

## لە پەیڕەوکردنی شیعری کلاسیکدا لە چوارینەیەکدا سەبارەت بە لێبووردن ( چاو پۆشی کردن ) دەڵێ:

لەبەر یارە دەمەوێ لە نەیار، سەرفی نەزەرکەم
لەبەر حوبی ئیمان دەمەوێ کینە لە دڵ دەرکەم
دەمەوێ هەر وەکو داری بەردار بم هەمیشە
کە نەیار بەردم تێگرێ، منیش بەری بەسەرکەم

## وە سەبارەت بە نامەگۆڕینەوی شیعری، لە نامەیەکی شیعریدا کە بۆ دۆستێکی خۆی نووسیویەتی دەڵێ:

بەناوی خوای گەورەو بالادەس
کە بەخشندەیە لەگەڵ هەموو کەس
بۆ برای بەڕێز مامۆستا و شاعیر
مامۆستا بەکر دانا و ڕۆشنبیر
دونیایەك سوپاس بۆ وتەکانت
لە بۆ پەیام و هۆنراوەی جوانت
هەمیشە خۆش بێ سەر پەنجەکانت
بۆ نەخشاندنی شیعر و پەخشانت
بەرەکەتدار بێت خەڵە و خەرمانت
خەرمانی شیعرو هۆنراوەکانت

**لە (( مناجات ))دا دووبارە لە شیعرێکدا بەناوی ( چۆن سوجدە نەبەم ) دەڵێ:**

چۆن سوجدە نەبەم بۆ خالقێ، کە سارێـژ ئەکا هەموو برینێ!
چۆن سوجدە نەبەم بۆ خالقێ، من نـاییبینم و ئەو من ئەبینێ!
چۆن سوجدە نەبەم بۆ خالقێ، کە ناوی پیرۆزی تاك و تەنهایە
چۆن سوجدە نەبەم بۆ خالقێ، کـە نـــاوی جـوانـی ( الله )یـە
چۆن سوجدە نەبەم بۆ خالقێ، کە خالقی هــەردوو دونیــایـە
چۆن سوجدە نەبەم بۆ خالقێ، خاوەن پێنووسی ڕۆژی جەزایە

**لە شیعری عەربیشدا لە (( مناجات ))دا هەمان شیعری خۆی ( چۆن سوجدە نەبەم ) بە عەرەبی نووسیویەتی لەژێر ناونیشانی ( كَـيفَ لا أَسجُـدُ ) دەڵێ:**

كَـيفَ لا أسـجُـدُ لِـخـالـقـاً، يُداوي جَرحي وَ أحزاني
كَـيفَ لا أسـجُـدُ لِـخـالـقـاً، إنـي لا أراهُ وَ هـوَ يَـراني
كَـيفَ لا أسـجُـدُ لِـخـالـقـاً، لِـمَـن اسـمـهُ واحِدُ الأحد
كَـيفَ لا أسـجُـدُ لِـخـالـقـاً، لِـمَـن اسـمـهُ اللّهُ الصَـمَـد
كَـيفَ لا أسـجُـدُ لِـخـالـقـاً، خالقُ الكَونِ وَ الأسـبـاب
كَـيفَ لا أسـجُـدُ لِـخـالـقـاً، صاحبُ القلمِ يَومَ الثواب

**لە شیعری تێهەڵكێشیدا کـە وشەی عەربی تێهەڵكێش کردووە دەڵێ:**

(من لا يقولُ) ئەم ساڵ، هەزاران خۆزگەم بەپار
خاکێـکـی (كُـلَ نفـطٌ)، (و شـــعـــبـهُ) هـــەژار
(شَــبـابـنـا) بـدون کـار، (جالسين) لـە بن دیـوار
(الناسُ) گشتی (حَزين)، (فـي القريةِ أو) لە شـار

(أکـثرُ النـاسُ) نیـیـانـە، نـە جـێگـا (ولا دینــار)
(و العـمـلاء) هـەیـانـە، تەلار و (قصر) و دۆلار
(و الفـقـیرُ کُـل) کـاتـیٚ، (یعـیشُ) لـە ژێـری بـار
(شَعـبٌ نظـیفٌ) دلٚـیـان، (و أعـدائـه ٗ) وەکـو مـار

لە کۆتاییدا دەڵێم بەهیوای سەرکەوتن و سەربەرزی بۆ نووسەر و شاعیری بەڕێز کاك کەریم ئاغاوەیسی و هیوادارم هەمیشە بەرهەمی باشتر و زیاتر بخاتە خزمەتی میللەتەکەی.

**د. حەسەن جاف**

٧ / ٥ / ٢٠٢٢

# (کورتەیەك لە ژیانی من)

**ناو:** کەریم محەمەد ئەحمەد نەزەرخان ناسراو بە (کەریم ئاغاوەیسی).

لە ئێستادا بەرپرسیاریەتی (تیرەی ئاغاوەیسی)م لە ئەستۆ گرتووە (براگەورە و سەرۆکی عەشیرەتی ئاغاوەیسی)م کە تیرەیەکە لە تیرەکانی ئێلی جاف.

**لە دایکبووی:** ساڵی (١٩٦٤ز) لە بناری بەمۆ.

لەبەر ئەوەی بناری بەمۆ ناوچەیەکی سنووری بووە لە لایەکەوە، وە لە لایەکی تریشەوە لەبەر سەرهەڵدانی خەباتی چەکداری شۆڕشی کوردستان، بۆیە هەر لەسەرەتای ساڵی شەستەکانی سەدەی ڕابوردووەوە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە تووشی زەرەر و زیانێکی زۆر بوون، دواتر لە کۆتایی ساڵی شەستەکان هەر لەو سەدەیەدا هەموو دانیشتوانی ناوچەکە بە یەك جاری توشی ئاوارەیی و دەربەدەری بوون، بۆیە هەر لە تەمەنی منالیمەوە خانەوادەکەمان یەکێك بووە لەوانەی کە توشی ئاوارەیی و دەربەدەری بووین، لە ساڵی (١٩٧٠ز) لە شاری دەربەنیخان نیشتەجێ بووین، لەبەر سەختی ژیان لە ساڵی (١٩٧١ز) لە شاری بەغدا نیشتەجێ بووین و دواتر لەبەر بارودۆخی سیاسی و ناهەمواری کورد لە شاری بەغدا، لە ساڵی (١٩٧٧ز) لە شارۆچکەی جەلەولا نیشتەجێ بووین، دواتریش لە ساڵی (١٩٧٩ز) لە شاری فەلوجە نیشتەجێ بووین، لە ساڵی (١٩٨٠ز) وەك کاتب دامەزرام لە قوتابخانەی (مشتل) لە شاری فەلوجە، وە لە هەمان کاتیشدا بەردەوام بووم لە خوێندن لە قوتابخانەی فەلوجەی شەوان (مەسائی)، بەڵام بەهۆی پەیوەندی نەکردن و نەبوونم بە (بەعسی) چەندین جار لێکۆڵینەوەم لەگەڵ کراوە، بۆیە دوای هەستکردن بە مەترسی لەسەر ژیانم لە

بەهاری ساڵی (١٩٨٢ز) ناچار بووم لە پۆلی سێی ناوەندی دەستبەرداری خوێندن و فەرمانبەریەکەم ببم و لەگەڵ خانەوادەکەمدا گەڕاینەوە بۆ کوردستان و لە گەرمیان لە شاری کەلار نیشتەجێ بووین.

**باری کۆمەڵایەتی:** لە ساڵی (١٩٨٥ز) خێزانم پێکهێناوە، لە ئێستادا خاوەنی سێ کوڕ و دوو کچم بە ناوەکانی (سۆران، محەمەد، یاسین، ژیان، هەیفا).

**ئاستی خوێندن:** لە پۆلی (سێی ناوەندی) دەستبەرداری خوێندن بووم بە هۆی ئەو هۆکارانەی کە پێشتر ئاماژەم پێکرد.

بەڵام هەر لە تەمەنی لاویمەوە خولیای خوێندنەوەی شیعری زۆربەی شاعیرانی گەلەکەمان بووم وەك: پیرەمێرد ، قانع ، گۆران ، وە هەروەها شاعیرە کۆنەکانیش وەك: نالی ، سالم ، مەولەوی و زۆربەی شاعیرانی تر، شیعری ئەو کەڵە شاعیرانە زۆر کاریگەری هەبووە لەسەرم، بۆیە خولیای نووسینی شیعر بووم و لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٠ز) دەستم کردووە بە نووسینی شیعر، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەو شیعر و هۆنراوانەم تیاچوون بەهۆی دەربەدەری و ئەو نەهامەتیانەی کە پێشتر باسم کرد، بەڵام دوای هەوڵ و ماندوو بونێکی زۆر بە پشتیوانی خوای گەورە توانیم لەم ساڵانەی دواییدا ئەم شیعرانە بنووسم و لەم دیوانەدا کۆی بکەمەوە لەژێر ناونیشانی: دیوانی کەریم ئاغاوەیسی، کە بەشێك لەم شیعرانەی کە نووسیومە هەر شیعرێکی خەمێك لە خۆی دەگرێت کە زۆربەی بابەتەکانی بابەتی: خەمی گەل و نیشتمان و ئامۆژگاری و هاندان بۆ کاری چاکەوچاکەکارییە، وە هەروەها چەندین بەشی جۆراوجۆر لە خۆی دەگرێت وەك: بەشی هەستی دەروون، بەشی کوردایەتی، بەشی کۆمەڵایەتی، بەشی خۆشەویستی و ئەوین، بەشی ئاینی (مناجات)، بەشی شیعرە چوارینەکان، بەشی شیعرە تاکەکان ، بەشی پێنج خشتەکی، بەشی نامەگۆڕینەوەی شیعری،

بەشی تێهەڵکێش و شیعری عەرەبی، کە چەند شیعرێکە بە زمانی عەرەبی نووسیومە، وە هەروەها چەندین شیعر و هۆنراوەی تریش کە وەشەکانی بە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی تێهەڵکێش کراون و لە هەمان کاتیشدا لە چەندین شیعردا ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) تێهەڵکێشم کردووە، ئەویش لەبەر گرنگی ئەو ئایەت و فەرموودانە و لەبەرچاوگرتنی توانا و دەسەڵاتی خوای پەروەرگار، وە هەروەها چەندین بابەتی تریش لە خۆی دەگرێت، بۆ نموونە: لە بەشی کوردایەتیدا بابەتی شیعرەکانی باسی ئەو ستەمانە دەکات کە لە گەلی کورد کراوە بەدرێژایی مێژوو هەتا ڕۆژگاری ئەمڕۆ، بەڵام گەلی کوردی ستەمدیدە ڕۆڵەکانی هەرگیز کۆڵیان نەداوە لە خەبات و هەمیشە گۆرەپانی خەباتیان بە خوێن نەخشاندوە، وە شیعرەکانم باسی ئەو پەیماننامە شوومە دەکات کە بووە هۆی دابشبوونی خاکی کوردستان، وە هەروها باسی لێهاتووی و زانست و ڕۆشنبیری ئەدیب و شاعیران و نووسەرانی کورد دەکات، بۆیە هیوادارم کە توانیم بێت بەم بەرهەمە شیعرییەم خزمەتی ئەدەب و هونەری کوردیم کرد بێت و لە ڕێگەی شیعرەکانمەوە هەموو خوێنەرێکی بەرێز زیاتر ئاشنا بێت لەو ستەمانەی کە لە گەلەکەمان کراوە.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە کە دڵی هەموو لایەك دووربێت لە خەم و هەمیشە شاد و ئاسوودە بن.

**نووسەر:**

**کەریم ئاغاوەیسی**

**کەلار ٧ / ٥ / ٢٠٢٢**

# وتەی کەسایەتیەکان

وتــە و بۆچــوونی بەشــێك لــەو نووســەر و شــاعیر و ئــەدیب و کەســایەتیەکانە ســەبارەت بــە کەســایەتی مــن وەك (کــەریم ئاغاوەیســی) و بــەرز نرخانــدنی بەرهەمە شیعرییەکانم.

هەرچــەند زۆرن ئــەو کەســایەتی و شــاعیر و نووســەرانەی کــە ســەبارەت بــە کەسایەتیم یان شـیعرەکانم، وتـە و بابـەت و بۆچوونی خۆیانیـان لـەو بارەیـەوە نووســیووە، ئــەم دۆســت و هــاوڕێ بەڕێزانــەی کــە باســیان دەکــەم و دەقــی نووسراوەکانیانم تۆمار کردووە لەم دیوانەمدا بەشێکن لەو کەسایەتی و شاعیر و ئەدیب و نووسەرانە:

١. شاعیر لەتیف هەڵمەت
٢. کاك فریا جاف
٣. دکتۆر حەسەن جاف
٤. پرۆفیسۆر ئاراس محەمەد ساڵح
٥. دکتۆر دارا حەمید محەمەد
٦. شێخ سەعید شاکەلی
٧. مامۆستا عومەر عەلی شەریف
٨. دکتۆر حسین اسماعیل خان دەلۆ
٩. مامۆستا بەکر کانی هەمزەیی

# ١ـ شاعیر لەتیف هەڵمەت[٢]

شاعیر لەتیف هەڵمەت یەکێکە لەو شاعیر و ڕۆشنبیر و کەسایەتیانە کە لە بابەتێکدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە شیعرەکانم نووسیویەتی و دەڵێ:

وتەیەکی کورت دەربارەی

شیعرەکانی کاك کەریم ئاغاوەیسی

دارستان و باخ و بێستان و گوڵستان دەیان و سەدان و هەزاران جۆر دار و درەخت و شەخەڵ و نەمام و دەوەن و گوڵی تیایە و دەیان و سەدان جۆر میوەی جۆربەجۆر دەگرن و هەموو رووەکێك و هەر میوەیەك تایبەتمەندێتی خۆی و خەسڵەتی جیاواز و رەنگ و تام و بۆن و بەرامەی تایبەتی خۆی هەیە...

هەر وەها گوڵزاری شیعریش پڕاوپڕە لە گوڵی رەنگاو رەنگ و هەمەچەشنێ شیعر و هەر جۆرێك لە جۆرەکانی شیعر تام وچێژی تایبەتی و خەسڵەت و مۆرك و ئەدگار و ریتم و ئاوازی جیاوازی خۆی یە...

شیعری کوردیش لقێکی گەورەیە لە شیعری جیهانی و گەلێ هۆنراوەی شاکار و دەیان شاعیری داهێنەری بە مرۆڤایەتی بەخشیوە و ئالای شیعر و هەڵبەستی کوردی لەسەر ناوەندە بەرزەکانی داهێنانـدا دەشەکێتەوە و سەرنجی عاشقانی شیعری راکێشاوە و شیعری دەیان شاعیری کورد وەرگێڕدراونەتە سەر دەیان زمانی جیهانی و بە شکۆمەندی و رێزەوە خوێنەران پێشوازییان لێکردووە...

---

[٢] لەتیف هەڵمەت: شاعیری گەورەی کورد لەتیف هەڵمەت ساڵی ١٩٤٧ لە بنەماڵەیەکی ڕۆشنبیر و ئایینپەروەردا لە شاری کفری لە دایك بووە. خاوەنی چەندین بەرهەمی ئەدەبیە، بەزمانەکانی کوردیی و عەرەبی، چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمەکانی کراون، لە باسی دەرچون و توێژینەوەی گۆڤاری زانکۆکان و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرای کوردیی و عەرەبی و فارسی، تاکو ئیستا زیاتر لە شەست کتیب و نامیلکەی لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا بە چاپ گەیاندوە، لە ساڵی ١٩٧٠ بووە بە ئەندامی یەکێتی نووسەران، ئیستاش لە شاری سلێمانی نیشتەجێیە.

کاك کەریم ئاغاوەیسی شاعیر کەسایەتییەکی دیار و ناسراوی دەڤەری گەرمیانە و باخ و گوڵزاری شیعرەکانی پڕاوپڕن لە دەیان جۆری گوڵی گەشی شیعر وەکو: شیعری نیشتمانیەپەروەری و کۆمەڵایەتی و ئامۆژگاری و ڕێنمایی و ئاینی و جوانی سرووشت و دیمەنە سەرنجراکێشەکانی کوردستان و ژینگەپارێزی و ئازادی مرۆڤ..

هەروەها دەیان شیعری تەرخانکردووە بۆ داکۆکی کردن لە تەبایی نێوانی خێڵ و هۆز و عەشرەت و گشت تیرە و توێژ و چینەجیاوازەکانی کۆمەڵگای کوردەواری و مرڤایەتی.

کاك کەریم ئاغاوەیسی شانبەشانی شیعرەکانی لەگەڵ دەیان کەسایەتی دیکەی دەڤەرەکەدا بوون بە سونبلی خێرخوازی و ئاشتی و لەهەر شوێنێ کێشەیەك ڕوویدات و ناکۆکی و ململانێ نجاتە نێوانی دوو هۆز یا دوو تیرەو خانەوادەوە دەبن بە پەیکی ئاشتەوایی و خۆشەویستی و هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکەو چەسپاندنی تەبایی و پێکەوە ژیان دەدەن ...

واتا کاك کەریم ئاغاوەیسی وەکو چۆن لە ژیانی ڕۆژانەیدا هەمیشە هەوڵی بەرپابوونی تەبایی و برایەتی و دۆستایەتی و پێکەوە ژیان لە دەڤەری گەرمیاندا دەدات بەهەمان شێوە شیعرەکانی کردووە بە پەیامی ڕاگەیاندنی بەرپابوونی ئاسوودەیی و ئاشتەوایی لە هەموو کۆمەڵگاکانی باشووری کوردستاندا...

لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم و بە گەرم وگوڕی پیرۆزبایی چاپکردن و بڵاوبوونەوەی ئەم دیوانە شیعرەی لێدەکەم و دەڵێم دەستان خۆش بێت و هەزار جار پیرۆز بێت و گوڵزاری شیعری ڕەنگاو ڕەنگتان هەمیشە گەش

و دەم بە خەندە بێ.. و دەیان دیوانی دیکە و کتێبی جۆربەجۆر چاپ بکەن و کتێبخانەی عاشقانی شیعر و پەیڤی جوانی پێ بڕازێننەوە و خوای میهرەبان پشتیوانتان بێ ..

**براتان**

**لەتیف هەڵمەت**

**١٦ / ٦ / ٢٠٢٢**

**سلێمانی**

## ٢ـ کاك فریا جاف [٣]:

کاك فریا جاف یەکێکە لەو نووسەر و ڕۆشنبیر و کەسایەتیانەی کە لە بابەتێکدا لەسەر کەسایەتی و شیعرەکانم نووسیویەتی و دەڵی:

( کریم ئاغا وەیسی )

جاران ئەگەر جاف وە یاخود هەر عەشرەتێکی تر پێویستی بە سەرۆکێکی گورز وەشێن و ئازاو تورە و ئینجا نان و خوان جوان و میوان دۆست و چی و چی تریش بوایە کە لە راستیشدا بۆ ئەو دەور و زەمانەی کە رابورد، سەرۆك عەشرەت بەو خەسڵەت و سیفاتانە کە لە هەموو کەسدا نەبوە، توانیویەتی بە رێکوپێکی کاروبار و ئیدارەی عەشرەتەکەی بە سەرکەوتوی ببات بە رێوە، ئەتوانم بڵێم زوربەی زۆری ئەو سەرۆك عەشرەتانەی هەڵماندان سەوادێکی ئەوتۆیان نەبوە چونکە لەو دەورەدا سەرۆك عەشرەت زیاتر ئەبوایە دنیا دیدە و قسەزان و لێزان بوایە نەك ئەبوایە سەوادێکی تەواوی هەبوایە.
لەم قۆناغەی ئیمرۆدا هەر کورە جاف و کچە جافە یەکی ئایپادێك و مۆبایلێك بە دەستیەوەیەتی و ئەتوانێ هەموو جیهان لەسەر پەنجەی بسورێنێتەوە لە کوێ گەرمە هەواڵێك هەیە ئەتوانێ بیقۆزێتەوە و ئەگەر بواری لێدوان و کۆمێنتی هەبێ، وە بێ سڵەمینەوە هاوبەشی خۆی تیا ئەکات و ئەمەش ئەو کورِ

---

[٣] فریا عبداللە بەگی حسین بەگی محمود پاشای جاف. لە ساڵی ١٩٥١ لە هەڵەبجە هاتووەتە دونیاوە ، بەشی زمان و ئەدەبیاتی کوردی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە، لە دەزگای رۆشنبیری و بلاو کردنەوە وەك رۆژنامەنووس دەستی بە کار کردوە و ماوەی بیست ساڵ خزمەتی ئەدەب و زمانی کوردی کردوە و بۆ ماوەی حەوت ساڵ سەرۆکی ئەدیبانی سلێمانی بووە، ساڵی ١٩٩٥ وڵاتی بەجێ هێشتووە و ئێستا لە لەندەن لە بەریتانیا دەژی.

و کچە جافەن کە لە رابردودا شوانی مێگەل و چێشت ونان و خوان لێنەر و جل شۆری لایەکی زۆر لە کەس و کاریان بوون، بەڵام ئیمرۆ ئەوەتا بەو تەمەنەی خۆیانەوە ئەتوانن ناحەزیان ببەنە سەر دەریا و بە تینیویەتیش بیانگەڕێننەوە، کەواتە سەرۆك عەشرەت ئیمڕۆ ئەبێ لەو کچ و کوڕە جافانە وریا تر و بە توانا تر و رۆشنبیر تریش بێت ، بێ گومان ئەمانەش سەرباری زمان زانینێکی تەواوی بێ سەوادەکانی ناو عەشرەتەکەیشی، بە بێ روپامایی ئەم خاڵانە لە برای بەڕێزمانا، سەرۆکی تیرەی ئاغەوەیسیەکان کاك کریم ئاغادا بە ئاشکرا دەبینرێ، ئەم کەسایەتیە خاوەن قەڵەمی خۆیەتی، بۆ خۆی نوسەر و شاعیرە و نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی ئەتوانێ بە چوارینەیەك لە شیعرەکانی گوزارشت لە ئاستی تێفکرینی خۆیی و ئاستی رۆشنبیریەکەی خۆی بداتەوە و لەمانەش هەموی گرنگتر بۆ ئێمەی کوردی موسڵمان ئەبینین کاك کریم ئاغا موسڵمانێکی تەواوە و لە مزگەوت و مەراسیمە ئاینیەکاندا ئەبینرێ و بە ئیمانێکی تەواوە هاوبەشی خۆی تیادا ئەکات، بۆیە دیسان بە بێ روپامایی ئەڵێم کەشتی ئەم تیرە بەناوبانگەی جاف ئاغاوەیسیەکان لە دەستی کەسایەتیەکدایە کە ئەویش کاك کریم ئاغاویسیە و ئەتوانێ ئەو کەشتیە بە سەلامەتی بگەیەنێتە ئاکار و کەناری دور لە هەموو مەترسیەك بۆ عەشیرەتەکەی و ئەمەش شانازیە بۆ جاف هەموی کە توانیویەتی ئەم بەرگە نوێ یە بپۆشێ و ئیتر کاتی ئەوەیش هاتوە لە لایەن هەموو سەرۆك عەشرەتەکانی جافەوە نەهێڵرێ جاف لەمە زیاتر هەر چپڵەکوت بێ بۆ ئەملا و ئەولا، بەڵکو ئەبێ خۆی حسابێ بۆ ئەو هێزەی خۆی بکات کە لە ڤیستیڤاڵ و بۆنە جیاجیاکەدا ئەبینرێ ، هەرلێرەوە جارێکی تر دەسخۆشی لە تێکڕای ئاغاوەیسیەکان ئەکەم کە متمانەیان بەم سەرۆکە ڕۆشنبیرە داوە و

لێردا بە گەرمی پیرۆزبایی لە کاك کریم ئاغا ئەکەم بۆ لە چاپ دان و وەبەرهـەم هێنانی ئەم دیوانە نایابەی خەرمان بەرەکەت.

**فریا جاف**

**لەندەن ٢٠٢٢**

## ٣ـ د. حەسەن جاف [٤]:

یەکێکی تر لەو ڕۆشنبیر و نووسەر و کەسایەتیانە دکتۆر حەسەن جاف کە پێشەکیەکی جوانی بۆ ئەم دیوانەم نووسیوە و لە نێو دێڕەکانی پیشەکیەکەیدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە  توانای شیعریم دەڵێ:

شاعیری سەرکەوتو و تەواو بە دەستەڵات بە پێوەری کلاسیك بەو شاعیرانە دەڵێن کە دیوانی شیعرەکانیان لە هەموو پیتێکی هیجایی وەك قافیە تیا بێت ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو شاعیرە هونەرمەندە تەواو بەسەر وشەزمان و بەکار هێنانی قافیە جیاوازەکانی سەر بە هەموو پیتە هیجاکاندا زاڵە سەلیقە و بەهرەی شاعیرانەی بە چەشنێك سەرکەوتووە کە بەرامبەر بە هیچ وشەیەکی ڕەق و دژوار و سەختی قافیە، دانامێنێ و پەکی ناکەوێت ڕێزدار کاك کەریم ئاغاوەیسی بەندە بە شاعیرێکی باش هەڵیدەسەنگێنم کەرەسەی شیعرییەکانی لە ئاستێکی بەرچاودایە و دەبینین لەسەر جەم لقوپۆوەکانی شیعری کلاسیکدا ئەسپی تاوداوە، لەیرادا (لەم پێشەکیەدا) بۆ نموونە چەند شیعرێکی هەڵبژیردراوی دەخەمە ڕوو، بە بۆچوونی خۆم هەڵسەنگاندنەکەم سەبارەت بە کاك کەریم وەك شاعیرێکی بە توانا دەسەلمێنێ لە چەندین شیعریدا سەرجەم بابەتەکانی شیعری کلاسیك بە ڕوونی تێیاندا بەدەردەکەوێ.

---

[٤] دکتۆر حەسەن کەریم بەگی فەتاح بەگی محەمەد پاشای جاف، کەسێکی ئەکادیمی ناوداری کوردە، زادی بنەماڵەکەیان هەمیشە سەرۆکایەتی هۆزی گەورەی جافیان کردووە، لە ٢٥/ ٩ /١٩٤٢ لە دێی کەلاری جاران (کەلاری کۆن) هاتووەتە دونیاوە، ساڵی ١٩٦٦ بەکالۆریۆسی لە زانکۆی بەغداد تەواو کردووە، ماجستێر و دکتۆراکەشی لە زانکۆی تاران بەدەستهێناوە، خاوەنی چەندین بەرهەمی چاپ کراوە و چەندین بەرهەمی وەرگێڕاوە بە زمانەکانی کوردی ، عەرەبی ، فارسی.

## ٤ ـ پ.د. ئاراس محەمەد ساڵح[٥]:

یەکێکی تر لەو ڕۆشنبیر و نووسەر و کەسایەتیانە پرۆفیسۆر دکتۆر ئاراس محەمەد ساڵح، کە لە پەیامێکدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە کەسایەتی و شیعرەکانم نووسیویەتی:

چەند پەیڤێك بۆ دیوانە شیعرەکەی مامۆستا کەریم ئاغاوەیسی

مامۆستا کەریم ئاغاوەیسی وەك کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی و پەروەردەی ناوخێزانێکی ڕەسەنی کوردەواریو خاوەن ئاکاری بەرز، لەناو ژینگەو دابونەرێتە بەرزەکانی هۆزی گەورەی جافدا گەورەبووە، هەموو ئەمانەیش ڕەنگدانەوەی زۆری لەناو هۆنراوەکانیدا هەیە، ئەم شاعیرە هەست ناسکە هەموو کات کاریگەربووە بە ڕوداوەکانی ڕۆژگاری خۆی، لەگەڵ ئازارەکانیدا ئازاری چەشتووەو لەگەڵ شادی خەڵکیدا کامەران بووە.

مامۆستای شاعیر زۆر ستایشی نەرێتەبەرزەکانی تیرەی ئاغاوەیسی هۆزی جاف دەکات، جافەکان بە سینەساف و دڵسۆزی میللەت و نیشتمان دادەنێت، بێگومان ئەو ڕەوشتە بەرزانەی لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا بینیوە، هەربۆیە داوای بەردەوامیان دەکات، بینیویەتی ڕەشماڵانی جاف هەمووکات شوێنی میوان و کۆبوونەوەی پیاوە گەورەکانی جاف و شوێنی چارەسەری کێشەو خەمەکانی

---

[٥] پرۆفیسور دکتور (ئاراس محەمەد ساڵح بارام) لە ساڵی ١٩٧٠ هاتووەتە دونیاوە ، نووسەری دەیان کتێبی چاپ کراوە، خاوەنی ئەم بڕوانامانەیە: بەکالۆریۆس لە کۆلێژی شەریعە، ماجستێر لە بەشی بنەماکانی دین، دکتۆرا لە زانستەکانی قورئان. ساڵی ٢٠٠٤ لە بەشی خوێندنی ئیسلامی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی بووە بە مامۆستا، ساڵی ٢٠١١ لە هەمان کۆلێژ پلەی پرۆفیسۆری یاریدەری وەرگرتووە، ساڵی ٢٠١٩ پلەی پرۆفیسۆری وەرگرتووە و تا ئێستا بەردەوامە لە وانە وتنەوە لەو کۆلێژەدا.

خەڵك بووە. لە هۆنراوەیەکیدا لەبارەی هۆزی جافەوە ئەڵێ:

پێناسەی ئێل و هۆزی گەورەی جاف
بۆت پێناسەکەم ڕاست و بێ خیلاف
گـــەورە و بچـووکی ڕۆژی تەنگانـە
شـــێرە، دلـێرە، مـەردی مەیدانـە.

ئـەوەی کـوردی ڕەسـەن شـانازی پێـوە دەکـات، وەفاداریـە لـە ڕۆژی تەنگانـەدا، ئازایـەتی و چاونەترسـان و ورەبەرزیـە لـەکاتی ناخۆشـیدا، هـەموو ئـەو ڕەوشـتە جوانانـە لـە لانەسـتی تـاکی کـوردا هەیـە، مەردایـەتی و نانبـدەی و دیوەخـان و بەدەم خەڵکەوە بوون، میواندۆستی و لێبـوردەیی و دڵفراوانـی لـە هـەرە ڕەوشـتە بەرزەکانی جافە، هەربۆیە شاعیر لە هۆنراوەکەیدا زیاتر جـەختی لـێ دەکاتـەوەو ستایشی هۆزەکەی دەکات کە خاوەنی ئەو ئاکارە بەرزانەیە.

هـەروەها عەشـق و ئـەوینی حـەقیقی ڕەنگدانـەوەی زۆری لـە هۆنراوەکانیـدا هەیە، ئەوینی ڕاست و خۆشەویستی خواو دینداری بێگەرد، خۆشەویسـتی گـەل و میللەت و نیشتمان، خۆشەویستی هۆزەکەی و کەسایەتیەکانی، خۆشەویسـتەیەکی بێگەردی دوور لە هەموو خواستێکی دنیایی، لەمبارەیەوە ئەڵێ:

دڵ کـە دیلـی ئـەوینـی تـۆ بـێ هەتـا مـاوە
لـە ئـازادی خۆشـتـرە لای ئـەو کـۆت و داوە
هێنـدە نزیك بێت لـە بـۆنـی هەناسـەی تـۆ
چ پێویسـتی بـە ئازادیـە، یان بـۆنـی گوڵاوە.

ئـەم مامۆسـتا هەسـت ناسـکە قـەدەری خـوا وابـووە یـەکێك لـە جگەرگۆشـەکانی ماڵئاوایی لێکردووەو گەڕاوەتـەوە بـۆ لای خـوای پـەروەردگار، ئـەم کۆچـەی کاکـە بەرزان باوکی کردوەتە یەعقوبی کەنعان و هەمووکات لە دوای دیداری

یوسفەکەی ویڵەو هەر چاوەڕوانەو کەسێك بێت و مژدەی گەڕانەوەی یوسف بە هەموو گەرمیاندا بداو بۆنی کراسەکەی سەرتاپای نیشتمان بۆنخۆش بکات.

مەرگی کاکە بەرزان هەموو ژیانی ئەم شاعیرە سینەسافەو دڵڕوناکەی داگیرکردووەو ناتوانێت بۆ تەنها ساتێك وێنەکانی لەبەرچاوی ونبێت و بۆ تەنها چرکەیش لە یادی ناکات، هەربۆیە هەموو کات ئەسرینەکانی بەسەردڵی پڕ لە سۆزیدا دێنەخوارێ و هەرگیز وشك ناکەن، لە یادی چوارساڵەی مەرگی کاکە بەرزاندا ئەڵێ:

ئەی گەوهەری بەهاداری گەنجێنەی ژینم
ئەی بیلبیلەی چاوی پڕ لە ئەسرینم
کە کۆچت کرد وا نەزانی لە بیرم چووی
یادەوەریت هەردەمێنی لەنێو دڵی پڕ برینم
زووخاو دەتکێ لەنێو دەروونی پڕ لە ژانم
باسی خەم و، دەردو ئێشە شیعرەکانم
بۆ لە دەست دانی ئازیزان خەمە هاوڕێم
لە بۆ ئەوان پڕ ئەسرینە چاوەکانم.

شیعرەکانی مامۆستا کەریم سادەو ڕەوانن، بە زمانێکی ڕەسەنی بێ گرێوگۆڵ نوسراون، بۆنی نیشتمان و هەردەو دەشتی گەرمیانیان لێدێت، بۆنی خۆشی گوڵەگەنم و نێرگس و بەهارو بارانی سەرپەڵەی دەشتە کاکی بەکاکیەکەی گەرمەسێر سەرتاپای دیوانەکەی داگیرکردووە، بانگی خوێنەر دەکات بۆ ڕاستگۆیی و سینەسافی و لێبوردن و میواندۆستی و خۆشەویستی، هەڵقوڵاوی دەرونێکی پڕ لە خۆشەویستی و عەشق و ئەوینی حەقیقین بۆ کاروانێکی سەرمەدی هەتاهەتایی.

هەڵـدێرو نشـێوەکانی ژیـان نـەیانتوانیوە ورەی بـەرزی شـاعیر نـەوی بکـەن بێهیوابێـت، ئـەو هـەموو کـات بـە هیوایـەکی بـەرزەوە دەژی و تاڤگـەی شـیعری تـەڕوپاراوتر دەبێـت، ورەو بـڕوای بـەهێزەو داهـاتوو ڕونـاك دەبینێـت، نـزای تەمەندرێژی لـە خـوای گـەورە بـۆ دەکـەین و هیـوای بـەردەوامی لـە هۆنینـەوەی هۆنراوەی ناسك و پرچێژ بۆ دەخوازین..

پ.د.ئاراس محەمەد صاڵح
زانکۆی سلێمانی
٢٥ / ٥ / ٢٠٢٢

## ٥ ـ د. دارا حەمید[٦]:

یەکێکی تر لەو ڕۆشنبیر و کەسایەتیانە بەڕێز پرۆفیسۆری یاریدەر دکتۆر دارا حەمید محەمەد کە لە پەیامێکدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە شیعرەکانم دەڵێ:

برای بەڕێزم کاك کریم ئاغاوەیسی

سڵاو و ڕێز.....

شیعرەکانم خوێندەوە، پێشتریش لەڕێی واڵی جەنابتانەوە لە فەیس بووك ئاشنای شیعرەکانتان بووم، دەستی ماندووبوونتان دەگوشم شیعرەکان جوانن، چێژبەخشن، هەڵقوڵاوی کۆمەڵی کوردەوارین. ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئایینی ، پەندو ئامۆژگاریان... ڕەنگدانەوەی ئەزموون و دونیابینی ئێوە و گوزارش لە کەتوار (واقع)ی کۆمەڵ.

زمانی شیعری بەشێك لە تێکستەکان کوردییەکی تاڕادەیەکی باش پەتی و سادەن، ئەمەش زیاتر خەسڵەتی شیعری میللی بەشیعرەکان دەبەخشێت، بەشێکی تری شیعرەکانیش سەرباری کێش و سەروا، بە بوونی ڕەگەزەکانی سۆز و خەیاڵ و ئەندێشە و ئازار ئینجا هونەرەکانی جوانکاری و ڕەوانبێژی تێیاندا دەچنە قاڵبی شیعری گۆرانی (لیریکی)یەوە.

بەدڵ پیرۆزبایی لە چاپدانی دیوانەکەتان لێدەکەم هیوام تەمەن درێژی و بەردەوامیتانە ، لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیدا.

**براتان:**

**پ . ی . د . دارا حمید محمد ١٤ / ٥ / ٢٠٢٢**

---

[٦] پ.ی.د. دارا حەمید محەمەد، دکتۆرا لە زمانی کوردی، مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان.

## ٦ ـ شێخ سەعید شاکەلی[٧]

یەکێکی تر لەو ڕۆشنبیر و کەسایەتیانە بەڕێز شێخ سەعید شێخ ئەحمەد شاکەلییە، کە لە بابەتێکدا لەژێر ناونیشانی ( ڕێبواری ڕێگای سەخت ) بۆچوونی خۆی سەبارەت بە کەسایەتی و شیعرەکانم نووسیویەتی و دەڵێ:

(( ڕێبواری ڕێگای سەخت ))

ئەڵێن خۆشەویستی زمانی نییە وەك مۆسیقایە کار لە هەست و بۆچونەکانی مرۆڤ ئەکا، لەگەڵ تەنی مۆسیقاکەدا هەست ئەبزوێ هەندێ جاریش تەنەکان کاری گەرییان نابێ یان لاوازە ئەوە نیشانەی ئەو موسیقایە لەگەڵ ناختدا ئاوێزان نەبووە ، زۆر جار بە دیوەکەی تردا ڕۆح ئەخاتە سەما ناخودەرون ئارام و ئاسودە ئەکا ڕێگای پڕ ماندو بوون پڕکا لە توانا و خرۆش، ئەوکات ئەبێ بە شیوەنەکەی نەی.

لەگەڵ کاك کەریمدا بەو جۆرە ئاشنابووین ، باس باسی بەها جوانییەکانی مرۆڤ و یاساکانی ژیان و خۆشەویستی و بەخشیندەیی و میهرەبانی و مرۆڤ بوون.

مرۆڤ کاتێ ئەفراندی شتی لە ڕۆحی خووی کردە کیانیدا ئەو شتەیان روحە زانست و مەعریفەبوو بۆ ئەوەی لە نهێنیەکانی دنیا و ماجەراکەی ئاشنابێ و پێی بڵێ تۆ بالاترین مەخلوقی منی، ئەو هەمو نیعمەتەم بۆ فراهم ئەبێ بە مرۆڤ و داهێنان و خزمەت گوزار ئەبێ بە واتایەکی تر جێگرێکی باڵای دووری

---

[٧] شێخ سەعید کوڕی شاعیر و کەسایەتی ئاینیی شێخ ئەحمەد شاکەلییە، دەرچووی کۆلێژی ئیدارەی زانکۆی سلێمانییە ، راوێژکاری وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بووە ، دامەرزێنەری بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکانی کوردستان و نووسەری چەندین کتێبی چاپ کراوە و ئەندامی کۆمەڵەی زیندانە سیاسیەکان و نووسەران و سەندیکای رۆژنامەنووسان و هونەرمەندانی کوردستانە.

لە گەمژەیی ویڵ بوون، ئەو جۆرە مرۆڤانـە کەسانی ئاساییبن نـاژین بـۆ مـردن بـەو شـێوەیە ئاشـنای هەسـت و نـاخی کـاك کـەریم بـووم لـە گفتوگۆکەیـدا بـۆم دەرکەوت لە نێو باغچەی عیرفاندایە لە ناخیدا جورەها پرسیار هـەڵکۆڵاوی پـڕ لە جوانییە سواری شەپۆلی دەریایی عیشقێکی بێ سنورە...

لـە هەوڵدایـە بـۆ پـەی بـردن بـە نهێنییـەکان خـۆی هـەڵ ئەواسـێ بـە پەیـژەی بەخشـــیندەی و میهرەبـــانی و لێبـــوردەی لـــەو ڕێگـــادا قونـــاغ بـــە قۆنـــاغ ئەستەنگەکانیش ماندووی ناکەن، ناتوانێ مرۆڤی ئاسایی بێ وێڵە بە شوێن دیوە وون بووەکـەی خۆیـدا ، نایـەوێ پـێش ئـەوەی لـەم ماجەرایـە ئاگـادار بـێ بگاتـە مەنزڵ و هەوار، چاکیش ئاگادارە ڕێگا سـەخت و پـڕە لـە هـەوراز و نشـێو، پشـتی پـەردە مرۆڤـی شـارەزا و پـڕ ئـەزموونی ئـەوێ، نایـەوێ شـەپۆلی ئـەم دەریایـە فڕێیداتە کنـار نایشـی ئـەوی ڕاپێچـی قـوڵای کـات و بخنکـێ، لـەم ڕێبوارییـەدا لـە قۆناغێکدا لـە هەوارێکـدا پـیری دەرگـای کەسـێ بـبێ بـە کەسـی لوقمـانی گۆنـای زەخمی لەسەر بێ... ئەی ڕەفیقانی تەریقەت هەر چی سەربا ئەدا بەدەرو پشتدا هەمومان ئەی ڕەفیقانی تەریقەت ئەڵێن. وەیشومەی بێ بـەها بـونی مـرۆڤ لادان لـە یاسـاکانی ژیـان میحنـەتی ڕوح، ملـهوڕەکان بـێ بـاکن عیشـق و جـوانی یـان پلیشقاندوە.. کاری وایان کردوە خەریکە پەیامەکـە و خـاوەن پەیامەکـە بـە کـار ئەهێنن بۆ چەوساندنەوەی مرۆڤ و ڕەهاکردنی کۆێلایـەتی خەڵکەکـەیان عـەقڵ چەق بەستو کردووە، کەوتوونەتە شوێن جـەهلی پـیرۆز خزمـەتکاری ملـهوڕەکان چـاو بەسـتراون لـە ئاسـتی بـێ سـنووری لێبـوردەیی، میهرەبـانی، بەخشـیندەیی، خۆشەویسـتی، تـەنها ڕویـەکیان لێـوە دیـارە کـە ئـەویش ئـاخیر قوناغـە لـە بـێ میهرەبانی عەدالەتی ئاســان ئەوەیان لە بیرچووە عیشق ڕێگایە بۆ لای کۆتا گەمەی دنیا بۆ پێشی مانگ و خۆر، تیوشوی ئەم ڕێگا خۆشەویستی مرۆڤە

پەیڕەوی یاساکانی ژیانە ئازادی مرۆڤە رزگار بوونە لە کۆیلایەتی.
ئاوها لەگەڵ کاك کەریمدا قوناغ بە قوناغ ڕاپێچمان ئەکا پشت بە تۆ ئەی بەخشیندە و میهرەبان خۆشەویستیەکی خۆتمان بۆ بنێری ببێ بە کەسمان... لە ناکەس کاری دەرمان کات.

**شێخ سەعید شاکەلی**

**١٦ / ٥ / ٢٠٢٢ شاکەل / سەعداوا**

## ٧ ـ م. عومەر عەلی شەریف[٨]

بەڕێز مامۆستا عومەر عەلی شەریف یەکێکی ترە لەو نووسەر ڕۆشنبیر و کەسایەتیانەی کە لە وتە و پەیامێکدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە کەسایەتی و شیعرەکانم نووسیویەتی و دەڵێ:

بە ناوی خوای مەزن

ئەم دیوانە شیعرە بەرهەمی هزر و قەڵەمی یەکێکە لە کەسایەتییە دیار و هەڵکەوتووەکانی ئێستای کۆمەڵگای گەرمیانی ئازیز. ئەم برا بەڕێزەمان؛ کاك کەریم ئاغاوەیسی، سەرۆکی تیرەی ڕەسەنی ئاغاوەیسی سەر بە ئێلی گەورە و پایە بەرزی جاف، خاوەنی ئامادە بوون و ڕۆڵێکی کاریگەرە لە زۆربەی هەرە زۆری بۆنەو کۆڕو کۆبوونەوە عەشایەری و کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکەدا ، بەتایبەتی دانشتن و گردبوونەوەکانی تایبەت بە پرسی ئاشتەوایی و پێکهاتنی نێوان هۆز و بنەماڵە جیاجیاکان و بەدیهێنانی ئاشتی و تەبایی لە نێوانیاندا.

هەمدیس کاك کەریم پاڵپشت بە هەڵس و کەوتی جوانی و هۆشیاری و میهرەبانی و خۆش گفتاریی خۆی توانیوییەتی لەگەڵ خەڵکانێکی زۆری ناوچەکە و دەورو بەریدا ، هەڵبەت بە زۆرێك لە کەسایەتیی دیار و خانەدان و پیاوانی ئایینی و ڕۆشنبیرانیشەوە، پەیوەندیی قووڵی دۆستانە ببەستێت و

---

[٨] نووسەر و ڕۆژنامەنووس (عومەر عەلی شەریف) لە دایکبوی ١٩٥٦ سەرتەك (بناری بەمۆ) دەرچووی کۆلێجی ئاداب ـ زانکۆی بەغدا (بەشی زمانی ئەڵمانی) ساڵی ١٩٧٩ . خاوەنی سەدان بابەتی جۆراوجۆرە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستان و دەرەوەیدا ، هەروەها خاوەنی چواردە (١٤) کتێبی چاپ کراوە. بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەنووسێت و بڵاو دەکاتەوە. لەنێو بەرهەمەکانیدا ژمارەیەك نووسین و کتێب هەن، کە لە ئەڵمانییەوە وەریگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی، لە کەرکووك پاش ٢٠٠٣ سەرنووسەری گۆڤاری سیروان بووە، ئێستا دانشتووی شاری دەربەندیخانە.

ببێتە ناسیاو و ئاشنای نزیك و خۆشەویستیان.
هاوکات جگە لەو ڕۆڵ و پێگە عەشایەری و کۆمەلایەتییەی ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو کەسێکی تێگەیشتوو و کراوە و خاوەن قەڵەمێکی بە بڕشت و توانا و سەلیقەیەکی ڕەسەنیشە لە بواری نووسین و هۆنینەوەی شیعری جوان و فرە مەبەستیشدا. بەمەش شیاویی خۆی سەلماندووە لەوەی ببێتە یەکێك لە میرات گرە وەفادار و بە تواناکانی ئەو دەستەبژێرە بەهرەمەند و ناودارانە لە سەرۆك هۆز و پیاوماقوولانی جارانی کورد، کە لەسەردەمی زێڕینی خۆیاندا خولیای دنیای زانست و ئەدەب و کلتوور بوون، لەسەرووشیان و شیعر و مێژوو، بۆ خۆشیان لەو میانەدا شوێن دەستیان درەوشاوە بووە و میراتێکی نایابیان بۆ گەل و هۆزیان بەجێ هێشتووە.
هەڵبەت ئەم دیوانەی کاکە کەریمیش، بەم قەبارە شایستە و ناوەڕۆکە دلگیرەیەوە. هەروەها پێشتریش دانان و بە چاپ گەیاندنی کتێبە دانسقەکەی سەبارەت بە تیرەی ئاغاوەیسی، سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن کە ئاماژەمان پێ دا.
مایەی سەرنجیشمانە، کە وا کاکە کەریم وەك چۆن لە پەیجەکەیدا (لە فەیسبووك) هەواڵی زۆربەی کار و چالاکییەکانی لە بواری عەشایەری و کۆمەلایەتیدا بلاو دەکاتەوە، ئاوەهاش ماوە ماوە پەیجەکەی بە گوڵچنێك لە شیعر و هۆنراوە و نووسینەکانی دەڕازێنێتەوە و دەیانخاتە پێش چاوی هاوڕێ و دۆستانی. هەڵبەت لە هەردوو حاڵەتیشدا کارێکی باش و بە سوود دەکات مایەی ستایشە. بەندە ماوەیەکە ئەم برایە دەناسم و دڵخۆشم بە پەیوەندیی دۆستانەی نێوانمان. هەروەها ئاگاداریشم لە زۆرێك لە کار و خزمەت و چالاکییەکانی، هەڵبەت بەو شیعر و نووسینانەشەوە، کە بلاویان دەکاتەوە. بە هەمانشێوە ڕێزو حورمەتیشم هەیە بۆ بنەماڵە و خزمەکانی، کە لەگەڵ بنەماڵەکەماندا

ماوەیەکی دوور و درێژە یەکدی دەناسین و شانازی دەکەین بەوەی، کە لە زۆر بارودۆخی جیاوازدا و لە ڕابردوودا هاوکار و هاوغەم و هاوسۆزی یەکتر بووین. لێرەشدا من گەلێك سوپاس گوزاری ئەو بانگهێشت نامەیەی بەڕێزیانم، کە ئاراستەی کردم بۆ نووسینی وتەیەك بۆ ئەم دیوانە بەنرخەی. هەڵبەت مایەی پێزانینی زۆرمە، کە بەڕێزیان بە پەسەندی زانیوە وتەیەك بە ناوی منەوە، لە دوو توێی دیوانەکەدا هەبێت. جا بەندە ئومێدەوارم بەم وتە سادە و ساکارەم توانی بێتم شتێك لە هەقی ئەو بانگهێشت نامەیە و فەزڵ و میهرەبانیی خاوەنەکەی (کاك کەریم) م دابێت، هاوکات داوای لێبوردنیشی لێ دەکەم، لە هەر کەم و کووڕییەکی نووسینەکەم، کەماڵیش هەر تەنها بۆ زاتی پەروەردگارە. لە کۆتاییشدا هیوادارم ئەم بەرهەمە بەپێزە شوێنی شیاوی خۆی لە کتێبخانەی کوردیماندا بکاتەوە و لەنێو خوێنەر و شیعردۆستانی کورددا چێژی لێ وەربگیردرێت و بەرز بنرخێندرێت. داواکاریشم لە خوای میهرەبان کاکە کەریم ئاغاوەیسی تەمەن درێژکات و توانا و تاقەتی پێ ببەخشێت بۆ پێشکەش کردنی خزمەت و بەرهەمی زیاتر و زیاتر.

**عمر علی شریف**

**٢٠٢٢ / ٥ / ١٧**

## ٨ ـ د. حسین اسماعیل خان دەلۆ [٩]:

یەکێکی تر لەو ڕۆشنبیر و کەسایەتیانە دکتۆر حسین اسماعیل خان دەلۆ، کە لە پەیامێکدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە کەسایەتی و شیعرەکانم دەڵێ:

کاك کەریم ئاغاوەیسی

سلاو ڕێزم هەیە

دەست خۆشیم بۆ بەڕێزتان هەیە کە شان بەشانی ئەرك و ڕاژە کۆمەڵایەتیەکان شانت داوەتە بەر خزمەتکردنی کۆمەڵگا لە بواری هەڵبەست و هۆنراوەدا کە لە هەموو کایەکاندا دید و بۆچوونی خۆت بە ڕاشکاوانە خستووتە ڕوو، بە هۆنراوە جوانەکانت گوزارشتت لە نەهامەتی و دەردەسەریەکانی کۆمەڵگا و نەتەوەی کورد کردووە، بە سۆز و هەستێکی جوانەوە دەربڕینەکانت نمایش کردووە.

دەست و خامەت خۆش هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

لەگەڵ حورمەتی بێ پایانم

**دکتۆر**

**حسین اسماعیل خان دەلۆ**

**٢٠٢٢ / ٥ / ٢٩**

---

[٩] دکتۆر حسین اسماعیل خان عزیز خان ابراهیم خان دەلۆ، لە ساڵی ١٩٦٦ لە کفری لەدایکبووە، دکتۆرا لە مێژووی نوێ و هاوچەرخ، پیشە: مامۆستای زانکۆ، خاوەنی چوار بەرهەمی چاپکراوە، چەندین وتار و لێکۆڵینەوەی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاوکردووەتەوە.

## ٩ ـ م. بەکر کانی هەمزەیی[١٠]

یەکێکی تر لەو ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەر و کەسایەتیانە مامۆستا بەکر کانی هەمزەییە کە لە وتە و هۆنراوە و پەیامێکدا بۆچوونی خۆی سەبارەت بە کەسایەتی و شیعرەکانم نووسیویەتی:

بەڕێز کاك کەریم ئاغاوەیسی کەسانێکە ئەتوانم بڵێم کە خاوەنی پێگەی جەماوەری کەسایەتی خۆیەتی ، کە من زۆر خۆشحاڵ بووم بە هاوڕێیەتی ئەو بەڕێزە، کە لەڕێگەی شێعرەکانیەوە بووم بە هاوڕێی و ناسینی تا ئەو ئاستەی کەچەندین جار یەکترمان بینیووە سەردانی ماڵی یەکترمان کردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێز گرتن و خۆشویستنی یەکتری لەگەڵ ئەوەشدا کاك کەریم دەستی نوسینی هەیە و توانیویەتی لە ڕێگەی شیعرەکانیەوە خزمەتێکی باش بە نەتەوەکەی بکات، جگە لەوەش کە توانویتەی لەڕێگەی بەرهەمێکی چاپ کراویەوە، مێژووی تیرەی ئاغاوەیسی بنوسێ و ئەمەش ئەرکێکی گرانە، بەڵام ئەو بەرهەمە دەبێتە بنەمایەکی باش بۆ مێژووی بنەماڵەکەیان ، هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم بەم پارچە شیعرەش پیرۆزبایی دیوانە شیعرەکەی لێدەکەم:

(بۆ دیوانی کریم ئاغاوەیسی)

بەناوی خودا پەنای گشت کەسێ
کەسی بێکەس و هەم فریاڕەسێ

---

[١٠] نووسەر و شاعیر مامۆستا بەکر ئەحمەد محەمەد کەریم ناسراو بە مامۆستا بەکر کانی هەمزەیی، بەکالۆریۆسی هەیە لە زمانی کوردی وخاوەنی چەندین بەرهەمی چاپ کراوە.

پاشان سڵاوات لــەسـەر ڕەسولێ
شەفاعەتکـەری هـەموو مـەلولێ

ڕێــز و سـڵاوم بـۆ ئــاغــاوەیسی
کـەوا بەڕێزتــان بوونــە ڕەئیسی

بـــرام پـیـرۆزە دیــوانی تـــازەت
تۆمار کردنی ئەو هـەموو ڕازەت

لـەنــــاو کۆمەڵا قـــەدر گـرانــی
جێگای شـانــازی جـاف و گۆرانی

گوڵاوی وشـەت بـۆنی دای لەسەر
سەرت بڵند بێ تاڕۆژی مەحشەر

لــەبەینی خـۆف و ڕجادا مــاوی
زۆرخەم بەشیعر دەکەی تەداوی

**م. بەکر کانی هەمزەیی**
**١٨ / ٥ / ٢٠٢٢ چوار شەممە**
**قەزای شارەزوور**



# وێنەکەم

کە سەیری وێنەکەم کەی ئەزانی
دڵ درکی خەمی پیاچەقیوە[11]
دڵ بەهاری شادی بەسەر چوو
سەریش بەفری زستانی لێباریوە

زەرد بووە گەڵای تەمەن
بەپایزی خەم گوڵی شادی هەڵوەریوە
چاوەکانم لە هاوینی گەرمی ژینا
فرمێسکی خەمی تیاسڕیوە

***

کەلار / ئەیلولی ٢٠١٣

[11] واتە: کە سەیری ئەم وێنەیەم بکەی دەزانی دڵم چەندە خەمی تێدایە کە بووەتە هۆکاری سپیبوونی مووی سەرم، لەم شیعرەدا ناوی هەر چوار وەرزەکەی(بەهار، زستان، پایز، هاوین)ی تێدا هاتووە.

# قەڵەم بنووسە

قـەڵــەم بـنـووســـە بـاســـی دەردی دڵ
ئـەی چاو برِێـژە فـرمـێـسـکـی بە کوڵ

ئـەی دڵ بـێرەجـۆش بەوێنەی مەنجـەڵ
ئەی دەم هاوارکە و لـەکـەس مەکـە سڵ

با سـەر بەسـەرکا سـەد قـورِ و سـەد گڵ
بـۆ ئـەو تەمـەنەی هەڵـوەری وەك گوڵ

قـەڵـەم لـە نووسـین تـەواو بـوو بـێزار
لــە بـاســی خـــەم و دڵـی پـرِ ئـــازار

چاویش زۆر رِیـژای فرمێسکی خوێنین
دەمیـش بەبێ سڵ کـردی نـاڵـە و شــین

ســەریش هـیـچ کاتێ نـەبوو سـەرفـەراز
گـوڵـی تەمـەنـیـش هـەڵـوەری بـێ نــاز



کەلار / شوباتی ٢٠١٤

# هەڵوەرینی گوڵێك لە پایزدا

لە(بیستی یانزەی) هەموو ساڵێك
بارانی خەم ئەبارێتە سەر دڵم [12]
چونکە لەو ڕۆژەدا بەخەزانی خەم
هەڵوەریوە پەڕەی گوڵم

ئەزانی بۆ لەو ڕۆژەدا دێوانە ئاسا
خەمبار و پەشێوە حاڵم؟
چونکە لەو ڕۆژەدا هەڵوەریوە
گوڵی نەمامی بیست و دوو ساڵم

بەبێ تۆ مەگەر هەر خاك بکەم
بەسەرما وا مامەوە بەتەنها
بە چاوم فرمێسکی خوێنین و
بە دڵ هەزاران خەم بکەم پەنها

[12] بیستی یانزە: (٢٠ ی مانگی یانزە) لەو ڕۆژەدا ( بەرزان)ی کوڕم کۆچی دوایی کردووە، ئەم هۆنراوەیەم بۆ کۆچی دوایی ( بەرزان)ی کوڕم نووسیومە، کە لە ٢٠ ی تشرینی دووهەمی ٢٠١٣ماڵئاوایی لێکردین (کۆچی دوایی کرد) لە تەمەنی (٢٢) بیست و دوو ساڵیدا.

ســـکـــاڵای دەروونـــم خـــــوایـــــە
تـەنـهــا لــە دەرگــای تـۆ ئەکــەم
چونکە بێجگە تـۆ کـەسێکی تـر
شیاوو نییە کە سکاڵای لـەلا بکـەم

هـــــەرچـەنـــدە کـــە (یـعـقـــوب)
لـەدووری (یوسف) ئـارامی لـێبـڕا [١٣]
بەخەمی دووری کوێر بوو چاوانی
﴿ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ ﴾ [١٤]

ســــوپــــاس بـۆ تــۆ خـــوایـــە
کــارت چـەنـــد ڕێـك و جـوانـە
یەعقوب شـاد ئەکـەیت بە یوسف
لـەپـاش ئـەو هەمـــوو ســـاڵانـە

بـەڵام یـوسـفـی مــن کــۆچـەکـەی
بـێ گــەڕانــەوە بـوو کــە کـردی
هــەرچی ئــاواتی شـــادیم بــوو
لــەگــەڵ کــۆچــەکــەیدا بــردی

[١٣] یعقوب: یەعقوب پیغەمبەر (د،خ) ـ یوسف: پیغەمبەر یوسف کوڕی پیغەمبەر یعقوب (د،خ).
[١٤] ﴿و ابیضت عیناه﴾ لە ئایەتی (٨٤) لە سوورەتی یوسف واتە: (چاوەکانی سپی هەلگڕاو بینینی نەما).

ڕەشەبای خەم بوو لە ناکاو
هات و لە ڕێگایەکی دوورەوە
گوڵی بەهاری دڵی هەڵوەران
بە زەردو سپی و سوورەوە

من نازانم چۆن
خەمی کۆچت لەدڵ دەرکەم
بۆ هەڵوەرینی گوڵی تەمەنت
دڵ و دەروون پڕ بوو لە خەم

ئایە بۆ تەمەنی لاوی
نەو بەهارت دڵ بناڵێنێ؟
یان بۆ خەم و ئازارەکانت
چاوەکەم فرمێسك بڕژێنێ

ئەی دڵەی پڕ خەم
هەتاکو ماوی بۆ خۆت بناڵە
بۆ داخی سەختت بۆ کۆچی
ڕۆڵەی بیست و دووساڵە[(١٥)]

---

[١٥] ( ڕۆڵەی بیست و دوو ساڵە ) واتا: لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

بەسیەتی (کەریم) چی تر
ئازاری دڵت مەکە بەیان
نەمر تەنها هەر خوایە
﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾[١٦]

دەربارەی تەمەن ئەبێ
تێبگەین ئێمە هەموومان
ئەجەل تیرێکە ناگەڕێتەوە
دەرچووە لە کەوان

ئێمەی بێ ئاگا ئەخۆین
ئەخەوین بێ هۆش و بێ هەست
نازانین کە کەی لەچی
کاتێکدا ئەدات لە مەبەست



کەلار / شوباتی ٢٠١٤

[١٦] ئایەتی (٢٦) لە سوورەتی (الرحمن) لە قورئانی پیرۆز. واتا: هەموو ئەو کەسانە لەسەر ڕووی زەوین، هەر هەموو فەوتاو و تیاچووە دەبێت بمرن.

# خەمی دەروون[١٧]

کوورەی دەروونە هاتە جۆش و کوڵ
ڕووباری خەمە ڕووی کردە ناو دڵ
یەخەی خەمم گرت کە بەردا یەخەم
منی خەمناك کرد وتی: بار ناکەم

مات و سەرسام بووم لەئەم وەڵامە
حەزی پڕ وەفای لەم جۆرە کەمە
ماری خەم دیسان ژەهری خۆی ڕژان
دڵ و تویێی دڵی پاکی دارڕزان

ئەستێرەی گەشی ئاسمانی شینم
حەز و ئارەزووی ڕۆژانی ژینم
مەرهەمی دڵی پڕ لە برینم
دڵی لەت لەت کرد خەمی دێرینم



کەلار / تەمموزی ٢٠١٤

---

[١٧] تێبینی: ئەم شیعرە ئەگەر پیتی یەکەمی سەرەتایی نیوە دێڕەکانی ڕیز بکرێت لەسەرەوە بۆ خوار دەبینین نووسراوە ( کریم محمد احمد) کە ناوی سیانی بەندەیە (کەریم ئاغاوەیسی).

# ژیانی دونیا

ڕاستە ئەڵێن: کە ئەم دونیا بێ وەفایە
ژیان تێیدا چەند ڕۆژێکە، بەزەیی بەکەسا نایە

چینێ نوقمە لە دەریای، خەمی بێ پەیا
چینێکیش بێ خەم و، ئاسوودەیە لە ئەم دونیا

کاروانی تەمەن تێپەڕی، لەلای من هەروەکو خەو بوو
ڕوناکی ژین بە هەوری خەم، هەروەکو تاریکەشەو بوو

تەمی خەم نەیهێشت، خۆری شادیم بدرەوشێتەوە
هەرخەم بوو نەیهێشت، ساتێ ئەم دڵەم بحەسێتەوە

ئەم تەمەنە کورتە کەبەشێکە، لەڕۆژەکانی ڕۆژگار
هەرچەند لە دونیادا زۆرە، کۆیلەی دەرهەم و دینار

بێگومان هەرداری دونیایە، بێ بەرە وەك داری چنار[18]
وەك لە فەرمووودەدا هاتووە و ناکرێت ئینکار

[18] داری چنار: یەکێکە لە ئەو درختانەی کە تەنها دیمەنێکی بەرز و جوانی هەیە، بەر و بوومێکی نییە.

کە ئـەم دونیـا بەندیخـانەیـە بـۆ کـەسـانـی ئـیـمـانـدار[١٩]

بـەڵام دونیـا بەهـەشـتێکـە، بـۆ بێـباوەڕی سـتـەمکـار

ئەم دڵـەم بە دەستی خـەم، هـێنده ئـازاری چەشـتووە

هـەروەکو تەخـتەی قەسـاب، سـەراپا لـەت لـەت بـووە[٢٠]

لەم ژینە تاڵە ڕۆژێ نەبوو، کە خەم ماڵئاوایم لێ بکات

ڕەحـمـی خـوای لـەدڵا بێـت، هـێندە ئـازاری دڵ نـەدات

ڕۆژێـك بـە دەسـتـی، مـەینـەتـی و خـەمـۆ

ڕۆژێـکـیش بـە دەسـت، زوڵـم و سـتـەمـۆ

ئـەم هـەمـوو ڕۆژە، بـەخـەم چـووە سـەر

دڵ بـەرگـی شـادی، هـەر نـەکـردە بـەر



کەلار / تشرینی یەکەمی ٢٠١٤

[١٩] پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) فەرموویەتی: (الدنیا سجن المؤمن و جنة الکافر) صحیح مسلم ٢٩٥٦ واتا: دونیا زیندانی باوەڕدارە و بەهەشتی بێباوەڕ.

[٢٠] تەختەی قەساب: ئەو تەختەیە کەگۆشت فرۆش (قەساب) گۆشتی لەسەر ورد دەکات.

# نامەی باوکێك

بۆ ئەو کەسەی کە جێگەی لە دڵمایە
بۆ شەوانی تاریکی دڵ وەك چرایە

ڕۆڵە پێم ناڵێی، دڵت بۆ لە من ڕەنجاوە
لەنێوان من و تۆدا، چی کێشەیەك ڕوویداوە

سوپاس بۆ خوا، کە تۆ باوەڕداری
چۆن ئەبێ باوەڕدار، وەها بێ ڕەفتاری

ئایە ئەبێ بۆ باوکی خۆت نەتبێ وەفا؟
یان نەتبیستووە ﴿وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً﴾[٢١]

باوەڕدار ئەبێ ڕەفتاری چاك بێ لە گشت کاتا
( هل هذا صواب أن يهجر الابن اباه ؟)[٢٢]

کوڕم وەرە دەستی یەکبگرین هەردووکمان
تەمەن چەند ڕۆژێکە تا سەر نییە ژیان

---

٢١ لە ئایەتی (١٥)ی سوورەتی (لقمان) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە واتا: لەدونیاشدا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاکبە بۆیان لەهەموو بار و دۆخێکدا.

٢٢ ڕستەیەکی عەرەبییە واتا: ئایە ڕاست و ڕەوایە کوڕ باوکی خوی جێبهێڵێت (قسەی لەگەڵ نەکات).

تێبینی: ئەم شیعرەم لەسەر داواکاری هاوڕیەکی خۆم نووسیومە کە داوای لێکردووم، کە ئەو هاوڕێیەم لەگەڵ کوڕەکەی خۆیدا کەمێك ناکۆك بوون و دڵیان لەیەك ڕەنجابوو.

داری دونیا هەرچەندە، سێبەری هەبووە
بەڵام ئەو سێبەرە بۆ کەس، تاسەر نەبووە

نەوەك بابت لە ناكاو، مردن ببێ بە میوانی
ئەو كاتە هیچ سوودی نییە گریان و پەشیمانی

تاوان و نارەوایە شكاندنی، دڵی داك باب
( انها مصیبة من المصائب و لیس من الصواب )[٢٣]

ڕەوڕەوەی تەمەن لە ڕێدایە بەردەوام
( انها تحصد الایام والاسابیع و الاعوام )[٢٤]

كوڕم ئەو تەمەنەی وا لەبەردەستی ئێمەدایە
پەنجایەكە یان پەنجایەك و نیوە پەنچایە[٢٥]

نەمبیستووە و نەمدیوە و بڕوا ناكەم هەبێ
كەسێك دارێ بنێژێ و حەز بكا سەوز نەبێ

❋ ❋ ❋

كەلار / شوباتی ٢٠١٥

---

[٢٣] ڕستەیەكی عەرەبیە واتا: ئەمە نەهامەتیەكە لە نەهامەتیەكان و ڕاست و ڕەوایە نییە.
[٢٤] ڕستەیەكی عەرەبیە واتا: ڕۆژەكان و هەفتەكان و ساڵەكانی تەمەن دەڕنێتەوەو دروو دەكات.
[٢٥] پەنجایەكە، واتا: پەنجا ساڵ . ـ پەنجایەك و نیوە پەنچایە، واتا: حەفتاو پێنج ساڵ .

# بولبول لە خەوما

لە خەوما بینیم بولبول لەسەر گوڵ ئەخوێنێ
پاڕامەوە لە خوا كە گوڵ لە بولبول نەسێنێ

وتم بولبول وەرە وەسیەت بنووسە هەتا ماوی
بولبول گریا و تك تك فرمێسكی تكا لە چاوی

وتی مردوو لەكوێ توانای وەسیەتی هەیە و ئەتوانێ
كە من دەمێكە كوژراوی دەستی گوڵم و گوڵیش نازانێ

پەروانە ئاسا ئەسووتێم لەدووری گوڵ هەمیشە
سووتانم كردارێكی بەردەوامە كە كردوومە بە پیشە

لە دەنگی گریانی من هەزاران عاشق دێتە گریان
چونكە هەر عاشق تێدەگات، لە ناڵە و شینی عاشقان

گوڵ بێ ئاگایە و نازانێ كە من كوژراوی دەستی ئەوم
بەڕۆژ هەرناڵە و شینمە و بەشەویش نەماوە خەوم

كە لە خەو ڕاپەڕیم سەیرم كرد دونیا هەرشەو بوو
وتم سەد شوكر خوایە كەوا ڕاست نەبوو خەو بوو



كەلار / ئازاری ٢٠١٥

# لەشکری خەم

لەشکری خەم هێرشی کردە سەر دڵ
لە (ئازار)ی پڕ ئازارا [٢٦]
شاهی خەم وەك هۆلاکۆ
لەگەڵ لەشکری تەتارا [٢٧]

لەشکری خەم کە هێرشی کردە سەر دڵ
قەڵای دڵ داگیر کرا
میر و سەربازی شادی بە دیلی
بۆ دادگای، شاهی خەم برا [٢٨]

بە فەرمانی شاهی خەم
یەك بە یەك لە گەردنیان درا [٢٩]
بەم فەرمانە شوومە هەزاران
ئاواتی شادی لە خاکی دڵ نێژرا

---

[٢٦] ئازار: مانگی ئازار (مانگی ٣) کە مانگێك بووە پڕ لە ئازار و کارەسات بۆ گەلی کورد لەوانە کیمیابارانی شاری هەڵبجەی شەهید لە ١٦ی ئازاری ١٩٨٨ لەلایەن حکوومەتی عێراقەوە.

[٢٧] هۆلاکۆ: سەرکردەی مەغۆلی لەساڵی (١٢١٨ ــ ٨ی شوباتی ١٢٦٥ ز) ژیاوە.ــ تەتار: ئەو کۆمەڵە هۆزە مەغۆلیە بوون کە لەسەدەی ( ١٢ ، ١٣ ز) وڵاتە ئیسلامیەکانی تری داگیرکرد.

[٢٨] شاهی خەم: سەرکردەی (پاشای) دیکتاتۆر و ستەمکار.

[٢٩] (یەك بەیەك لەگەردنیان درا) واتە: هەرهەموویان درا لەملیان و سەربڕان (کوژران).

کاروکرداری وایە خەم هەزاران کەس
بە دەستی ئەو جەرگی بڕا
گێلە ئەو کەسەی چاوەڕێ بێت
کە ستەمکار بۆی ببێت بە برا

گۆڕەپانی خاکی دڵ سوورە بە خوێن
هەروەکو دەشتی ڕۆژی عاشورا [30]
هەرخەمە وەك (شیمری جەوشەن)[31]
بێ بەزەییە لەگەڵ ئەم دڵە هەژارا

خەم کاروکرداری هەروا بووە
پشتی هەزارانی شکاند لەژێر بارا
ئاواتم ئەو ڕۆژەیە کە ببیستم و بڵێن
سوپای خەم لە خاکی دڵ دەرکرا

[30] عاشورا: ڕۆژی دەیەمی مانگی موحرەمی ساڵی کۆچیە لەو ڕۆژەدا ئیمامی حسەین کوڕی ئیمامی عەلی (ر،خ) لەجەنگی کەربەلادا شەهید بووە، بۆیە ڕۆژی پرسە و خەمە لای شیعەکان.

[31] شیمری جەوشەن: (شمر بن ذي الجوشن) شمری کوڕی زیل جەوشەن کە بەشدار بووە و ڕۆڵی گەورەی هەبووە لەشەهید کردنی ئیمامی حسەین کوڕی ئیمامی عەلی (ر،خ).

دڕك و داڵی خەم بفەوتێ و دڵ ببینم
بەرگی شادی ها لە بەرا
شاهی خەم ببینم بە دیلی
ئەپاڕێتۆ و ئەیگێڕن لە بازاڕا

میری نوێی شادی ببینم لەسەر تەخت
تاجی زێڕینی شاهی لە سەرا
چەند خۆشە ئەو ڕۆژە کە بڵێن
خەم تیاچووە ، جاڕ بدرێ بەنێو شارا

ئەو ڕۆژە مەگەر دڵ ئاسوودە بێ کە پەت [٣٢]
ببینم لە ملی شاهی خەمی ستەمکارا
بڵێم ئۆخەی نەما شەوی تاری ستەم
وا ڕووناکی خۆر ئازادە لە ڕۆژگارا



کەلار / تشرینی دووهەمی ٢٠١٥

---

[٣٢] پەت: پەتی سێدارە (پەتی قەنارە).

# هەناسەکانی ناکامیم

دڵم: ئەو دڵەیە کە وەك پشکۆ سوور هەڵگەڕاوە
هەرچەندە سوورە دڵ ، بەڵام ناوی پڕ لە زوخاوە[٣٣]

لێوەکانم: ساڵانێکە لێوبەبار و خەندەی شادی لێ تۆراوە
دەمم: ئەو دەمەیە کە هەمیشە هاواری لێ هەڵساوە

گوێم: هێندە ئاهوناڵەی بیستووە، توانای بیستنی نەماوە
سەرم: ئەو سەرەیە کە کڕنۆشی بۆ دوژمن پێ نەبراوە[٣٤]

پەنجەکانم: هێندە وشەی خەمی پێ نووسراوە[٣٥]
بە جۆرێك بێزار بووە لە نووسین پێنووسم نوکی شکاوە

پێیەکانم: بەپێوەندی خەم ساڵانێکە پێوەند کراوە[٣٦]
سینەم: هەناسەکانی ناکامیم، لەنێویدا تاسێنراوە

چاوەکانم: ئەو چاوەیە کە هێندە ستەمی بینیووە
بینینی شادی لا نامۆیە ، هەر بە خەم ئاشنا بووە

---

٣٣ پڕ لەزوخاوە: پڕ لە ئێش و ئازارە، وشەی (زووخاو) واتا: کێم و زووخ.

٣٤ کڕنۆشی بۆ دوژمن پێ نەبراوە: سەری شۆڕنەکردووە بۆ دوژمن و کڕنۆشی بۆ نەبردووە.

٣٥ پەنجەکان ئەو وشانەی کە نووسیویەتی هەمیشە وشەی خەم و پڕ لە ئێش و ئازار بوو.

٣٦ پێوەند: ( کۆت و زنجیر) ئەوەیە کە دەکریتە پێی کەسانی تاوانبار.

گەر ئەپرسی ئەم سەرەم، بۆ وەك بەفر سپی بووە
چونکە خەیاڵی سەرفرازی، تێیدا باری کردووە

ڕۆژانی شادی کە چوو، بە گریان و ئاهوناڵە ناگەڕێتەوە
بەڵکو فرمێسکی هەور ببێتە لافاو و خەمەکانم بسڕێتەوە[٣٧]



کەلار / کانونی دووهەمی ٢٠١٦

٣٧ هەوری سۆزو بەزەیی پەروەردگار فرمێسکی (بارانی) ببارێنێت و خەمەکان بسڕێتەوە.

# خەمە هاوڕێم

لەبەد بەختی بەختم شادی هەر (نەیار)م بوو[٣٨]
لە خەم زیاتر نە دۆستم بوو نە (یار)م بوو[٣٩]

هەرخەمە بووە، بە دۆست و ئاشنا لەگەڵما
خەم بوو، جێگەی خۆی کردەوە و مایەوە لە دڵما

دڵ هێندە خەم و ئازاری، دووری تۆی کێشا
لە برینی تك تك زووخاوی، ئەتکا لە ئێشا[٤٠]

بڵێسەی ئاگری دووریت، وەها ئارامی لێ سەندووم
سووتاوە دڵ و دەروونم، تەنها بە جەستە زیندووم

وتم: ئەی دڵ بەسە هەتا کەی، بەم جۆرە ئەناڵێنی
بەناڵەت خەم ئەکەیتە دۆست و شادی ئەتۆرێنی

وتی: لەدووری ئازیزان، ناڵە و شین بۆ من کەمە
ئەوەی دۆستی من بێ و، لێم تێبگات تەنها خەمە

هەر خەمە بە وەفایە بەردەوام سەردانم ئەکات
بێ وەفایە شادی چەند چاوەڕێم کرد هەر نەهات

---

٣٨ نەیار: ئەم وشەیە لێرەدا بەم شێوە هاتووە (نەیار) واتا ناحەز (دوژمن)، پێچەوانەی (یار).

٣٩ نە یار: بەڵام هەر ئەم وشەیە لێرەدا بەم شێوە هاتووە نە(یار) واتا: نە دڵسۆز (نە خەمخور).

٤٠ تك تك: تکە تکە (دڵۆپ دڵۆپ)

دڵەکەم لـەگـەڵ خـەمـا بـە جـۆرێك ئـاشـنـا بـووە
هـەر خەمە چەسپاوە لە دڵـما، شادیە لە بیـر چووە

هەوڵم زۆردا لەگەڵ شادی، کە ئەم دڵـەم لەیـاد نەکات
کە چی شادی بێ وەفا بوو، بە داواکەم گاڵـتەی ئەهات

دڵ لە دەشتی چۆڵی ژینا بۆ بێ کەسی خۆی ئەیناڵاند
خـەم باوەشـی بۆ کـردەوە و، وەکـو کـۆرپە دڵـی لاواند[41]

هەوڵم زۆردا دووربێ لەخەم شادی بۆ بکەم بەقەڵغان
بەڵام هەر خەم بەوەفا بوو بارپی بەسەریا وەك باران

سا بۆ چیمە ئیتر شادی، کە ئەوەندە بێ وەفا بێ
خەمە هاوڕێم سەد هێندەی تر گەر ئازاری لەگەڵا بێ

هەرچەند ئەڵێن گرتنی درك، بەئازارە و پڕ لە جەفا
بەڵام لـە لام نـاسـکـتـرە، لـە هـەزار گـوڵـی بـێ وەفا

❋ ❋ ❋

کەلار / نیسانی ٢٠١٦

---

[41] لاوانـد: لاوانـدنەوە (خەم دڵی وەك کۆرپەی ساوا دەلاوانـدەوە، نازی دەکێشا)

# کەلار شارەکەم

کەلار پایتەختی، گەرمەسێرەکەم[٤٢]
جێگەی هەزاران، لاوی دلێر و نەڕەشێرەکەم

لەسەر ئەم خاکەت، هەزاران ڕۆڵەی ئازا و بە توانا
بۆ ئازادی تۆ خوێنی خۆی ڕژاند، گیانی خۆی دانا

لەسەر خاکی تۆ هەزاران ڕۆڵەی، دلێر و بە جەرگ
بۆ سەربەستی تۆ لە کۆڕی خەبات نەترسا لە مەرگ

کەلار، هەرچەند پلەی گەرمیت لە هاوینا بەرزە
بەڵام زستانت بەهارێکی ڕازاوەیە و خاکت سەوزە

لەنێو خاکی تۆ گەرمەسێرەکەم، بەروبومێ زۆر
لە نەوت و قیر و، کانزای جۆراوجۆر

کەس نەی ئەزانی تا لەم ساڵانەی دوایدا دەرکەوت
بێجگە کشتوکاڵ ژێری خاکی تۆ گشت پڕە لە نەوت

---

٤٢ کەلار: شاری کەلار ناوەندی ئیدارەی گەرمیانە، پلەی گەرمی شاری کەلار لە وەرزی هاویندا زۆرجار دەگاتە سەروی (٥٠٪) پەنجا پلەی سەدی، بەلام زۆبەی ڕۆژەکانی وەرزی زستانی پلەی گەرمی وەك ڕۆژەکانی وەرزی بەهار وایە.

چەند بە نرخ و بەپیتە، خاکە شیرینەکەت[٤٣]
چەند جوان و ڕازاوەیە، قەڵا بەرز و دێرینەکەت

قەڵای دێرینت کە ناسراوە، بە قەڵای شێروانە[٤٤]
هەمیشە هەر لانەی شێرانە، ئەم کوردستانە[٤٥]

لەسەر دارت لەسەر بەردت، لەسەر کێوت هەزاران
لەپێناوی خاکی تۆدا گیانی بەخشی و خوێنی ڕژان

گەر زمانی هەبوایە دار و بەردی ئەم گەرمیانە
پڕ بە دەم هاواری ئەکرد و ئەیوت: بزانە

مەپرسە کە ڕەنگی خاکم، بۆ ڕەش هەڵگەراوە
لە قرچەی دەروونی، دایکانی جگەر سووتاوە

ئەو گوڵاڵە سوورەی کە لەسەر ئەم خاکەم ڕواوە
بۆیە سوورە چونکە بە خوێنی لاوەکانم ئاودراوە

گەرمەسێرم ئەو خاکەیە، هەزاران قوربانی داوە
خاکێکە چەندین روفاتی، ئەنفالی تێدا نێژراوە[٤٦]

---

[٤٣] بەپیتە: چاکە و پڕ خێر و بەرەکەتە (خاکیکی چاك و گونجاوە بۆ کشتوکاڵ ).

[٤٤] قەڵای شێروانە: قەڵایەکەکی کۆنی مێژوویە لەسەر تەپۆڵکەیەکی دەستکرد لەسەر رووباری سیروان لە گەرمیان لە شاری کەلار ساڵی ١٨٦٥ز لەسەردەستی محەمەد پاشای جاف درووستکراوە.

[٤٥] لانەی شێرانە: ماڵ و جێگەی شێران (جێگەی پیاوی مەردو ئازاو شێر ئاسایە).

[٤٦] چەندین روفاتی ئەنفال لە گەرمیان لە (دێبنە) نێژراوە، دوای هێنانەوەیان لەخوروی عێراق.

**گـەرمیـانـم، خاکـت شـیـریـنـە لـە دڵـما هـەتـا مـاوم**
**تـۆزی خـاکـت وەك سـورمـەیـە، بـۆ سـۆمـای چـاوم**

**شـنـەی شـەماڵی سـیـروانت، کـە هـەڵکا لـە بـەهـارا**
**لابـەری خـەمـە، لـە دڵـی دەوڵـەمـەنـد و هـەژارا**

**هـۆرەی شـوان و دیـمـەنی ئاسکی دەشـتـەکەی شـاکەل[٤٧]**
**لەرەی گوڵاڵە، سەوزی ئەو دەشتە تا ملەی سەرکەل[٤٨]**

**ئـاوازی مـەل و بـارەی بـزن و مـەڕ ، کـاتـی ئـێـوارە**
**لابـەری خـەمـە، لـە دڵ دەر ئەکـات خـەم و پـەژارە**

**ئەم دیمەنانە و سـروشـتی جـوانی ئەم خـاك و ئـاوە**
**(بـەخـشـیـش)ی خـوایـە بـەم گـەلـەی داوە[٤٩]**

❋ ❋ ❋

**کەلار / ئایاری ٢٠١٦**

---

[٤٧] دەشـتی شـاکەل: یەکێکە لەدەشتایەکانی گەرمیان دەکەوێتە نێوان شاری کەلارو کفری، ئەم دەشـتە بـەوە بە ناووبانگە کە هەمیشە جێگەی ئاژەڵە کێویەکان بووە، بەتایبەتی ئاسك.

[٤٨] ملەی سەرکەل: (ملەی سەرکەلی کەوەڕێ) ملەیەکی بەرزە دەکەوێتە نێوان دێی سـەرکەلی مـارف و دێـی بنەبـەراز و بـە دووری زیـاتر لـە (٤٠) کیلۆمـەتر دەکەوێتـە سـەرووی شارۆچـکەی ڕزگـاری، لـە پێدەشـتی گەرمیان، ملە واتا: (یاڵ) جێگایەکی بەرز، سەرکەل واتا: سەری کەل وشەیەکی لێکدراوە مانای (بەرزایی).

[٤٩] بەخشیش (دیاری ): دیاری خوای بەخشندەیە بە گەلی کوردی داوە.

# پـیری

یاخوا بەخێر بێیت، مەرحەبا پـیـری
هـەرچـەنـد بـۆ دڵـم، تـۆ وەکـو تـیـری

لـە هـێـرش کـردن، بـاڵا دەسـتـی تـۆ
شـادی ئەکوژیت، جـوانی ڕەنجـەڕۆ[٥٠]

موویی سەر و ڕیشم پاك سپی ئەکەی
نەخۆشـی دێنی و لـەش ساغی ئەبەی

شادی سـەر ئەبڕی لـە تەشـتی خـەما
شـیـرین تـاڵ ئەکـەی، لـەنـاوی دەما

پیـری هـەر ئەبێت، سـەردانـمان بکات
گـەر مـردن بێڵێ و مـۆڵەتـمان بدات[٥١]

ئەو چاوانەی وا، بەهـێز بوون جاران
ئێـسـتـا کـز بـووە، نـابـیـنـێ جـوان

[٥٠] واتە: پیری خۆشی و شادی و تەمەنی لاوی لەناو دەبا و دەیکوژێت.

[٥١] واتە: مرۆڤ ئەگەر مردن مۆڵەتی بدات و لە تەمەنی لاویدا نەمرێت، بێگومان پیر دەبێت (پیری سـەردانی دەکات).

ئـەو دەســتانەی وا، وەکـو پـۆڵا بـوون
ئێـستا دەلـەرزن تـەواو پەککـەوتوون

ئـەو پێیـانـەی وا، زرمـەی ئەبیســران[٥٢]
ئێســتا خۆی ناگرێ مەگەر بە گۆچان[٥٣]

ڕوومەت لۆچ ئەبێت، دەمیش بێ ددان
پشـت ئەچـەمـێتـۆ، هـەر وەکـو کـەوان

نـامێنـێت شــەوق و تـوانــا و تـاقـەت
ئـەمـەیـە پـیـری، مـیـوانـی خـەفـەت



کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٦

[٥٢] ئەو پێیانەی: ئەو دوو پێیەی کە جاران بەهێزبوون و لەڕێکردندا دەنگی زرمە (ڕمە)ی دەبیسرا.
[٥٣] واتە: ئێستا بە گۆچان نەبێت خۆی ناگرێت (ناتوانێت لەسەری بووەستیت).

# نەمامی خەم

با جارێ تر لە لاپەڕەی نائومێدی و
ناکامیدا خەمەکانم هەڵبڕێژم[٥٤]
لە خاکی دڵما نەمامێکی
خەمی تازەی تیا بنێژم

خەمم هێندە زۆرە ئەگەر من
بێت و باسی خەمم بکەم
باسی خەمم کۆتایی نایە
نە بە(نووسین) و نە بە(دەم)[٥٥]

خەمی گەلێکی دیل و
ژێردەستە و ئاوارە و بێکەس
خەمی گەلێکی پەل و باڵ
شکاو زیندانی قەفەس

٥٤ لەلاپەڕەی یادەوەری پڕ لە خەم و ئێش و ئازارەکانم، خەم و ئێش و ئازارێکی نوێی تێدا بنێژم (تێدا تۆمار بکەم).
٥٥ باسی خەمەکان هێندە زۆرن نە بەنووسین و نە بە باسکردنی بە دەم کۆتایی نایە.

گــەر ئەپرســی لــە ئـەم ژینـە
بـۆ خـەمـبــار و بـۆ خـەمـۆکـم[٥٦]
بـە تـیـری خــەم وەکــو بـولــبـول
شـــکــا بـاڵـــم، شـــکــا چـۆکـم[٥٧]

خـــەم شــیـری کــێـشــا لــە دڵ
دڵـی بـە(شـیـر) لـەت لـەت کـرد[٥٨]
دڵ وەك مـنــاڵــێـکـی ســـــــاوا
کـە بـێ (شـیـر) بـێ لـە بـرسـا مـرد[٥٩]

(کــەریـم)م ئـەمـــڕۆ لــە نـێـو
بــاخـی خــەمـا ســەیـران ئەکــەم
دەمـێـك ســـەرقـاڵـی نـووســـین و
(دەمـێـك)یش بـۆ ژیـن هـەوڵ ئەدەم[٦٠]

---

٥٦ خەمبار: کەسێکە کە ناخی(دڵ و دەروونی) پڕ بێت لە خەم. ــ خەمۆك: کەسێکە کە هەمیشە مات و خامۆشەو سەرقاڵی خەمەکانیەتی.

٥٧ چۆك: ئەژنۆ

٥٨ شیر: لیرەدا مەبست شمشێرە.( شمشێری کیشاو دڵی پارچە پارچە کرد).

٥٩ شیر: لیرەدا مەبست ئەو شیرەیە کە مناڵ دەیخوات.

٦٠ دەمێك: ماوەیەك (بەینێك).

پێنووسم ئەگەر بێتە نووسین
لە خۆفرۆش و لە ستەمکار
وەکو (تیغ) ئەبڕێ و سڵ ناکات
نە لە (شاە) و نە لە (شالیار)[٦١]

برام کە خوا تەمەنێکی
دیاری کراوی بە من داوە
بۆ چی نەنووسم ئەو ستەمەی
کە لە ئەم (گەلە)م کراوە[٦٢]



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٦

[٦١] تیغ: کەرەستەی بڕین وەك خەنجەرو شمشێر....هتد. ـ شاە: پاشا ـــ شالیار: وەزیر.
[٦٢] ئەم (گەلە)م: گەلی کورد (نەتەوەی کورد).

# دڵ لانەی خەمە

سـاڵانێکە کە دووری لـێم و دەنگت نایـە بە گوێما[٦٣]
کۆچـت برینێکی قـووڵی بەجێ هـێـشت لـە دڵـما

دەروون: حەقیە هەتا ماوە وەکو بولبول بناڵـێـنـێ
چـاو: حەقیـە لــە دووریـت فـرمێسکـی ببـارێـنـێ

سـەر: حەقیـە وەکو شــێت بیـرو هـۆشی نەمـێـنـێ
زمان: حەقیـە هــەر ســروودی خــەم بـخـوێـنـێ

پەنجە: حەقیە ئیتـر هەر هۆنـراوەی خەم بنوسـێ
گـوێ: حەقیـە ئیتـر کـە ئـاوازی شــادی نەبـیـسـێ

سینە: حەقیە بە گڕی هەناسەی دونیـا بسووتێنێ
دڵ: حەقیە ببێ بە موشتەری و، هەر خەم بسێنێ

بـا گـڕی دڵ لــە ســیـنـە ســەر بکات و بـێـتـەدەر
پێ: لادا لــە ڕێی شادی و ڕێگەی خـەم بگرێتەبـەر

---

[٦٣] دەنگت نایە بە گوێما: دەنگ و وتەی شیرینت نابیستین بە هۆی ماڵاوایی و کۆچی دواییت.
ئەم شیعرەم (دڵ لانەی خەمە) بۆ یادی سێ ساڵەی کۆچی دوایی (بەرزان)ی کوڕم نووسیوە.

خەم: حەقیە بێ دڵ نەژی، ساتێ لە دڵ نەبێ جیا
چونکە جێگەی خەم، هەر دڵە لە ئەم دونیا

کاتێ مەگەر بڵێن خەم لە دڵ کۆچی کردووە
خەم بزانێ کە دڵ نەماوە و، لە لێدان کەوتووە

خەم ببیستێ دڵ تیاچووە، حەقیە خاك بەسەراکا
حەقیە بۆ لانەی وێرانی، سەراپا ڕەش لەبەرکا



کەلار / تشرینی دووەمی ٢٠١٦

# دایك

دایك ئــەی ئــەو کــەســـــەی
کـە هۆکـارێ بووی بۆ بـوونـم[٦٤]
دایك ئەی فریشتەی خەمخور
بـۆ هـــەژاری و بـۆ نەبـوونـم

دایك ئــەی ئــەو کــەســـــەی
بـەبـێ تـۆ بـوونــەوەر نـابێـت
دایك ئــەی ئــەو کــەســـــەی
کـە بەهەشـتـم ها لەژێر پێت[٦٥]

دایك ئــەی ئــەو کــەســـــەی
کـە هـــیـچ کـەس نـاتـوانێـت
وەك تـۆ خـــاوەن ســـــۆز و
هـەمـیـشـــە دڵـفــراوان بێـت

---

٦٤ هۆکارێ بووی بۆ بوونم: هۆکارێك بووی بۆ درووست بوونم (بۆ لە دایك بوونم).

٦٥ بەهەشت لە ژێر پێی دایکدایە: پێغەمبەر(د.خ) پرسیاری کـرد لـە (جاهیمـەی سـەلەمی) دایکت هەیـە (دایکت ماوە)؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: گوێڕایەڵی بە بەهەشت لە ژێر پێی ئەودایە.
(( قَالَ رَسُولُ اللهِ (ص) لِجَاهِمَةَ السَّلَمِيِّ : هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ ؟ قَالَ نَعَمْ . قَالَ: ( فَالْزَمْهَا فَإِنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ رِجْلَيْهَا ) رواه النسائي (٣١٠٤) ، وحسنه الألباني. ))

**دایك ئەی ئەو كەسەی**

**بەبێ تۆ منالٚ کز و بێ نازە**

**دایك ئەی ئەو كەسەی وا**

**لای لایەت خۆشترین ئاوازە**

**ئێمە هەموومان هەتاكو**

**ماوین قەرزاری دایكین**

**ڕەنجی زۆر داوە كاتێ**

**منالٚ بووین هەتا پێگەیین**

**شەو تا بەیانی بێشكەی**

**ئەجوێنا هەتا ئەخەوتین**

**ئارامی نەبوو فرمێسكی**

**ئەڕشت كاتێ نەخۆش بووین**

**بۆیە پێویستە گوێڕایەلٚی**

**بین دلٚی نەشكێنین**

**خوا فەرموویەتی نەلٚێین**

**(ئۆف) پێیان نەیان ڕەنجێنین**[٦٦]

---

[٦٦] **(ئۆف): لە ئایەتی (٢٣)ی سوورەتی (الأسرء) لە قورئانی پیرۆزدا، خوای گەورە فەرموویەتی:**

**﴿ فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ ﴾. واتا: بە دایك یان باوك یان هەردووكیان، ﴿ پێیان نەلٚێی ئۆف ﴾.**

فەرمانی خوایە کە چاکەکار
بین بە ڕەوشتی جوان
ڕێزیان لێ بگرین دایك
یان باوك یاخود هەردووکیان

ئەی دایك گەر من پێناسەی
پیتەکانی ناوی تۆ بکەم
من بەم شێوە لە پیتەکانی
ناوی جوانی تۆ تێدەگەم

ئەو (دالە) کە یەکەم پیتی[٦٧]
ناوتە بەبۆچوونی من وایە
کە دڵ و دەروونت دەریایەکە
سۆز و خۆشەویستی تیایە

ئەو (ئەلفە) کە دووهەم پیتە[٦٨]
لە ناوی تۆدا نوسراوە
ئارام گرتنێکی بێسنوورە
کە خواوند بە تۆی داوە

---

[٦٧] دال (د): یەکەم پیتە لە ناوی (دایك).

[٦٨] ئەلف (ا): دووهەم پیتە لە ناوی (دایك).

(یـائی) نـاوت یـادەوەریـەکـانی[٦٩]
مـنــالّــیـم بـیـر ئەخـاتــەوە
(کاف) ناوت لە کلّپەی کوورەی[٧٠]
دەروونـــی تـــۆوە هـــاتـــووە



کەلار / کانونی دووەمی ٢٠١٧

---

٦٩ یائی (ی): سێ یەم پیتە لە ناوی (دایك).
٧٠ کاف (ك): چوارەم پیتە لە ناوی (دایك).

# بەهار

لــە بیـســـت و یەکی مـانـگی ئـازار[٧١]
واتــە نــەورۆزە ســـەرەتـای بــەهـــار

بەهــار ســـەرەتـای ســالْــی کـوردانـە[٧٢]
بەڕاســتـی بەهـار وەرزێـکی جـوانـە

بەهــار بەخـێر بێـی شـادیت هـێناوە
ســەوزی دەشـت و دەر زاخـاوی چـاوە

بـۆنـی نـەرگــس و لــەرەی گـولاڵـــە
لا ئەبـا لـە دڵ خـەمـی چـەنـد ساڵـە

شـنەی شـەماڵ و هاژەی دۆڵ و چـەم
دەرمـانـە بـۆ دڵ شـیـفـایـە بـۆ خـەم

بـە هــاتنـی تـۆ، گـــوڵ ئەگـەشـێـتـۆ
بەفـری شـاخەکان، بـە تـۆ ئەتـوێـتـۆ

---

[٧١] بیست و یەکی مانگی ئازار (بیست و یەکی مانگی سێ): یەکی مانگی نەورۆزە.

[٧٢] سەرتای بەهار و یەکەم مانگی ساڵی کوردی: مانگی نەورۆزە.

زەوی بـەرگـێـکـی تــازە ئەپـۆشـێـت
سـەرما و (کرێوە)ی زسـتـان نامێنێت[٧٣]

تــارا ســپیەکـەی وەرزەکـەی زســتـان[٧٤]
تـۆ دایدەماڵـی لــەسـەر شــاخـەکـان[٧٥]

جـوانتـرین وەرزی گـشـت وەرزەکـانی
وەرزی دەشت و دەر وەرزی سەیـرانی

یاخـوا گـشـت ساڵێ هەروا بە خۆشـی
بەرگـە سـەوزەکـەی جـوانـی بـپـۆشـی

بەهـار کە تـۆ چـوویـت کاتی هـاوینـە
کـاتـی هـەڵـوەریـن لالـە و نەسـرینـە[٧٦]



کەلار / شوباتی ٢٠١٧

---

٧٣ کرێوە: بای سارد و سەختی بەفری وەرزی زستان.
٧٤ تارا سپیەکەی: بەفرەکەی.
٧٥ دای دەماڵی: (لەبەری دادەکەنی) لای دەدەی.
٧٦ لالە و نەسرین: دوو جۆر گوڵن (گوڵی لالە) و (گوڵی نەسرین).

# ڕۆژانی تەمەن

ڕۆژانـی تـەمـەن خــەمـی زۆر تیـایــە
هـــەر دڵـە لـەژێـر بــاری خـەمـایــە

تـەمـەن چـەنـد ڕۆژێ دیــاری کــراوە[٧٧]
خـۆشی و ناخـۆشی هـەردوو لـە نـاوە

گوڵـی تـەمـەن بـوو لــە باخـی ژیــان
خەم وەك ڕەشەبا هەمووی هەڵوەران

لاوی ڕۆژانـــی بـەهــــــــاری ژیــنــە
تـەمــەنـی لاوی زۆر زۆر شــــیـریـنـە

نـرخـی جـــوانـی، کەسێك ئەیـزانـێ
کەسێك کە پیـر بێ و کە وا نەتوانـێ

نـەتـوانـێ وەکـو، تـەمـەنـی جــوانـی
ئـەنجـامـی بــدات، کــار و فـەرمــانـی

ئەوسا هەست ئەکات کە وا پیـر بووە
تـەمـەنـی لاوی لـــە دەس دەرچـووە

٧٧ تەمەن ماوەیەکی دیاری کراوە لای خوای گەورە، بەخشیویەتی بە مرۆڤ و هەموو گیانداران.
ئەم شیعرەم (ڕۆژانی تەمەن) بە دەنگی کاك کەمال کۆڵتەدەر تۆمار کراوە.

شـەو تــا بـەیـانـی، لـە تـاوی ئـازار
خەوی نامێنێت، پێچ ئەدات وەك مار

دەورەی لـێدەدات، نەخۆشـی و پیـری
فـشاری خـوێن و شـەكـرە ودڵـگـیـری

نـامێنێت بیـر و هـۆشـەكـەی جـاران
دووی ئەبێت بە سێ لەگەڵی گۆچان

لـەگـەڵ گـۆچـانـا ئەبێـت بـە هــاوڕێ
گـۆچـان ئەبـێـتـە، ڕێـبــەری بــۆ ڕێ

كـەس بانگی ناكات، بە كوڕكە و كاكە
بـە خـالـۆ حاجی و، جـارجـار مامەكە

لـە هـەر شـوێـنـێكا هـەر كـەس بیبینێ
هـەولّ ئەدات كـە وا دڵــی نەشـكـێنێ

ئەڵــێـن تـەمـەنـێ بـاشــی كـــردووە
لـە كـاتـی خـۆیـا، چـی كـوڕێـك بــووە[٧٨]

مـامەی ڕیـش سـپی بـە ئـەم قـسـانـە
هـەرچـەنـدە گوێیشی تـۆزێك گـرانـە

---

[٧٨] لە كاتی خۆیا چی كوڕێك(كەسێكی) بە توانا و بە هێز بووە.

ئـاخ هـەڵدەکێشێت، بـۆ کـاتـی لاوی
تـەڕ ئەکـات ڕیشـی فرمێسکی چـاوی

مامەی ڕیش سـپی بە ئـاخ هەڵکێشان
ئەڵـێت: پیـریـە، دەردی بـێ دەرمـان

جـوانـی خـەوێك بوو، ئێمـە بینیمـان
تەمەنی جـوانی دەرچـوو لە دەسـمـان

ڕۆژانـی تـەمـەن، وەك کـتـێب وایـە[٧٩]
هــەزاران وانـەی بـە سـوودی تـیـایـە



کەلار / ئازاری ٢٠١٧

---

[٧٩] وەك کتێب وایە: وەك کتێب چیرۆك و داستانی تێدایە.

# لە دەریای خەیاڵ

ڕۆژی بـە خـەیـاڵ وەك مەلی خـۆشـحـاڵ[٨٠]
لـەنێـو ئـاسـمـانا دام لـە شـەقـەی باڵ
دوور کـەوتـمـەوە لــە بگـرە و بـەردە
لــە ئێـش و ئـازار، لــەم هـەمـوو دەردە
لــە دەریــای خەیـاڵ بـوومـە مەلـەوان
فـەرامـۆشـم کـرد جەنـجـاڵـی ژیـان
لــەنێـو گـێـژاوی چـەنـد خـەیـاڵـێـکا
ئـەم دونیـام بینـی لـە چـەنـد حاڵـێـکا
هەر چەند کـە خەیـاڵ، دوورە لـە راسـی
بـەڵام بـۆ خـۆشـی من ئەکـەم بـاسـی
بـە خەیـاڵ بینیـم دونـیـا تێکـچـووە
سـەرانسـەر خەڵکـی، هـەمـووی وڕ بـووە
لە جیاتی بۆ پێش خەڵك بۆ دوا ئەچوو
خەڵکی ئاسوودە، هەمووی بێ خەم بوو
وتـم: بـە یـەکـێك کاکـە گـیان تـوخـوا
ئـەم خەڵکـە بـۆ چـی، بـەرەودوا ئەڕوا

---

[٨٠] خەیاڵ: خەون و خەیاڵ(دالغە).

ئەم هۆنراوەیە (لە دەریای خەیاڵا) بە دەنگی کاك کەمال کۆڵتەدەر تۆمار کراوە.

وتـی: لـــه داخـی وشـــەی پێشکـــەوتن

ئـەم خەڵکە هـەمووی بـەرەودوا ئەچـن

وتـی: پێشکـــەوتن ئـەگـــەر ئـــاوا بـێ

مـافـی یـەکـتـری تـیـا پێشـێـل بکـرێ

بـمـرێ پێشکـــەوتن (تەفروتوونـا) بـێ[٨١]

بـــژی دواکـــەوتـن مـاڵـــی ئـــاوا بـێ.

هــــەروا ڕۆیشــتم بـه ئـەم حـاڵــەوە

ســـەرم زۆر ســـوڕما بـەم خـەیـاڵــەوە

بیـنـیـم چینـێکی مامـۆســـتا و زانـــا

نــــەزان دایـنــاون دەرســـیان پێـدەدا

(نیوتن) کـەوت بـوو لـە وانـەی فـیـزیـا[٨٢]

زۆر بـێ ئـاگــا بـوو لـــە بـاســـی هـێـزا

(بـۆیـڵ) لـــه کـیـمـیـا تـەمـەڵ و نـــەزان[٨٣]

ئەیوت: مـانـای چـی قەبـارە و پەســتـان

(ئـەدیـسـون) بـێڵـی دابـوو بـە شـــانـا[٨٤]

جـوتـیـــار بـوو لـــە نـاو بـاخ و بێسـتـانـا

---

[٨١] نیوتن : زانای فیزیای ئینگلیزی ئیسحاق نیوتن کە یاسای هـێـزی دۆزیەوە.

[٨٢] (تەفروتوونا) بێ: لەناوبچێ، نەمێنی، (بڕووخی).

[٨٣] بۆیڵ : زانای کیمیایی ڕۆبەرت بۆیڵ کە یاسای قەبارە و پەســتانی دۆزیەوە.

[٨٤] ئەدیسۆن: زانای ئەمەریکی (تۆماس ئەدیسۆن) (١٨٤٧ - ١٩٣١) بە داهێنەری گڵۆپی کارەبایی دادەنرێت.

(ئینشتاین)یش سەرقاڵی کار بوو[٨٥]
دیواری ئەکرد وەستای دیوار بوو
(غاندی)یش بەرگی خاکی لەبەر بوو[٨٦]
لەنێو سوپادا پلەی ئەفسەر بوو
(هیتلەر) بۆ ئاشتی کرابووە نوێنەر[٨٧]
نەفرەتی ئەکرد لە شەڕ و شەڕکەر
دراوسێی یەکبوون گورگ و بزن و مەڕ
لەگەڵ یەکا بوون بێ هەرا بێ شەڕ
بە ئەسپ و گوێ درێژ هاتووچۆ ئەکرا
بەروبوومی دەشت بۆ ناو شار ئەبرا
مامەڵەی خەڵکی لە بازاڕ و شار
عانە و فلس بوو نەك گەڵا و دینار[٨٨]
یەکەمین یاری لە کاسی جیهان
یان کێل و بەرد بوو یان گورزی خەتان[٨٩]

---

[٨٥] ئینشتاین : زانای فیزیای ئالبیرت ئینشتاین لە ئاڵمانیا لە دایك بووە .

[٨٦] غاندی : (٢ی ئوکتۆبەر ١٨٦٩ ـ ٣٠ی یەنایر ١٩٤٨) پێشەوای ڕامیاری و ئاینی وڵاتی هیندستان بووە.

[٨٧] هیتلەر : ئادۆڵف هیتلەر (٢٠ی نیسانی ١٨٨٩ ـ ٣٠ی نیسانی ١٩٤٥) پێشەواو دامەزرێنەری پارتی کرێکارانی نەتەوەیی سۆسیالیستی ئاڵمانیا بووە کە ناسراوە بە پارتی نازی.

[٨٨] عانە و فلس: دراوێکە مێژووکەی دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی پاشایەتی لە عێراق، عانە دراوێکی کانزایی بووە بەهاکەی چوار فلس بووە. گەڵا: یەك گەڵا واتە سەد(١٠٠) دۆلار.

[٨٩] کێل و بەرد ، گورزی خەتان: دوو یارین کلتورین جاران لە دێهاتەکانی کوردستاندا دەکران.

قورســـترین چەکی وڵات ســـەرانســـەر
یـان دارلاسیك بـوو یـان تـیـر و خەنجـەر[٩٠]
وتـم: ئـــەی هـــاوار، دونـیـــا گـــۆڕاوە
هـیـچ شـتـێك لـــە جێـی خـۆیـا نـەمـاوە
کـاتیٚ لـــە دەریـــای خەیـاڵ چـوومـەدەر
چـوومە نـاو دونیـای بیٚ ســەر و بیٚ بـەر
وتـم: ســەد خـۆزگــە خەیـاڵ نـەبـوایـە
ژیـــان بــەو شـــێوە ئـاســـایی بـوایـە
لە لایەکی تر دڵخۆشی خۆمم بەوە دایـەوە
نەبیٚ چاکتـرە زانا و زانستی بەبیٚ کردەوە[٩١]



کەلار / ئازاری ٢٠١٧

[٩٠] دارلاسیك: (قەڵماسن، تیرکەوان) ئامێرێکە بۆ فڕەدانی بەرد. تیر و خەنجەر: (تیر) نووکێکی تیژی هەیە بەکەوان دەهاوێژرێت. (خەنجەر) یەکێکە لە تیغەکان جاران پیاوان دەیانکرد بەبەری پشتوێنەکیاندا.
[٩١] زانا و زانستێك سوودی نەبێت و کردەوەی پیٚ نەکرێت نەبوونی باشترە.

# گەشـتێك لە بەهارا

لـــە ڕۆژانـێـکـی وەرزی بـەهـــــارا
لـەنێـو چـیـمـەن و گـوڵ و گـوڵـزارا

دوور کـەوتمـەوە لـە جـەنجاڵی شـار
چـوومە دەشت و دەر بۆ گەشـتوگوزار

دەشت و دەر بەرگی سەوزی لەبەر بوو
شـاخەکان هـێشـتا بەفری لەسـەر بوو

تەمی سـەرشـاخ و پەڵەپەڵەی هـەور
جارجار ئەو دەشتەی ئەکردە سـێبەر

دڵـۆپـەی شـەونـم لـەســەر گـژوگـیـا
ئەدرەوشـایـەوە کـە خـۆر لـێـی ئەدا

کـەش و هـەوایە زۆر سـاف و بێگـەرد[٩٢]
لای ئەبرد لـە دڵ هەزار ئێش و دەرد

گوڵاڵـە سـوورە لـە بـەرزایـی و چاڵ
ئەلـەریـەوە بــە شـــنـەی شـــەماڵ

---

[٩٢] بێگـەرد: پاك (خاوێن).

بـەڵام کــە کـاتـێك، بـیـرم کــردەوە
خــەمـی دێــریـنـم بـە بـیـر هـاتـەوە

بـە زامـی سـەخـتی خـەمـی دێـریـنـم
لــێـم بـوو بـە پـایـز بـەهــاری ژیـنـم[٩٣]

❋ ❋ ❋

کەلار / نیسانی ٢٠١٧

[٩٣] بەهۆی خەمەکانمەوە وەرزی (بەهار)ی سەوز و خۆشیم لێ بوو بە وەرزی( پایز)، (خەزان)ی گەڵاڕێزان.

# ناڵەی دڵ

گوێم لێ بـوو کـە مـاڵـی دڵ
وا خـــەریکـی بـــەزم و ڕزمـە[٩٤]
وتـم: ئـۆخـەی کـە دڵ شـادە و
خـــەریکـی ئـاواز و نـەزمـە[٩٥]

کـــە چـــووم و دام لـــــە
دەرگـــای دڵ بۆ پـرســیاری
بینیـم دڵ وا بە کوڵ ئەگری و
هـەر نـاڵـە و شـیوەنـە کـاری

کە بینیـم دڵ بـە پـەرۆشـە و
وا خـــەریکـی (واوەیـــلا)یـە[٩٦]
وا گـــیرۆدەی پـــەژاریـە و
زامـی ســەختـی لـەنێـوایە

---

[٩٤] بەزم و ڕزم: دەنگەدەنگ.
[٩٥] ئاواز و نەزم: گۆرانی شادی وخۆشی.
[٩٦] واوەیلا: هاوار و شین و گریان.

وتـم: ئــەی دڵ ئــەوە چــییـە
وا هـــــاوارت لـێ هـەڵــســـاوە
ئەڵێی دیسـان هەروەك جـاران
ئـازیـزێـکـت لــــە دەسـتـداوە

وتـی: ئـەوەی هـــــەم بـوو مــن
دەمێکە لـە دەستم دا و نـەما
بـۆیـە پیشـەم هـەر گـریـانـە و
(نوقم)م لـەنێو دەریـای خـەما[٩٧]

وتـم: ئــەی دڵ تــۆ ئـەڵــێـی
بە شـیـری خـەم گۆش کـراوی
کـە هـێـنـدە دووری لـە شـادی
وا بــە خــــــەم دەورە دراوی

دەسا ئەی دڵ بۆ چەند ساتێك
لــــە خـەیـــاڵــی کـۆنـت لادە
خــــەمـی ســـالانـی ڕابـوردوو
بـە شـەمـاڵـی شـادی بـە بـادە

[٩٧] نوقم: وەك نوقم بوونی پاپۆڕ لە ئاوی دەریادا.

بەڵام دڵ لەبەر بەد بەختی
بەختی وەك جاری جاران
ئەیدا بە سەردا و هەر
بەردەوام بوو لە قوڵپەی گریان

کاتێ کە بینیم دڵ لە ئازارا
ئەناڵێنێ و حاڵی وایە
پاڕامۆ بە کوڵ سارێژکەی
زامی سەختی دڵ خوایە

ئەی دڵ هەتاکەی
ناڵە و شین تاکەی
تاکەی وەك (فەرهاد) بە یادی
(شیرین) قوڵنگ لێدەدەی[٩٨]

تاکەی سەرگەردان تاکەی
لە شادی دونیا بێ بەشی
تاکەی ئاوارەی تاکەی
لە کۆڕی زیکرا دەروێشی

---

[٩٨] (فەرهاد) و (شیرین): دوو ئەویندارە ناسراوەکەی چیرۆکی دێرینی (شیرین و فەرهاد).

تـاکــەی بــە جـامــی خــەم و
پـــەژارە زوخــــــاو ئەنـۆشـــی
تاکەی وەك سەرخۆش بە مەیی
خـــەمی دونــیـــا بـێ هـۆشــی(٩٩)

ئـەی دڵ هـەتـاکـەی لـە دونـیـای
ڕۆشـــن تــۆ دیـلــی خـــەمـی
تاکەی دێوانە و تاکەی عەودالْی
تاکەی لە گەڵی خەما هاودەمی



کەلار / ئایاری ٢٠١٧

[٩٩] بێ هۆشی: سەرخۆشی (بێ ئاگای).

# خـەم و دڵ[١٠٠]

ئەگەر بیستم هاوار کرا، لە گشت لاوە
یاخود بینیم لاشەی خەمە هەڵواسراوە

ناڵێم: ئۆخەی خەم تیاچووە، ئۆخەی نەما
بە بیستنم بە بینینم دڵنیا نیم ناکەم بڕوا

ئەڵێم هەرگیز نەبووە و نابێ، شتی ئاوا
چلۆن ئەبێ خەم و دڵم لە یەکتری ببن جیا

ئەڵێم دڵمە هەڵواسراوە، لەگەڵ خەما
باوەڕ ناکەم بە ئەو گیانەی ها لەبەرما



کەلار / ئابی ٢٠١٧

---

[١٠٠] ئەم شیعرەم باس لە هاوڕێتی خەم و دڵ دەکات کە چۆن بە یەك ئاشنانن.

# بۆرمای خوێناوی

دیســـــان کولـیـاوە زامـــی دێـرینـم
زامی (ئەنفال) و (بۆرما)ی خوێـنـینـم[١٠١]

ئەی بۆرما بۆ تۆ خوێن دێ لە چاوم
وەك تـۆ هەڵـقـرچـا دڵ و هـەنـاوم

ئـەو کـارەســاتەی لــە تـۆ ڕوویـداوە
پێـشـتـر لـە گەڵی کوردیش قەومـاوە

کـوا مـافی مـرۆڤ کـوا دیموکـراسـی
لـــەنـێـو (بـۆرمـا)دا بـۆ نییـە بـاسـی

لافـــاوی خـۆێـنـە لـــەوێ هەڵـســـاوە
بـە هـــەزارەهـا لاشـــە ســــووتـاوە

هـــەزاران تـەرمـی لـەت و پـەت کـراو
هـــەزاران مـنـاڵ لـــە ئـاوا خـنـکـاو

---

١٠١ ئەنفال: پرۆسەی بە ناو (ئەنفال)ی گەلی کورد ساڵی ١٩٨٨ لە لایەن ڕژێمی بەعسی عێراقی.
بۆرما (میانمار): یەکێکە لە وڵاتانی ڕۆژئاوای ئاسیا و هاوسنووورە لەگەڵ هەریـەك لـە چین و هیندستان و بەنگلادیش، ئەم هۆنراوە لە ئەیلولی ٢٠١٧ نووسیومە بۆ ئـەو کۆمەڵکوژیـەی موسڵمانانی بۆرمـا (میانمار) کە لە لایەن بووزییەکانەوە ئەنجام درا.

پیری ڕیش سپی ئەشکنجە ئەدرێت
ئافرەتی دیندار، هەتك ئەکرێت

(بووزی)یە، ملی موسڵمان ئەگرێت[١٠٢]
بێ هیچ تاوانێك، سەری ئەبڕێت

بۆ (یو ئێن) کەڕە ئاگای لێ نییە! [١٠٣]
ئەم ڕەش و ڕووتە تاوانیان چییە؟

(بۆرما)یش هەروەکو گەلی کورد وایە
بێ کەسە و داماو، کەسی هەر خوایە

نەفرتی خوا و سەرانسەر بەندە
لە (بووزی) بێ دین (بووزی) دڕندە

لە وڵاتانی بە ناو موسڵمان
نەفرەت لە (پاشای عەرەب)ی مل پان[١٠٤]

---

١٠٢ بووزی (بوذي): کەسێك لەسەر ئاینی(بوذي) بێت، ناوەکە لە (بوذا)ی دامەزرێنەریوە هاتووە.

١٠٣ یوئێن: UN کورت کراوەی (United Nations) واتا(نەتەوە یەکگرتووەکان ـالأمم المتحدة).

١٠٤ پاشای عەرەب: پاشای ئەو وڵاتە عەرەبییانەی کە هیچ هەڵوێستێکیان نەبوو لە کۆمەڵکوژی و ئەشکەنجەدانی موسلمانانی بۆرما، وە هەر پاشای ئەو وڵاتە عەرەبییانە بوون کە هیچ هەڵوێستێکیان نەبوو دژی پرۆسەی ئەنفال کردنی گەلی کورد بەڵکو زۆربەیان بەڕەوای دادەنا.

کـوا وڵاتی عـەرەبی بـۆ دەنـگی نــەمـا

شـمشـێریان هەیـە بۆ ڕەقس و سـەمـا

هــــەر بـۆوە ئـازان شـمـشـێر بـابــدەن[١٠٥]

یەکێکیان نەیوت کورد ئەنفال مەکەن

ئێستاش بۆ بۆرما وەك کـەڕ و کوێرن

نــاوێـرن نـــــاوی (بــوزییـەك) بـێـرن

نەفرەتان لـێ بێت چەنـد بێ غـیرەتن

وا دەسـتان خـسـتـە ناودەسـتی دوژمن

وەڵامـتــان چـییـــە بــۆ ڕۆژی دوایـی

ڕۆژی مـەحـشــــەر و دادگای خــوایـی



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٧

[١٠٥] شـمـشێر بابدەن: زۆر جار بۆ نمایشت کـردن لـە کـاتی خۆشی و بۆنەکانـدا شـمـشـێر بـەرز دەکەنـەوە و بـایدەدن و شیعر (هۆنراوە) و پیاهەڵدان دەڵێن و هەڵدەپەڕن.

# قەرەبووی بەختم

بـە خەیاڵ بینیـم مـن کـە وا شــەوێك
گەیشـتمە بەخـتم هـەر وەکو خـەوێك

وتـم: ئــەی بەخــت حــاڵــم بــۆ وایـە
کـاروانی شـادیم گـشـت کات لـە دوایـە

وتـم: ئـەی بەخـت بـۆ چـی مـن وەهـا
خـەمـە مـیوانـم بـە تــاك و تـەنـهـا

وتــی: ئــارامـبـە مـن لـــــە داهــاتـوو
قـەرەبووی ئەکەم یەك بەیەك هـەمـوو

قـەرەبـووی هــەمــووت بــۆ ئەکـەمـەوە
گەورە تا بچووك چیت لە دەست چووە[١٠٦]

وتـم: کـامـیـان تـەمـەنـی ڕۆیـشـــــتووم؟
یـان مـووەکـانی ســـەری ســـپـی بــووم؟

دەربـەدەریـم و فـرمـێـســکــی چــاوم؟
غـەریبیـم یـاخـــود دڵـــی شــکــاوم؟

---

[١٠٦] چیت لە دەس چووە: هەر شتێکت کە لە دەس چووە (فەوتاوە).

لــێوی بەبــار و جــەرگــی ســـووتــاوم؟
یان ڕەنگ وەك لیمۆی زەرد هەڵگەڕاوم؟

یان لانــە و ماڵی چەند جار ڕووخـاوم؟[١٠٧]
یان زامـی ســـەختـی پـڕ لـــە زوخـاوم؟

کــام لـــە ئـەمـانـە قـەرەبـوو ئەکـەی؟
پـاداشـــــتـی کـامـیـان ئەتـوانـی بـدەی؟

کە گوێی لـەم هەمـوو باسـە بوو کـردم
بـاسـی فـرمـێسـك و ئـــازار و دەردم

وتـی: قـەرەبـوی، تـۆ نـاکـــرێ بـۆم
هـەتـاکـــو مـــاوم من قـــەزاری تـۆم

***

کەلار / ئەیلولی ٢٠١٧

---

[١٠٧] کەم کەسێکی کورد هەیە کە چەندین جار ئاوارە نەبوو بێت و لانـە و مـاڵ و خـانوی نـەروخا بێـت بـە دەستی دوژمنانی گەلی کورد.

# باوك

کـە کۆچـت کـرد، هـەزاران تـیـر لـە دڵـمـی دا
هــەزاران خـەم هــات و لــە دەرگای دڵـمـی دا

روحـت شــاد بێ ئەی مەرهەمی ئێش و بریـنـم
ئـەی بـاوك و ئـەی ســەرقافڵەی ڕێگـەی ژینـم [(١٠٨)]

ئەی ئەو کەسەی بۆ ڕێگەی من وەك چرا بووی
تـۆ گەنجـێنەو سـامـانـم بـووی لـەکـیسـم چووی

تـاجی ســەرم یـاخـوا گۆڕت پـڕ لــە نــوور بـێ
لـە مەحشـەرا لـەژێر عەرشا ڕەنگـت سـوور بـێ [(١٠٩)]

هەرگـیز مـن نـاتـوانـم کـە پاداشــتت بـدەمـەوە
چونکە بەهۆی تۆوە من بووم و هاتمە بوونەوە



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٧

---

[١٠٨] ئەی سەرقافڵەی ڕێگەی ژینم: ئەی مامۆستا و ڕێپیشاندەری ڕێگەی ژیانم.

[١٠٩] لە مەحشەر: (لە ڕۆژی حەشر، لە ڕۆژی دوایی)دا / لەژێر عەرشا: لەژێر عەرشی پەروەردگاردا.

# وەرن یاران سەیرکەن

وەرن یاران سەیری دەروونم کەن
کە چەند ناساغە، نەخۆشە ئەمڕۆ
وەرن یاران سەیری دڵم کەن
چەند بێ شەوق و پەرۆشە ئەمڕۆ[110]

وەرن یاران سەیری حاڵم کەن
کە چۆن پەرێشان و وێروانە ئەمڕۆ
وەرن یاران سەیری سەرم کەن
کە چۆن کاس و هەراسانە ئەمڕۆ[111]

وەرن سەیری چاوەکانم کەن
کە چۆن فرمێسکی خوێنینە ئەمڕۆ
سەیری ناخی پڕ لە داخم کەن
چەند پڕ لە ئازار و برینە ئەمڕۆ

---

[110] بێ شەوق: بێ ڕووناکی و دوور لە خۆشی و شادی.

[111] کاس و هەراسانە: (وڕ و دەبەنگ و بێزارە) وشەی (کاس) لێرەدا واتا: وڕ و دەبەنگ، وە هەروەها وشەی (هەراسان) واتا: بێزار و بێ تاقەت.

وەرن ســـەیری هــەنــاســـەم کـەن
کـە چۆن بە گـڕ و بە تینـە ئەمڕۆ
وەرن سـەیری خـەم کـەن لـەگـەڵـما
کـە چۆن هــاوڕێـی دێـرینـە ئەمڕۆ

سەیری گوڵی بەهارم کەن کە چۆن
بە دەستی خـەم هەڵوەریـوە ئەمڕۆ
سـەیری گەڵای بـاخی تەمەنم کـەن
کە چۆن زەرد بووە و ڕزیـوە ئەمڕۆ

مـنم وەکـو فـەرهـاد لـە بێـسـتـوون[(١١٢)]
سـینە پـڕ لـە ئـازار و ئێشـم ئەمڕۆ
مـنم وەکو مەجـنـوون لـە دەشـت و[(١١٣)]
کـێـو دێـوانــە و دەروێـشـــم ئەمڕۆ



کەلار

---

[١١٢] فەرهاد: فەرهادی ئەویندارى شیرین، کە لە کتێبی چیرۆکی (شـیرین و فـەرهاد) ناسـراوە بـە فـەرهادی چینی. / بێستوون: کێوی بێستوون.

[١١٣] مەجنون: (قەیس)ی ئەویندارى (لەلیل)ی عامری کە ناسراوە بە مەجنون لە کتێبی چیرۆکی (لـەیل و مەجنون)دا.

# پێنووست هاوڕێ [١١٤]

ماشـــەڵـڵا بـرام، پێنووســـت گـوڵ ئەبـارێنێ
شــیعـر و پەخـشـــانت لـــە هـەمـوو شـوێنێ

ئەدرەوشـــێـتـەوە و گـشـــت کـــەس ئەیبینێ
شــیعـرت وەکو گوڵ، بەهـاری دڵ ئەنەخشێنێ

لـە بـاخی ژینا هەزاران دڕکی خـەم ئەفەوتێنێ
لە کۆڕی ئەدەبا بە شاباش، شیرینی ئەبەخشێنێ



کەلار / ٢٠١٧

---

[١١٤] ئەم شیعرەم وەك دەستخۆشی لێکردن بۆ هاوڕێیەکم نووسیومە کە ئەو هاوڕێیەم شیعرێکی جوانی نووسیبوو.

# گلەیی بێ هاوڕێ[١١٥]

بـرام کـە بیســتـم هــاتــووی بـۆ کـەلار
دڵ گـەشـــایـەوە وەك گـوڵـــی بـەهـــار
وتـم ســا بەڵکـو ســەرپـێـی هـەڵـکـەوێ
ســەردانـم بکـا و چـاوم پـێـی بـکـەوێ
بـەڵام تـۆ وەهـــا مـنـت لـــە بـیـر چـوو
نـەتـزانـی کـــە وا هـــاوڕێیـەکـــت بـوو
بـەڵام تـۆ هــەرگـــیـز بـەوەت نــەزانـی
کـــە تـۆ لـــە دڵـمـا چـەنــدە گـرانـی
با بتوتایە ئەمە هاوڕێکەی جاری جارانە
باســەردانی کـەم خـۆ هـالـــە ئـەیـرانە
نـانێکـی چـەورمـان بـەیـەکـــۆ ئەخـوارد
لـەگـەڵ ماسـتـاوێ یــان دۆیـەکـی ســارد
بـەڵام مـن هـەرگـــیـز وەکـو تـۆ نـاکـەم
گـــەر بـێـم بـۆ ئـەوێ ســەردانـت ئەکـەم



کەلار / ٢٠١٧

---

[١١٥] ئەم شیعرەم وەك گلەییەك بۆ هاوڕییەکی خۆم نووسیومە.

# پیرۆزە هاوڕێ

کـاتێ کـە بیـستم مـن ئـەم هـەواڵـە
نـازانـی دڵـم چـەنـدە خۆش حـاڵـە

بـرام پـیـرۆزە، ڕزگار بـووی لـە (شەش)
پەنجا باشـتـرە، لـە سـەدی بە (غـەش)[116]

سـوپـاس بـۆ خـوا کـە ڕزگـارت بـوو
لـە دەست (ئینگلیزی) وا قوتـارت بـوو[117]

خۆی کرد بوو بە دۆست لـەگەڵی تـۆدا
دەك دەست خۆش بێ وا بەر شـەقت دا[118]



کەلار / تەمموزی ٢٠١٧

---

[116] شـەش: پۆلی شەشی ئامادەیی (پۆلی ١٢). ـــ غـەش: قۆپی.
[117] لە دەست ئینگلیزی وا قوتارت بوو: لە دەست وانەی ئینگلیزی کە وا رزگارت بووی لێی.
[118] وا بەر شەقت دا: داتە بەر شەق (رزگارت بوو لێی).

ئەم شیعرەم بۆ (ئاڵان حەسەن)ی هاوڕێم نووسیومە بەبۆنەی دەرچوونی لە پۆلی شەشی ئامادەیی (١٢).

# وشەی خەم

کاتێ منداڵ بووم ئەمبیست وشەی خەم
زۆر لام ئەستەم بوو، کە لێی تێبگەم

وەکو وشـەیەك ئەمـبیسـت دەمـاودەم
ئـەمـدا بـە ڕانــا ئـەمـوت داخـەکـەم[119]

ئەموت ئای خۆزگە خەم چییە و چۆنە
چۆنـە کـە ئـەڵـێن جـێگـای دەروونـە

خـۆزگـە ئـەمـزانـی، ڕەنگـی چ جـۆرە
سـپیـە، ڕەشـە، شـینـە، یـان مـۆرە

کـاتێ گەورە بـووم گـەیـمـە خـزمـەتـی
چـەشــتـم تـاڵاوی دەرد و مـەینـەتـی

ئـەوسـاکـە زانـیم نادیـارە و بـێ ڕەنگ
بـاری مەینەتـە و دڵ ئەکات بە سەنگ

---

[119] ڕان: بەشی سەرەوەی لاقە.

دواتر بووم دەرکەوت چۆنە سیفەتـی
هـەناسـەی سارد و ئـازاری سـەخـتـی

دووکەڵی سەختە ڕووی کردە هەرکوێ
ئەسـتەمە ئـاسـان، شـادی تیـا بـڕوێ

کـە لـەنـێـو دڵا ڕیـشـەی داکـوتـا
ئـەبـێـتـە دۆسـت و ئـاشـنا لـەگـەڵـتـا

سـتەمـە ئـاسـان بـەر بـدا یـەخـەت
بـار بـکا لـە لات پـەژارە و مـەیـنـەت



کەلار / ٤ / ٩ / ٢٠٢٠

# دڵی پڕ ئازارم

لە ژیانا ڕەنگی ڕەشی خەم، لە دڵما هێندە زۆرە
نەبوو ڕۆژێ کە بزانم، ڕەنگی شادی کە چ جۆرە
ژیان هەمووی سەرانسەری، مەینەتی بوو
هەر نەمزانی چۆن بە ئاسان، لە دەستم چوو
ڕۆژێ نەبوو دڵ ئاسوودە و، بڵێم ئۆخەی
خەم تۆراوە و دوورم، لە چاو و چارەکەی
شنەی شەماڵ هەڵکا تاوێ، لەنێو دڵی پڕ ئازارم
خەندە لەلای بێ بە میوان لادا تویژی لێوی بارم
ساتەکانی وەرزی ژیان، ڕازاوە بێ وەکو بەهار
دوور بێ لە خەم ، دوور بێ لەڕووی گرژی نەیار
گلۆڵەی خەم لەلێژی بێت، نەمێنێت و بڕوا باوی
تاریکی شەو بە تیشکی خۆر، کوێر بێ چاوی
بەلێزمەی تاوی باران، گرمەی هەوری بەهارانی
ڕابماڵێ لە دڵ دەرکا، سەرماوسۆڵەی خەمەکانی

❋ ❋ ❋

کەلار / ١٩ / ١٠ / ٢٠٢٠

# خەون و خەیاڵ

دیسـان جارێ تـر لـە واقیع دەرچووم
سواری ئەسپی خەون و خەیـاڵ بووم

لـەگـەڵ خەیـاڵا مـن بـووم بـە هاوڕێ
بـارگـەم پێـچـاوە بـۆ ســەفـەری ڕێ

خەیـاڵ بـردمی بـۆ دەریـایی بێ پـەی
بێ هـۆشی کـردم وەکـو مەسـتی مـەی

لـــــە ئـاوەدانی ژیـــان چـوومـەدەر
وەکو سـوارچاکـێ ڕێگـەم گـرتـەبـەر

بــارگـەی ســەفـەرم دابـوو بـە کـۆڵا
وەکو عـەودالـێك، لـە دەشـت و چـۆڵا

ڕێـگـام گـــرتـەبــەر، بـە دەم ڕێـگـاوە
بـە دەم خـەیـاڵ و خـەمـی دونـیـاوە

بینـیـم دوو شـتی زۆر نـامۆ و جـیـاواز
خـانووێ کـۆن و کـۆشکێکی زۆر شـــاز

لـەنـاو کۆشکەکە، بینـیم دانشـتـوون
دەســــــتـەی نـــاپــاك و دز و درۆزن

لــەو لاوەیـش لـەنـاو خـانـووە کۆنـا
دانـشـتوون ڕاسـتگۆ و دەستپاك و زانـا

مــاوەیـەتـر چـــووم بینـیم هــەرایـە[١٢٠]
دەنگی دەهـۆڵ و ســـاز و زوڕنــایـە

بینـیم ماستاوچی ئـاهـەنگ ئەگێڕێ
دووڕوویش لـەولاوە هەر هەڵدەپەڕێ

لەو بەریش بینیم دانا و بە ئەزموون
دانشـتوون بێ دەنگ داماو و زەبوون

ئـەم دیـمـەنـانـە کـاتـێ کــە بینـیم
لـە خەون و خەیـاڵ یەکسەر ڕاپەڕیم

خـەیـاڵـم جێهـێشـت گـەڕامـە دواوە
بینـیم ڕۆژگـار هـەر وەك خـۆی مـاوە



کەلار / ٥ / ٨ / ٢٠٢١

---

[١٢٠] بینیم هەرایە: بینیم ئاهەنگ و بەزمی خۆشی و شادیە.

سەبارت بەم شیعرە، لە سەردانێکمدا بۆ ماڵی شاعیری گەورە مامۆستا لەتیف هەڵمەت لە ١٠ / ٩ / ٢٠٢١ کە ئەم شیعرەی (خەون و خەیاڵ)ی خۆمم بۆ خوێندەوە زۆر لای پەسەند بوو، بۆیە کاتێك کە ئەم شیعرەم بۆ دەخوێندەوە چەند جارێك فەرمووی: جوانە، زۆر جوانە.

# خـۆزگـە

خـۆزگـە خـەم کـەسێ دیـاری بـوایـە
ئەمکوشـت بـا خـەڵکـی ڕزگاری بوایـە
ڕیشـەکـەنـمـە کـرد لـە گـشـت دڵـێکـا[١٢١]
بـا هـەمـوو کـەسێ بێ خـەم بـژیـایـە
****
شەرت بێ بەو ئاوەی کە لە چاومایـە
درخـتـی شـــادیـم مـن ئـاو بـدایـە
هـــەر وەك بـاخـەوان بــژارم ئەکـرد
کـاتێ کـــە شـادی چـــروەی کـردایـە
****
خـۆزگـە کـانـی ژیـن لـە هەمـوو لایـە
وەك وەرزی بـەهــار قـوڵـپـەی بـدایـە
بـە ئـاوی کـانـی و بـە فرمێـسـکـەکـان
ســـەوزایـی ژیـان تـا ســـەر بـمـایـە
****

---

[١٢١] ڕیشەکەنمە کرد: دەرم دەهێنا (دەرم دەکرد).

بــازاڕی دونــيـــا وەك (ســينەمـا)يـە[١٢٢]

هـەر بگرە و بەردە و پـڕ لـە هـەرايـە

ژيــان لـەنێـويـا ســـەرانســەر خـەمـە

هـەنـاسـەی خـەمـە لـە (ســينەمـا)يـە[١٢٣]

* * *

كەلار / ئايارى ٢٠١٧

[١٢٢] سينەما: لێرەدا واتا: ئەم دونيا وەك (سينەما) وايە هەر ڕۆژێك فليمێك نمايش دەكات.

[١٢٣] سينەما: لێرەدا مەبەست لە (سينە)يە، واتە: لە (سينەمدايە ، لە ناخمدايە).

# بوومەلەرزە [١٢٤]

پەروەردگار هەرچی ویستی لێی بێ ئەبێت
چی نووسراوە لە خێر و شەڕ ئەبێ ببێت
دڵ تەنگ مەبە بەوەی کە وا لە دەستت چوو
لەپاشی شەو، شەفەق دیسان ئەبێ هەڵبێت
****
بۆم ڕووداوە حەقە لە دڵ، خوێن بچۆڕێت
بۆ بوومەلەرزەکەی سەرپێڵ، چۆن نەسوتێت
بۆ هەڵەبجە و کرماشان و دەربەندیخان
حەقە کە دڵ وەك دەردەدار، هەر نەسرەوێت
****
پاروە گۆشتێك، کە وا دڵی پێدەوترێت
لە کوێ بەرگەی کارەساتی، وەها ئەگرێت
ئەوەی توانای وەهای هەبێت، تەنها دڵە
بێشك هەر دڵ لانەی خەمە، هەتا ئەمرێت

❋ ❋ ❋

کەلار / تشرینی دووەمی ٢٠١٧

---

[١٢٤] ئەم شیعرەم بۆ زەمینلەرزەکەی (بوومەلەرزکەی) شەوی ١٣/١٢ ی تشرینی دووەمی ٢٠١٧ نووسیوە کە لە شارەکانی (سەرپێل، کرماشان، هەڵبجە، دەربەندیخان) ڕوویدا.

# کە کۆچت کرد

ئـەی گەوهـەری بـەهـاداری گەنجـێنـەی ژینم
ئـەی بیلبیلەی چـاوی پـڕ لـــە ئـەســرینم[١٢٥]
کـە کۆچـت کرد وا نـەزانی لـە بـیـرم چووی
یادەوەریت هەر دەمێنێ لـەنیو دڵی پڕ برینم
****
هـەرچەند کـە کۆچت کردووە و ڕۆیشـتووی
وا نـەزانی کـە کۆچـت کرد لـە دڵ دەرچووی
تۆ نەتزانی چەند شـیـرین بووی لەنێـو دڵما
لـە بـاخی بـەهـاری ژیـنم گوڵـخونچـە بـووی



کەلار / ٢٠ / ١١ / ٢٠١٧

---

[١٢٥] بیلبیلەی چاو: بینایی چاو.

ئەم شیعرەم (کە کۆچت کرد) لە ٢٠ ـی تشرینی دووەمی ٢٠١٧ نووسیومە بۆ یادی چوار ساڵەی کۆچی دوایی خوا لێی خۆش بێت (بەرزان)ی کوڕم .

# دڵ بوو بە بوریان

یاران بۆ ئێوە، دڵ بوو بە بوریان

خەم و پەژارە، لام بوو بە میوان

گوڵی بەهارم، وەها ژاکاوە

نەیماوە جوانی و ڕەونەقی جاران

****

منیش کەوتمەڕێ، لەگەڵی کاروان

بێ توێشوی سەفەر، بەبێ ئاو و نان

لە بیابان و چۆڵ و هەردی ژین

بە پشتی چەماو، هەروەکو کەوان

****

لەپاشی سەفەر گەیمە لوتکەی ژین..!

لە باخی بەهار، کەوتمە گوڵچنین

لە ناکاو بەفر و ڕەهێڵە دایکرد

دایپۆشی باخ و دیوار و پەرژین



کەلار / ٣١ / ٥ / ٢٠٢٠

# بۆ کۆچی دوایی مەلا جەمیل

ئەمرۆ خەم دیسان وا بوو بە میوان
بۆ کۆچی دوای یەك لە خواناسان
مامۆستا (جەمیل)، زانای پایەدار[١٢٦]
ڕووخۆش و دڵسۆز حافزی قورئان
****
مۆمێکی زانست وا تواوەیەوە
ڕۆشنایی نەما، وا کوژایەوە
بە پاکی ژیا هەتاکو مابوو
هەر بەو پاکییەش سەری نایەوە
****
هەتاکو مابوو لە پێناوی دین
هەوڵی دا بە بێ سۆمایی بینین
نابینا بەڵام بۆ خوا سوڵحاو
خاوەن ئاکار و زمانی شیرین
****

---

١٢٦ مامۆستا جەمیل: مامۆستا مەلا ( جەمیل عەلی شاوێسی) بانگخوازێکی ئیسلامی و کەسایەتییەکی دیاری شاری هەولێر، لە ساڵی ١٩٤٦ لەدایکبووە، لە ڕۆژی هەینی ١٧ / ٧ / ٢٠٢٠ کۆچی دوایی کردووە. ئەم شیعرەم بۆ کۆچی دوایی ئەو کەسایەتیە ئاینییە نووسیوە.

هــەر لــەســـەرەتـای تـەمـەنی لاوی
لــە دەســتـی دابـوو بیـنـایـی چاوی
بـەڵام ڕازی بـوو بـە قـەدەری خــوا
بـۆیـە جێی ڕێـزە شــۆرەت و نــاوی



کەلار / ١٧ / ٧ / ٢٠٢٠

# ئای چەند بێزارم

ئای چەند بێزارم، لە ناتەبایی و لە تاڵی و گرژی

ئای چەند بێزارم، لـە شەڕوشـۆڕ و لـە براکوژی

ئای چەند بێزارم، لە تەقوتۆق و لە شین و ڕۆڕۆ

ئای چەند بێزارم، لە بۆنی باروت لە تەمومژی

****

ئـای چـەنـد خـۆشـــــــە لام، نـانـی شـــوانـی

وڵات ئــارام بـێـت، شـــــــەو تــا بـەیــانـی

کــەس بـاکـی نـەبێـت، دەرگــای مــاڵ داخــات

(چــش) بــا بـەتــاڵ بـێـت، مــرۆڤــ گــیـرفـانـی[١٢٧]

****

ئـای چەنـد خـۆشـە لام، دەس لـە نـاوی دەس

هــەمـــوو وەك بــرا، وەك ئــامــۆزا و كــەس

ئـای چـەنـد خـۆشـە لام، پشـتـی یەكبـگـرین

دوور بـین لـە كـینـە و، لــە هـەوا و هەوەس



کەلار / ٤ / ١١ / ٢٠٢٠

١٢٧ چش: قەینا (ئاسایە) ئەم وشەیە بە کار دێت بۆ ڕازی بوون.

# دوو کەس

هەتا ماوم خۆم بە قەرزاری دوو کەس ئەزانم[١٢٨]
فیدای خاکی سەر گۆری ئەوان بێ دڵ و گیانم
لەدوای ئەوان خەم بوو بە هاوڕێی یەکجاریم
لە دڵ نەما شادی و خەندەی سەرلێوی جارانم
****
هەر ئەوان بوون خەم ڕەوێنی خەمەکانم
مایەیی شکۆ و شانازی بوون بۆ ژیانم
بەڵام مەرگ مەودای نەدان لە خزمەتیان
وەك خزمەتکار هەستم بە ئەرکی سەرشانم



کەلار / ١٤ / ١٢ / ٢٠٢١

---

[١٢٨] ئەم شیعرەم بۆ دایك و باوکم نووسیومە، ئەو (دوو کەس)ـەیش مەبەستم (دایك و باوکی) خۆمە، کە لە ژیاندا نەماون و کۆچی دواییان کردووە.

# نەورۆز و بەهار

با ساتێ لادەین لە باسی مەینەت
لە نائومێدی و لە خەم و خەفەت
لەگەڵ بەهار و نەورۆزا هەرسێ[١٢٩]
بڵێین گوڵاڵە جارێ تر دەرکەوت
****
نەورۆزە ئەمڕۆ وەرزی بەهارە
بولبول خەریکی نەغمە و هاوارە
ڕەونەقی سووری گوڵاڵە سوورە
سیمای دڵداران لەم وەرزە دیارە



کەلار / ٢٢ / ٣ / ٢٠٢٢

---

[١٢٩] هەرسێ: مەبەستم (خۆم ونەورۆز و بەهار)ـە، ئەم شیعرەم بە بۆنەی هاتنی وەرزی بەهاری ساڵی (٢٠٢٢) و دەرکەوتنی سیمای جوانی گوڵاڵە سوورەوە نووسیوە

# یاران بەهارە

یـاران بـەهـارە دونیـا سـەوز پۆشە
گوڵان ڕەونەقـدار بولــبول دڵخۆشە
دڵۆپەی شەونم لەسەر پەڕەی گوڵ
دڵ بەو دیمەنە مەست و بێ هۆشە
****
شنەی شەماڵ و هـاژەی ئـاوی چەم
مـلـەی سەر یـاڵان داپۆشراو بە تەم
ئــاوازی مـەل و قاسپە قاسپی کـەو
لا ئەبا لـە دڵ ئێش و دەرد و خەم



کەلار / ٣ / ٨ / ٢٠٢٢

# تەمەنی لاویم

وەك خەوە ئەبینم تەمەنی، لاویم وا بەسەرچوو
دوێنێ منداڵ بووم و ئەمڕۆ، مووی سەرم سپی بوو

دواتر ئەمێنێمەوە لەژێر، خاك و خۆڵی گۆڕەکەم
ئەی پەروردگار لێم ببوورە، چارەسەرکە شکستەم[١٣٠]

فرسەتە یاران بگەڕێنەوە، لە هەموو هەڵە و تاوانێ
تەمەن ئەڕوات بە خێرایی، وەکو ئاسك تێدەپەڕێ

مردن نزیکە لێمان و، نەزان کەسێکە کە نازانێ
حەیفە بۆ کەسێ گەوهەری لاوی لە قوماری ژینا دانێ[١٣١]



کەلار / ١١ / ٣ / ٢٠٢٠

---

١٣٠ شکستەم: (شکستە) ئەو ئیسکەیە کە شکاوە، بۆیە زۆر جار لە نزا و پاڕانەوەکاندا لە زمانی عەرەبیدا ئەم نزا و پاڕانەوەیە دەبیستین (اللهم اجبر کسرنا..) واتا خوایە شکاو و شکستەکانمان یەکبگرێتەوە و چاکبێتەوە (ساڕێژ بێت).

١٣١ گەوهەر: گەنجینەی بەنرخ و بەهادار، واتا حەیفە مرۆڤ هێز و توانا و کاتەکانی تەمەنی لاوی لە یاری و بێ ئاگاییدا بە فیڕۆ بدات (بە بێ سوود).

# لەگەڵ خەما

چـيـرۆكـی مـن لـەگــەڵ خــەمـا
لـە گشت كـات و گشـت سـەردەمـا

خـەم لە كۆی بێت، من لە ئـەوێم
هـەر ئـەوێيـە مەسـكەن و جـێم

من لـەگـەڵ خـەم، هـام لـە ئـەوێ
وەك كتێبی، هـەزار شەو و شەوێ[١٣٢]

خـەم ئوسـتـاد بێت من شـاگرديم
گەر خەم شێخ بێت من موريديم



كەلار / نيسانی ٢٠٢٠

---

١٣٢ هەزار شەوو شەوێ: (الف ليلە و ليلە) ناوی كتێبێكی عەرەبييە كە پێكهاتووە لە كۆمەڵە چيرۆكێك.

# ساڵێکی تر لە تەمەن

وا پلەیەکی ترم جێهێشت لە قادرمەی ژیانم
وا باخی تەمەنم گوڵێکی تری هەڵوەرانم[١٣٣]

وا ساڵێکی تر لە ساڵەکانی تەمەنم بڕی
وا تەمەنی پەنجاوسێ ساڵیشم تێپەڕی

چی تر تەمەن تامی نەما بەرهەم و بەری
بە خۆم نەزانی لە ناکاو، گەیمە ئەو سەری



کەلار / تەمموزی ٢٠١٧

[١٣٣] واتا: وا ساڵێکی تر لە تەمەنم تەواو و تێپەڕی.
ئەم شیعرەم بۆ یادی پەنجاوسێ ساڵەی تەمەنم نووسیوە کە دوای ١ / ٧ / ٢٠١٧ سەرەتایی تەمەنی پەنجاوچوار ساڵیم دەست پێدەکات.

# ئەی جەستە سووتاو

محەمەد ڕۆڵە ئەی جەستە سووتاو(١٣٤)
ئەی ڕۆڵەی کوردی ستەم لێکراو

قیژە و هاوارت لە تاوی ئازار
تێکدەدا تەخت و بەختی ستەمکار



کەلار / تشرینی یەکەمی ٢٠١٩

١٣٤ محەمەد: یەکێکە بوو لەو منداڵە بریندارانەی کە بەهۆی هێرشەکانی تورکیاوە بۆ سەر رۆژئاوای کوردستان بە چەکی فسفۆڕی سپی قەدەغەکراو لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠١٩ بە سەختی بریندار بوو.

# شیوەنێك بۆ وڵاتەكەم

خۆیشم نازانم شیوەن بۆ کام
لـــەم نەهـــامەتیانـە بـکـەم
شیوەن بۆ هەزاران (ئایلان)ی
خـنـکـــاوی دەریـــای ســـــتـەم[١٣٥]

یـان بـۆ وڵاتـێـکی پـڕ شــەڕ و
کـــاول و وێـــران و مـــاتـەم
یـان بـۆ سـامـانـە دزراوەکـەی
ژێــر خـــاکـــی وڵاتـــەکـەم

یـــان بـۆ خـــەمـی دەروونـی
دایـکـانی جگـەر سـووتـاوەکـەم
یـان بـۆ گـەنجـانی بێ ئـیـش و
ســـــەر لـــێ شـــێواوەکـەم

---

١٣٥ ئایلان: ئایلان کوردی منالێکی کوردی سووری تەمەن سێ سالان بوو لە ٢ ی ئەیلولی ٢٠١٥ خنکا بەهۆی نقوومبوونی بەلەمێکی پەنابەران کە دەیویست بپەڕێتەوە بۆ یونان.

یان بۆ هەزاران شەهیدی
ئەنفالی گەرمیانەکەم
یان بۆ کیمیابارانی هەڵەبجەی
بووکی کوردستانەکەم

ڕەوایە کە فرمێسکی
خوێنین بتکێ لە چاوەکەم
بۆم هەموو نەهامەتیە
ڕەوایە هەر شۆڕوشین کەم[١٣٦]

گەر بەم دێڕە شیعرانە باسی
خەمم نەکەم چی بکەم
( کەریم ) بەسیە شیوەن
دڵی هەمووان پڕ بوو لە خەم[١٣٧]



کەلار / تشرینی یەکەمی ٢٠١٥

---

١٣٦ شۆڕوشین: (گریان و ناڵەوشین) بۆ ئەو خەم و ئازار و نەهامەتیانەی کە لە شیعرەکەدا باسکراوە.
١٣٧ کەریم: ناوی بەندەیە (کەریم ئاغاوەیسی).

# ئاڵای کوردستان

هـــــەر شـــەکـاوە بێـت بـشـــەکـێـتـەوە
خـــۆرە جوانـەکــــەی بـدرەوشـێـتـەوە

ئـاڵای ڕەنگـاوڕەنگ وەك وەرزی بـەهـار
هەر رەنگێك مانای خۆی ئەکات ئیزهـار

سـەوزیت: سـەوزایی دەشت و شـاخەکان
سـووریت: سـوورایی خـوێنی شــەهـیدان

زەردی هـەتـاوت: مـانـای دەغـڵ و دان
سـپـیت: ئـاشـتـیـە بـۆ هـەمـوو جـیـهـان

ئـەم ئـاڵا جـوانـە کـە وەهـا نەخـشـاوە
بەخـوێنی (قازی) نـەخـشـەی کـێشـراوە [١٣٨]

هــەر شــەکاوە بێـت ئـەم ئـاڵا جـوانـە
ڕەمـزی سـەربەسـتی هـەمـوو کـوردانـە

***

کەلار / تشرینی یەکەمی ٢٠١٥

---

[١٣٨] قازی: پێشەوا قازی محمد لە ( ١ ی ئایاری ١٨٩٣ ـ ٣٠ ی ١٩٤٧)ز.

# خــاکی کوردســتان

ئـەی کوردسـتان نیشـتمـانم، ئـەی خۆشـتـرین خـاك و وڵات
شـانـازیـە خــوێـن ببخشـین، لــە پێـنـاوتـا وەکـو فــورات[١٣٩]

خـاکی کـوردە سـاڵانێکـە، زەبــوون و لــەت و پــەت کـراوە
دڵی پــڕ دەردی گـەلی کـوردە، (بـۆپـڕووز)ی لـێ هـەڵـسـاوە[١٤٠]

بـۆ زەبوونی ئـەم خاکـە، خاکی ئـەم خاکە ئەکـەم بەسـەرما
شانازیە تۆزی ئەم خاکە، لەسەر ئەم بەرگەی کە ها لەبەرما

ئـەسـف و سـەد مەخـابـن، بـۆ زەبـوونـی ئـەم خـاکـە
کـە سـەدان سـاڵـە زەبـوون و، گـیـرۆدەی دەسـتـی نـاپـاکـە

لـەنـێـو وڵاتـانـی دونـیـا، خـاکـێـکـی بـێ وێـنـە و تـاکـە
نـیـشـتـمـانـێـکـی ویـران و، سـتـەمـکـاریـش وەك زووحـاکـە[١٤١]

---

١٣٩ فورات: دەریای فورات، دەریایەکە سەرچاوەکەی لە وڵاتی تورکیایە و بە وڵاتانی سووریا و عێرقدا تێدەپەڕێت.

١٤٠ بۆپڕووز: بۆسۆ (بۆنی سووتاوی) شتێکی زۆر سووتاو.

١٤١ زووحـاك: ئـەو دەسـتـڵاتدارە سـتمکارە بـوو کـە کـاوەی ئاسـنگەر کۆتـایی بەدەسـتـڵاتەکەی هێنـاوە. لەئەنجامدا خەڵك ئەو ڕۆژەیان کرد بەڕۆژی خۆشی و شادی و ناونرا نەورۆز واتا ڕۆژێکی نوێ.

ئەم خاکە جوانە کە پێی ئەوترا خاکی کوردستان
هەر بە ناڕەوا بۆ کوردی دامـاو بوو بە گۆڕستان

هەر لاوی کورد بوو بێ هیچ تاوانێك یەك یەك ئەکوژرا
هەر ڕۆڵەی کورد بوو، پەتی قەنارە لە ملی ئەنرا

هەر دایکی کورد بوو، بۆ کۆچی ڕۆڵەی جەرگی ئەبرژا
خاکی کورد بووە بێستوون، خوێنی هەزاران فەرهادی لێڕژا[١٤٢]

هەر ماڵی کورد بوو ئەبرا بەتاڵان، ئەخورا بەناحەق
هەر نەوەی کورد بوو بەبێ لێپرسین، ئەدرایە بەرشەق

ئەم ستەمانە بەچی مافێك و، بەچی دادگایەك
ئەم کردارانە کەی ڕێی پێدراوە، لە هیچ یاسایەك

هەرچەند گەلی کورد گەلێ، دڵپاك و ئازا و دلێر بوو
بە پەیماننامەی دوژمنەکانی خاکەکەی تیاچوو

---

[١٤٢] ـ بێستوون: ( کێوی بێستوون) یەکێکە شوینەوارە دێرینەکان دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە پارێزگای کرماشان.

ـ فەرهاد: فەرهادی کۆکەن ئەویندارى شیرینی ئەرمەن بووە، (چیروکی شیرین و فەرهاد).

بە داگیرکاری و، بە پەیماننامە شوومەکەی لۆزان[١٤٣]
لەت و پەت کرا، پارچەپارچە بوو خاکی نیشتمان

بە فرت و فێڵ و، بەنەخشەی پیسی دەستی بێگانە
پارچەپارچە بوو، کرا بە چوار بەش ئەم کوردستانە

ئەم خاکە جوانە لەسەرەتادا ، کە یەك پارچە بوو
بەڵام ستەمکار کردی بە چوار بەش، وەك ماڵی مردوو

ئەم بەشەیش ئێستا، من بە ئازادی تێیدا نیشتەجێم
درابوو بە عێراق، ئێستا ئازادە و بووە بە هەرێم[١٤٤]

ئەو سێ بەشەکەیش هەربەو پیلانە، یەك یەك بەشکران
کرانە بەشێك، لە تورکیا و سووریا و وڵاتی ئێران

خۆچاك ئەزانین، هەر گورگەکانی ساڵانی پێشوون
ئێستا لێدەدەن، لافی ئازادی و لافی یەکسانبوون[١٤٥]

---

[١٤٣] لۆزان: ئەو پەیماننامەیە بوو لە ٢٤ ی تەمموزی ١٩٢٣ لەناوچەی لۆزان لەسویسرا واژۆکرا کە سەرەتایەك بوو بۆ دابەشبوونی کوردستان بەسەر وڵاتی (تورکیا و سووریا و ئێران و عێراق)دا.

[١٤٤] هەرێم: هەرێمی کوردستانی عێراق.

[١٤٥] لاف: قسە و باسی بریقەدار و بێ بنەما و بێ کردەوە (منەت کردن بەسەر کەسانی تردا).

هەر ئەوانە بوون، کە مافی گەلی کوردیان فەوتان
ئێستا هاتوون، لێدەدەن لافی حقوقی ئینسان[١٤٦]

خوایە گیان هاوار، تۆ ڕەحمێ بکەی بەم گەلی کوردە
ڕزگاری بکەی لە ستەمکار و، لەم هەموو دەردە

دەردی بێکەسی ، دەردی هەژاری، دەردی یەکنەبوون
دەردی یەککوشتن ، دەردی نەزانین، دەردی دابەشبوون

دەی با هەموومان، دەست کەینە مل یەك هەروەکو برا
لەسەر ئەم خاکە، پشتی یەکبگرین بێ شەڕ و هەرا

خەمخۆری یەکبین، هەموو وەك برا پێکەوە بژین
هەموو ڕاپەڕین، کاتی تەنگانە پشتی یەکبگرین

بۆیە پێویستە، لەسەر هەموومان هەوڵ و تێکۆشان
بۆ ڕزگاربوونی، خوێنمان بڕێژین ببخشین گیان

---

[١٤٦] حقوقی ئینسان: (منظمة حقوق الأنسان) کۆمەلگەی مافی مرۆڤ، دەزگایەکی نێودەوڵەتی حکومی سەرەکییە سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکانە بەرپرسیارە لە مافی مرۆڤ، پێکهاتووە لە (٤٧) وڵاتی ئەندام کە لە هەموو ساڵێکدا بەلای کەم لە سێ خولدا کۆدەبنەوە لە جنیف لە سویسرا، لەساڵی ١٩٤٨ز جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ چووە بواری یاسای نێودەوڵەتی.

**بۆ سەربەخۆیی، خاکی نیشتمان هەموو بێ وچان**
**دڵ و سینەمان بە شەو و بە ڕۆژ، بکەین بە قەڵغان[١٤٧]**

**بپاڕێینەوە بۆ ڕزگاربوونمان لە دەرد و ستەم**
**هاوارکەین خوایە، پەنامان بدەی بەدڵ نەك بە دەم**

**هەموو بەیەك دەنگ، هاوارکەین خوایە پەنامان هەر تۆی**
**هەر تۆی شیفابەخش، هەر تۆی دەرمانی زامانی بە سۆی[١٤٨]**



**کەلار / کانوونی یەکەم ٢٠١٥**

---

١٤٧ قەڵغان: کەرەستەیەکی سەربازیە کاتی خۆی جەنگاوەرەکان لەجەنگدا بەکاریان هێناوە بۆ خۆپاراستن لە ڕم و تیر و شمشێر، وە هەموو هۆکارێکی پاراستن بە قەڵغان پێناسە دەکرێت.

١٤٨ زامی بەسۆ: برینێك (زامێك)ی بەئازار کە توێژی نەگرتبێت و چاك نەبووبێتەوە.

تێبینی: ئەم شیعرەم باسی ئەو نەهامەتی و کاولکاری و دابەشبوون وستەمکاریە دەکات کە بەدرێژایی مێژوو لەگەڵی کوردی ستەمدیدە کراوە، کە هەمیشە داگیرکەران لەبەر بەرژەوەنی خۆیان مافی ڕەوای گەلی کوردیان پێشیل کردووە و بەپەیماننامە شووم و نەگریسەکانیان خاکی کوردستانیان دابەشکرد بەسەر وڵاتانی ( ئێران و عێراق و تورکیاو سووریا)دا.

# دڵـێك نەسـوتێت

دڵێك: نەسـووتێت بۆ زەبوونی گەل، قەت دانەچڵەکـێت
ئـەوە کـەی دڵـە، یاخـوا ئـەو دڵـە لـە لـێدان بکەوێت

چاوێك: بەبێ خـەم شـەو تـا بەیانی بۆ خـۆی بخـەوێت
لـێلآیی دابێت یاخـوا ئـەو چاوە، کـوێر بـێ و نەبینێت[١٤٩]

گوێیەك: گوێبیسـتی بەزم و شـادی بێ، ناڵـە نەبیسـێت
ئەوە کەی گوێیە، یاخوا گوێی ئاوا نەبیستێ و کەڕبێت

سـەرێك: کـوڕنۆشـی لـە خـوا زیـاتـر، ئەگەر پێ ببـرێت
یاخـوا سـەری وا ئـاسـوودە نـەبـێ، زوو لـەنـاو بچێت

یاخـوا ساغ نەبێ پێیەك: لە بەزما هـەردەم هەڵپەڕێت
شـەل بێ ئەو پێیە، ئەگـەر بۆ چاکـە ملی ڕێ نەگـرێت

سینەیەك: بۆ گەل پڕ لە خەم نەبێ ئاخ هەڵنەکێشـێت
بشکـێت ئەو سـینە، دەستی کۆیلـەیی بەخـۆیوە بگـرێت[١٥٠]

---

١٤٩ لێـلآیی دابێت: پەردەی ڕەشایی بێت بەسەر چاویدا، کوێر بـێ. هـەر شـتێك بـەڕوونی نـەبینرێت یـان تەڵخ بێت پێی دەڵێن (لێڵ).

**گۆج بێ ئەو دەستە هەرچۆپی بادا، فرمێسك نەسڕێت[(١٥١)]**
**لاڵ بێ زمانێك: دوژمنی گەلی پێ ڕسوا نەکرێت**

**زمانێ ئەگەر لەئاستی ناڕاست، وەك لاڵ بێ دەنگ بێت**
**زمانی وەها چی سوودی هەیە، هەبێت یان نەبێت**



**کەلار / ئازاری ٢٠١٦**

---

[١٥٠] بشکێت ئەو سینە کە هەمیشە دەستی خۆبەکەمزانین و کۆیلایەتی لەسەر بێت بۆ کەسانی خائین و ستەمکار.

[١٥١] گۆج بێ: ئیفلیج بێ (شەلەل لێ دراو بێ).

# وڵاتێکی سەربەخۆ

گەر سەیر بکەین، لە جیهاندا وڵاتی وا هەیە
بە خاك و گەل، هێندەی شارێکی ئێمەیە

کە چی ئەبینین خاوەنی، ئاڵا و دەوڵەتی خۆیە
خۆی خاوەنی سەروەری، گەل و خاکەکەیە

بەڵام میللەتی کوردی داماو، سەدان ساڵە ئەناڵێنێ
بۆ ئەوەی سەربەخۆیی و، سەروەری بە دەس بێنێ

کە چی هێشتا بەردەوام، هەر قوڕی ڕابردوو ئەشێلێ
خەرمانی خەم شەن ئەکات و، خاکی خەم ئەکێلێ

کوردە بەسیە ئیتر، هەتاکەی یەکتری کوشتن
هەتاکەی دوو بەرەکی و، خوێنی یەکتری ڕشتن

لە دەریای نەفامی بێنەدەر، پشتی یەکبگرن
وەك برا بن هەمووتان، فرمێسکی یەکتری بسڕن

بێ جیاوازی لە ڕەنگەکان، هەموو یەکبین
سەوزە ، زەردە ، سپییە ، سوورە ، قاوەیی ، شین[١٥٢]

---

[١٥٢] هیماو ڕەنگی ئاڵای پارت و لایەنە سیاسیەکانی کوردستان.

گەر بمانەوێت ئێمەیش، وەك میللەتانی دونیا بژین
ئەبێت کورد بین وازبهێنین، لە تیرە تیرە و لاین لاین

حەیفە بۆ ئێمە کە نەوەی، سەلاحەدینی ئەیوبین
کەچی ئێمە بە دەستی خۆمان، یەکتری ئەکوژین

گەر پرسیار کرا لە هەر، نەوەی کوردێك ئێوە چین
بە شانازییەوە بڵێ کوردم و، منم نەوەی سەلاحەدین[١٥٣]

خۆفرۆشان بۆ پارە دڵی ئەم نیشتمانەی پارەپارە کرد[١٥٤]
خاك و خۆڵی نیشتمانی، وەکو دیاری بۆ دوژمن برد

بە خوێن سوورە خاکم، دەشت و چۆڵ وکێوو هەردم[١٥٥]
بەڵام سوورە لە تێکۆشان، لاوی ئازای گەلی کوردم[١٥٦]

سوورایی دەستی دوژمن، خەڵك بەخەنە تێدەگات[١٥٧]
نازانن خوێنی گەلە، دوژمن خەنەبەندانی پێدەکات

---

[١٥٣] سەلاحەدینی ئەیوبی ( ١١٣٨ تکریت ـ ١١٩٣ دیمەشق ) سەرکردەیەکی موسڵمانی کورد بووە.
[١٥٤] پارە: دراو ــ پارە پارە: پارچە پارچە (لەت لەت).
[١٥٥] بەخۆێن سوورە خاکم: وەشەی (سوور) لێرەدا مەبەست ڕەنگی سووری خوێنە.
[١٥٦] سوورە لەتێکۆشان: وەشەی (سوور) لێرەدا مەبەست (بەردەوامە) واتا بەردەوامە لەتێکۆشان.
[١٥٧] سوورایی دەستی دوژمن: ڕەنگی بە خوێن سوور بووی دەستی دوژمن.

خــۆزگـــــە ئــــەو ڕۆژەم، ئەبـیـنـی خــــوایــە
کە دوژمنـی گـەل، لـەنێو وڵاتـا سـووك و ڕسـوایـە

ئـارامـی و شـادی بـڵاو بــووایـە لــە هـەمـوو وڵات
هەواڵـی شـادی و مژدەی سەربەخۆ ئەکـرا بە خـەڵات

ئـەو ڕۆژە دڵـم ئەحەسـێتەوە، بـێ پــەژارە و خــەم
گـەل ســــەربـەخــۆ بێـت، دوور بێـت لــە ســتـەم

❋ ❋ ❋

کەلار / ئەیلولی ٢٠١٦

# هەڵەبجە

شانزەی سێ ڕۆژێکە، کە ناچێت لە بیرمان[١٥٨]
ناسراوە بە ڕۆژی، مەرگەساتی کیمیاباران

هەر لە ڕۆژێکی وەك ئەو ڕۆژە دا بوو
پێنج هەزار نەوەی گەلی کورد تیاچوو

ئەی هەڵەبجە ئەی بووکی تارا سووتاو
ئەی بووکی لە پەردەی بووکێندا کوژراو

ئەی بولبولی لە وەرزی بەهارا تۆراو
ئەی بەهاری بێ گوڵی، بە پایز گۆڕاو

ئەی پەپولەی جوانی باڵ هەڵپڕوزاو
ئەی کۆرپەی لە باوەشی دایکدا خنکاو

هەڵەبجە ئەی شەهیدی دەستی ستەم
ئەی ئەو شارەی کە کۆڵانت پڕ بوو لە تەرم

بە بۆنی گازی کوشندە لە کۆڵانا لە ناو شارا
لە ماڵا لە بازاڕا لەژێر سێبەری درەخت و دارا

---

[١٥٨] شانزەی سێ: ١٦ی مانگی سێ (مارس/ئازار)ی ساڵی ١٩٨٨ز ڕۆژی کیمیابارانی شاری هەڵەبجە.
شایەنی باسە ئەم شیعرەم کاك تالب دەرباز بە دەنگی خۆی تۆماری کردووە.

هــــــەزاران لاشــەی هــــــەروەکـو خـەوتـوو
هــــەزاران پـەپـولــــەی بـێ گـیـان کــەوتـوو

دەم نـاتـوانـێ بکات، بـاســی ئـەو کـارەسـاتـە
هـەڵـەبـجـە، بـەسـەرهـاتی تـۆ مـەرگـەسـاتـە

هـەڵـەبـجـە ئـەی سـومـبـولــی بــەرخ و دان
هـەڵـەبـجـە ئـەی (هـێروشـیما)ی کـوردسـتان[١٥٩]

تـۆ ســـەرت بــەرزە، وەکـو لـوتکـەی چـیـاکـان
دوژمنانت بەسەرشۆڕی لـە زبڵدانی مێژوودان

بـەخـوێنـی تـۆ داری ئـازادی وا ڕەنگـی گـەشە
بۆ ناوچاوانی دوژمن لە مێژوودا پەڵەی ڕەشە

هـەڵـەبـجـە ئەوانەی کـە ستەمیان لە تۆ کـرد
مـژدە بێت کـە خـوا، هـەمـوویـانـی لـەنـاو بـرد

تـۆ هــەوێـنـی سـەربـەخـۆیـی ئـەم نـەتـەوەی
تـۆ شـایـەنـی هـەزاران شـیـعـر و هـۆنـراوەی



کەلار / شوباتی ٢٠١٧

---

[١٥٩] هێروشـیما: نـاوی شـارێکی وڵاتـی ژاپۆنـە کـە لـە ڕۆژی ٦ / ٨ / ١٩٤٥ز ئـەمریکا بـۆمبێکی ئـەتۆمی لـە هەردوو شاری هێروشیما و ناکازاکی دا، بووە هۆی کوشتنی ٢٤٠ هەزار کەس.

# ئاواتەکانم

خۆزگە ئاواتم من ئەهاتەدی
ببینم (سکە)ی دەوڵەتی کوردی[١٦٠]

وەك زۆربەی دراو لە بازاڕی شار
ڕەواجی بوایە وەك (یۆرۆ) و (دۆلار)[١٦١]

ئاواتێکی تر، لەو ئاواتانەم
کە سالأنێکە، بووەتە پەژارەم

ببینم ئالأی جوانی کوردستان
لەنێوان ئالأی، هەموو ولأتان

نوێنەری کوردیش وەك هەموو گەلان
بەشدار بوایە، لە کۆنگرەی جیهان

نوێنەری کوردان لە کۆنگرەی(یو، ئێن)[١٦٢]
بەیاننامەکەی بە کوردی ئەخوێن

---

١٦٠ (سکە): دراو، پارە.

١٦١ یۆرۆ و دۆلار: دوو جۆر (دراوی) دیاری و بەنرخن لە بازاڕەکانی جیهان دا.

١٦٢ (یو، ئێن): UN کورت کراوەی (United Nations) واتا (نەتەوە یەکگرتوەکان) کە کۆمەلەیەکی جیهانیە لە ٢٤ی ئوکتۆبەری ١٩٤٥ لە شاری (سان فرانسیسکۆ)ی کالیفۆرۆنیا لە ئەمریکا دامەزراوە، زۆربەی ئەو ولأتانەی کە سەربەخۆن ئەندامن لەم کۆمەلگەیەدا.

دەردی ئـەم (گـەلـە)م، دەردێ گـرانـە

هـەمـووی هـۆکـاری یەکنەبـوونـمانـە

ئــاواتێـکـی تــر لـــــەو ئــاواتـــانـە

کـــە وا ئـــاواتـی هـــەر هـەمـوومـانـە

هەرچی خاکێکمان کە لەدەست چووە

کە چـەنـدین سـاڵە ژێردەسـتە بووە

بگـــەڕێـتـەوە، وەك جـــاری جـاران

لـــە بـۆ بـاوەشـــی دایـکـی نـیـشــتـمـان

ئـەم خاکە کە وا، کە چەنـدیـن سـاڵە

بـاســـی ئـــازادی، تـێـیـدا مـەحـاڵـە

بـبـێـتـە خـــــاوەن، حوکـمـەتێـکـی وا

بـێـتـەدی خـەونـی (قـازی) پـێـشـــەوا[١٦٣]



کەلار / نیسانی ٢٠١٧

[١٦٣] قازی پێشەوا: پێشەوا قازی محەمەد ( ١ ی ئایاری ١٨٩٣ز - ٣٠ ی ئازاری ١٩٤٧ز ) دامەزرێنـەر و سـەرۆکی کۆماری کوردستان بووە لە ساڵی (١٩٤٦ز). دوای رووخانی کۆمار لە ساڵی (١٩٤٧ز) لەگەڵ هاوڕێکانی لە لایەن حکوومەتی کاتی تاران لە مەیدانی چوارچرای شاری مەهاباد لە سێدارە درا.

# پێشکەشی تۆ بێ خۆفرۆش

بە ئازادی و سەربەستی بژیم
ئەو کاتە پێم بڵێ خۆشحاڵ
پێشکەشی تۆ بێ خۆفرۆش
تەلار و دۆلار و قاتی شاڵ

بە ئازادی بژیم گۆشت و پلاوە
بۆ من نانی وشکی حەلاڵ
پێشکەشی تۆ بێ بە حەرامی
کەباب و شەرابی ترش و تاڵ

پێشکەشی تۆ بێ گەشتی
لەندن و پاریس و لوبنان
بەسە بۆ من دیمەنی گەرمیان و
شارەزوور و هەورامان

شانازی و سەربەرزیە بۆ من
خۆشەویستیم بۆ خاکی نیشتمان
پێشکەشی تۆ بێ خۆفرۆشی و
سیخوڕی کردن بۆ وڵاتان

بـۆنی ئـەم خاکـەم کـە بە نـمـەی
بـــاران تـــەڕ ببـێ بـۆ مــن بـێ
هــەرچی بــۆنـی گـران بـەهایـی
جیـهــانـە پێشـکـەشــی تــۆ بـێ

(دۆ)ی دێهاتی کوردستانم هەبـێ
لـەگـــەڵ (بـەڕو)ی شــاخـەکانی
دەرمانە بۆ دڵ گڕەی گەرمیـان و
شـــنـەی شــەمـاڵی کـوێـسـتـانـی

ئـەی نیشـــتمان (کەریم) هـەتـــا
مـاوە خزمەتکاری ئـاو و خـاکتـە
بـە گـیـان و زمـان و قـەڵـــەمـی
دوژمـنـی خـۆفـرۆشـی نـاپـاکـتـە



کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٧

# ئەی نیشتمان

ئـەی نیشـتمـان لـەدووری تـۆ
تیری خەم پەردەی دڵمی دڕی
تەیری شـــادیم لـەدووری تـۆ
دای لە شەقەی باڵ و هەڵفڕی

ئـەی نیشـتمـان لـــەدووری تـۆ
ڕۆژانی شـادی تەمەنـم فـەوتـا
ئـەی نیشـتمان بە گڕی ئاگری
دووریت خەرمانی ژینم سووتـا

ئـەی نیشـتمـان پێشکەشت بێ
ئـەو گیـانەی کـە لـەبەرمـایـە
باسی سەربەخۆییت هەمیشـە
خولیایەکە و هەر لەسەرمایـە[١٦٤]

[١٦٤] خولیایەکە و هەر لەسەرمایە: سەربەستی و سەربەخۆیی خاکی نیشتمان (خـاکی کوردسـتان) خولیـا و ئاواتێکی فەرامۆش نەکراوە و هەمیشە تا لە ژیاندا ماوم لە بیر و هزمدایە.

شـەرتە هـەتـا مـاوم لـەپێناوی
ســـەربەخـۆییت کـۆڵ نـەدەم
دەشـت و دەرت ئاوڕشـێن کـەم
بـە فـرمـێـسکی چـــاوەکـەم

هەموو خەم و ناڵـە و شیوەنم
بۆ تۆیـە ئەی خاکی نیشـتمان
سـەرچـاوەی خـەمـەکـانـمی و
چاوم بۆ تۆیـە، پڕە لـە گریان

ئـەی نیشـتمـان دڵ و گـیـانـم
پێشکەشـت بێ پەشـیمـان نیم
دڵ و گـیـانـی فـیـدای خـاکـی
تۆ بێ هـەزارانی وەك (کەریم)[١٦٥]



کەلار / ئابی ٢٠١٧

---

[١٦٥] کەریم: ناوی بەندەیە کەریم محەمەد ئەحمەد (کەریم ئاغاوەیسی).

# ئێستاش بۆ وەتەن

دوژمن تێبگە من چیت پێ ئەڵێم
گوێم جوان لێ بگرە، تێبگەییە لێم

مەروانە سەرم وا سپی بووە
یان دەم و چاوم چرچ و لۆچ بووە

هیچ دڵخۆش مەبە، بڵێی پیر بووە
تەقە و تفەنگم من لە بیرچووە

ئێستاش بۆ وەتەن چواردە ساڵانم[١٦٦]
هەر پێشمەرگەکەی جاری جارانم

هەر کاتێ وەتەن پێویستی پێم بێ
من بەسەر سەردێم نەوەکو بەپێ

هەتا دڵۆپێ خوێن بێ لە لەشما
بەرگم بۆ وەتەن، کفنە لەبەرما

---

١٦٦ چواردە ساڵانم: مەبەست ئەوەیە هەرچەند کە پیربم، بەڵام بۆ خەبات و تێکۆشان لە پێناوی خاك و ئاوی نیشتماندا، لاوم و تەمەنم چواردە ساڵە.

هەتا هەناسە لە سینەمابێ
یاخود تریەیەك لە دڵما مابێ

من ئەیپارێزم، هەتاکو ماوم
هەر وەك بیلبیلەی بینایی چاوم

دوژمن سا بمرە خەیاڵت خاوە
کورد وەك ساڵانی پێشوو نەماوە

تۆ هەرچی بڵێی ئێمە ملکەچ بین
نەتوانین بڵێین کە ئێمە کوردین

باسی کورد ئێستا لە هەموو جیهان
سەردێڕە لەنێو تۆڕی میدیاکان

میللەتێك وا بێ چۆن ئەتاوێتۆ
کێشەی ئەم گەلە چۆن ئەشارێتۆ

دوژمن هۆشت بێ تاکەی بێ هۆشی
تاکەی لە مافی گەل فەرامۆشی

❋ ❋ ❋

کەلار / ئەیلولی ٢٠١٧

# کەرکوکی ڕەشــپۆش

کەرکوکی ڕەشـــپۆش دەروون خوێناوی
تۆیش وەك (خورماتوو) دیل و داماوی[١٦٧]

کەرکوك ئەی خاکی جوانی ڕەشپۆشم
بـــۆ زەبـوونـی تــۆ زوخــــاو ئەنۆشم

بۆ بێ نـازی تـۆ هـــەزار دەرد و ئێش
لــە دڵ جێگـیـر بوو قەد نابێ سارێش

خەمی کەرکوك و داخی خورماتوو
داخی ئەو هەموو خاکە لەدەست چوو

خەمی شەهیدی لاوی خوێن گەرمم
داخی خورماتووی کۆڵان پڕ تەرمم

خەڵکەکەی خەمبار بێ خانە و لانە
لە کوچەی شاران گشت سەرگەردانە

پاکی بە جێیهێشت ئەوەی کە هەی بوو
سامان و ماڵی هەمووی لە کیس چوو

---

[١٦٧] خورماتوو: شارۆچکەی (دووزخورماتوو) کە لە ئێستادا سەر بە پارێزگای سەلاحەدینە.
ئەم شیعرەم بۆ کارەساتی ١٦ی ئۆکتۆری ٢٠١٧ نووسراوە کە ڕۆژێکی پڕ لە نەهامەتی بوو بۆ گەلی کورد، لەم ڕۆژەدا شاری کەرکوك و چەندین شوێنی تر کەوتنە ژێر دەسەڵاتی میلیشیات و سوپای حکومەتی عێراقی، وە زۆربەی دانشتوانی کوردی ئاوارەی شارەکانی هەریمی کوردستان بوون.

خەڵکێکی ئازا و مەرد و خانەدان
ئێستا ئاوارە و بێ ماڵ و بێ نان
ئاخ و هەزار داخ ئەی نیشتمانم
ئاخ و هەزار ئۆف ئەی کوردستانم
کێیە لەو ڕۆژە فرمێسکی چاوی
نەتکا بێت لە بۆ گەلی داماوی
خۆزگە سەد خۆزگە زوو بمردمایە
زەبوونی کوردم وەها نەدیایە
زەبوونیەکەی گەل هەتا هەتایە
ئێش و ئازاری هەر لە دڵمایە
(کەریم) شیوەنکە بۆم کارەساتە
هەر گەلی کوردە دوور لە ئاواتە
گەر شیوەن نەکەم بۆ ئەوەی بینیم
دەی سا پێم بڵێن بۆ چی تر بگریم؟



کەلار / ١٨ / ١٠ / ٢٠١٧

# چیم کردوە ؟

پەشیمان نیم لە ئەو کارەی کە کردم
چیم کردوە لەوە زیاتر وتم کوردم

چ تاوانێکم ئەنجامدا و چیم بردوە
دەی سا بڵێ خاکی کێم داگیر کردوە

دوژمن بەسە لە تاوانت دەست هەڵگرە
بیربکەرۆ لە ڕابوردووت پەند وەرگرە

زۆر کەسانێك لەپێشی تۆ ئەو هەوڵەیدا
کە گەلی کورد (قڕ بکات) و لەناویدا[١٦٨]

بەڵام خوا کارێکی وەهای پێ کردن
بوونە پەندی زەمانە و ئابڕووی بردن

ڕاستە گەلی کورد بێ کەس و تەنهایە
بەڵام کەسی هەموو کەسێك هەر خوایە



کەلار / کانوونی دووەمی ٢٠١٧

---

[١٦٨] قڕبکات: بنبڕی بکات، هەمووی بفەوتێنێت و لەناوببات و هیچی نەهێڵێت.

# دوا ڕۆژی ستەمکاران [١٦٩]

دڵـخۆش نـەبن وا تێـنەگـەن ســتەمکـاران
کــە نــامـرن ژیـــان هـەتـــا ســـەرە بـۆیـان
وا تێـنگـەن لـەنـاو نـاچـێت دەســەڵاتیـان
هەر ئەو گوللەی کە وا پێشـتر بە بێ تاوان
کـە ســاڵانێ خـوێنـی گـەلـیـان پـێ ئەڕژان
کـاسـەی ســـەری بـێ تـاوانیـان پـێ ئەپـژان
دەی ســـا ســـەیرکـەن چـەنـد بـە ئـاســان
هـەر ئەو گولـلە نەگریسەیان، تێکـیشـکـان
بــڕی کـەلـلەی ســـەری، پـووچـی خـۆیــان
هەر ئەو پەتەی کە خەڵکیان پێ ئەخنکان
دەی سەیری کەن چۆن ئاڵاوە لە گەردنیان
زۆر ئەستەمە لە دەستی گەل ڕزگاربوونتان
سـتەمکـاران هەروا ئەبێ مێژووی ڕەشـیان
تاســەر نییـە دەســـەڵات و ڕۆژی خۆشـیان



کەلار

---

[١٦٩] ئەم شیعرەم ئاماژە بە دواڕۆژی دەسەڵاتدارانی ڕژێمی دیکتاتۆری دەکات، لەوانە ڕژێمی بەعس.

# گەر بپرسن

گەر بپرسن لە هەر خاوەن هەست و ویژدانێ
بۆ ئەوەی خاڵ لەسەر مێژوویی ستەم دانێ[(١٧٠)]

گەر بپرسن لێی چ نەتەوەیەك بە خوێنی
ڕۆڵەکانی خاکی سوورە؟ ئەڵێ نەتەوەی کورد

ئەی چ گەلێك لە مێژوودا بێ دەوڵەت و
هەر ئاوارە و بێ سنوورە؟ ئەڵێ گەلی کورد

ئەی چ خاکێك وەك میراتی ماڵی مردوو
دابەش و لەت لەت کراوە؟ ئەڵێ خاکی کورد

ئەی چ پیر و لاو و ژن و منالێکی بێ تاوان
ئەنفال و زندە بەچاڵ کراوە؟ ئەڵێ هی کورد

ئەی چ دایکێك بۆ ڕۆڵەی شەهید و نا دیاری[(١٧١)]
هەمیشە جەرگی سووتاوە؟ ئەڵێ دایکی کورد

---

[١٧٠] واتا: گەر بپرسن لە هەر مرۆڤێکی خاوەن هەست و ویژدان دەربارەی مێژووی زوڵم و ستەم.

[١٧١] شەهید و نادیاری: شەهید و بێ سەروشوێن کراو.

ئەی چ باوکێك بۆ مەرگی ڕۆڵەی لێوبەبار و
ڕەنگ زەرد و پشتی شکاوە؟ ئەڵێ باوکی کورد

کە وا بوو گەلی کورد لە هەرچی خەم و
داماوی و نەهامەتی و دەردە سەری بوو

لە گشت نەتەوە و گەلانی تری دونیا زیاتر
پلەی باڵا و پشکی شێر و سەرووەری بوو[١٧٢]



کەلار ٢٠١٩

[١٧٢] پشکی شێر: لە هەمووان زیاتر.

واتا: گەل و نەتەوەی کورد لە هەموو گەل و نەتەوەکانی دونیا زیاتر ڕووبەڕووی نەهامەتی و داماوی و دەردەسەری بووە، هەمیشە ستەملێکراو بووە و خاك و نیشتمانی لەت لەت و دابەشکراوە و سنوور و دەوڵەتی سەربەخۆیان پێ ڕەوا نەبینیوە، هەمیشە ڕۆڵەکانی ئەنفال و کیمیاباران و شەهید و بێ سەروشوێن کراوە.

# ئازاری ئەنفال

دیسان وا جارێکی تر
زامی سەختم کولایەوە[١٧٣]
دیسان ئێسك و پرووسکی
ئازیزانمان دۆزرایەوە

لە کوێ توانای هەیە و کەی
ئەتوانێ هیچ پێنووسێ
کە بەسەرهاتی خەم و
ئازاری (ئەنفال)م بنووسێ[١٧٤]

ئەی دایکی کورد مەگری
بەسە گریان سوودی نییە
فرمێسکەکان هێمای خەمن
(ڕشتن)یان لە بێکەسییە[١٧٥]

---

[١٧٣] زامی سەختم: برینی قووڵ و پڕ ئێش و ئازارم.
[١٧٤] ئازاری ئەنفال: ئێش و تاڵاوی کارەساتی ئەنفال.
[١٧٥] ڕشتن: داباریین، لێرەدا مەبەست لە رشتنی فرمێسکە.

ئـەوانـەی کـە کۆچیان کـرد
لـەنـێـو دڵا لـەپـێـشــــەوەن
بـەڵام ئـەوانـەی کـە مــاوون
بـۆیـان بکـە نـاڵـە و شـیوەن

هەرچەند کەوا ئاوتمان بوو
لە دونیا لەگەڵ یەکدا بژین
بەڵام تکام وایە ڕۆژی دوایی
لە (فیردەوس)دا پێکەوەبین[١٧٦]



کەلار / تەممووزی ٢٠١٩

---

[١٧٦] ڕۆژی دوایی: ڕۆژی قەیامەت، وە هەروەها (فیردەوس)یش بەرزترین پلەکانی بەهەشتە.
ئەم هۆنراوەی (ئازاری ئەنفال) بۆ هەڵدانەوەی ئەو گۆڕە بەکۆمەڵەی دەشتی شاری سەماوەی سەر بە پارێزگای موسەننا نووسیومە کە لە ٢٣ ی تەممووزی ٢٠١٩ زاینی هەڵدرایەوە و روفاتی نزیکەی حەفتاوپێنج (٧٥) ژن و مناڵی ئەنفالکراوی تێدا بوو.

# شار و شاخی کوردستان

لە ڕۆژهەڵاتی خاکی کوردســـتان
خۆشـتـرین شـاری لەناو شـارەکان

مەهـابـاد لـەگەڵ شـاری کرماشـان
قەسری شـیرین و شـاری مەریوان

مەڵـبەندی جافـە شـاری جـوانڕۆ
سـەردەشـت و سـنە، ئیلام و شـنۆ

بـانـە و ڕوانسـەر، شـاری کامیـران
سەقز و سابڵاغ، نەغەدە و بۆکـان

ئـەمـانـەی وتمـان شـارێکی دیـارن
لـەنـاو شـارانـا، خۆشـتـرین شـارن

لـەنـاو شـاخانیش شـاخی داڵـەهـۆ
شـاخی هەورامان تا شـاخی شاهـۆ



کەلار / شوباتی ٢٠٢٠

# بۆ نازانی..

نیشتمان ڕۆژێ لـە منی پرسی
وتی پێم بڵێ خۆزگە ئەمزانی
لە وەسفی منا تۆ چی ئـەزانی
وتم: بـۆ نـازانی...
تـۆ هـەم بـۆن و گوڵـی جوانی
تـۆ هــەم مـانــای وشــەکانی
تـۆ نـمـەی بـارانـی بـەهـارانی
بـۆ نـازانی...
تـۆ پێنـووس و شــیعـرەکانی
تـۆ بـەهــــار و تـۆ زســتـانی
تـۆ ئـاسکی دەشتی گەرمیـانی
بـۆ نـازانی...
تـۆ بـەفـری ســەر شاخەکانی
تـۆ ئــاوی کانی کوێـســتـانی
تـۆ قـاســپـەی کـەوی بـەیـانی
بـۆ نـازانی... بـۆ نـازانی...

❋ ❋ ❋

کەلار / ئابی ٢٠٢٠

# کێ دۆستی کوردە

خــوایـە هــاوەرە کـورد زۆر بێکـەسـە
دوژمـن لــە گـشــت لا دایـوە مـەڵاسـە[١٧٧]

کـوا ئـەو وڵاتـەی وا دۆســتـی کـوردە
بیکـاتـە دەوڵــەت مـن ئەڵـێـم مـەردە

من لە جێی هەموو ڕۆڵـەی ئەم خاکـە
سـوپـاسـی ئەکـەم بـۆ ئـەو کـارە چاکـە

لــە جـیـاتـی گـەورە و بـچـووکـی وڵات
زۆر سـوپـاســیـەکـەم، ئـەو کـارە بکـات

بـەڵام داخـەکـەم گەلێ خـۆش بـڕواین
پەند وەرناگرین چەند جار فرۆشراین

دوژمن وەك کەمتـار لــە هـەمـوو لاوە
دانـی تیژ کـردووە و خـۆی حەشـار داوە

***

کەلار / ٧ / ١١ / ٢٠٢٠

---

[١٧٧] مەڵاسە: خۆحەشاردان (گوزخوارنەوە)، خۆئامادە کردن بۆ پەلاماردان.

# وەڵامێك بۆ بێخودی شاعیر

کەی خەتای چەرخە کە گەلی کورد حاڵی وایە
هۆی بێ کەسیە کە وا لەگەڵ خەما ئاشنایە
هەر دەغڵ و دانە ئەبێ بە ئارد بەڵام گەلی کورد[١٧٨]
لەگەڵ یەکا ناکۆکە بۆیە وا ئاردی بە بایە

****

هۆی ناکۆکیە ناگاتە ئاوات و کاروانی لە دوایە
گەر یەکبن لەگەڵ یەکا دژومنی سووك و بێ بەهایە
داری ئازادی ئەبێ بە خوێن ئاو بدرێت
لە کوێ خەتاکەی لە ئەستۆی چەرخایە

****

---

[١٧٨] دەغڵ و دان: خەلە و خەرمان.

تێبینی: بەندە (کەریم ئاغاوەیسی) ئەم شیعرەم (وەڵامێك بۆ بێخودی شاعیر ) وەك وەڵامێك بۆ ئەو چوارینە شیعرەی بێخودی شاعیر نووسیومە، کە "بێخود" لەو چوارینەیەدا دەڵێ:

ئەی چەرخی بەد موعامەلە تاکەی خەتا ئەکەی
ئەم کوردە بێ کەسانە بە غەم ئاشنا ئەکەی
دەغڵی وجودی ئێمە ئەکەی بە ئارد
خەرمانی عومری ئێمە هەتاکەی بە با ئەدەی ..!

﴿ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَـلُوا ﴾ وەڵامێکی پڕ مـانـایـە[١٧٩]
ئـەبـێ هەوڵـدەین چاکەکاربین ڕزگاریمان لـەوەدایـە
لـــــەپـێـش هـەمـووی بـەرژەوەنـدی گـــەل و وڵات
دواتر بڵـێین زۆر ئومێدە سەرکەوتنمـان لـە ئارایـە



کەلار / تەمموزی ٢٠١٧

---

١٧٩ (وَلا تـَنـازعـوا فـَتـفـشـلـوا): لە قورئانی پیرۆزدا لە ئایەتی (٤٦) لە سوورەتی (الأنفال)
واتا: ئاشووب و ئاژاوە مەگێڕن و مەچن بەگژ یەکدا شکست دێنن.

# سـۆزێك بۆ وەتەن

ئـەی وەتـەن شـیفـایـە ئـاوی سـازگـاری سـیـروانت
لـە لـوبنـان جـوانـتـرە بـۆ من دیـمەنی شـاخەکانت
تـاج و تـەختی قەیسـەر سـووك و بێ بـەهـایـە
لـە ئـاسـتـی فەرنـجی و گـاڵۆکی دەسـتـی شـوانت
****
شـیـرینە لام بـەڕووی شـاخی بـەمۆ و شـەمێرانت
مـیسـکـە بـۆ من بـۆنـی نـمـەی بـارانی بـەهـارانت
خـۆشـتـرین ئـاواز و بـەسـتـیـە لـەلام
هـاژەی ئـاوی دێـوانـە و بـەنـداوی دەربەندیـخـانت
****
(کەریم) گیانی بـۆ چییـە گەر نەیکا بە قوربانت[١٨٠]
کـە تـۆ دیل و ژێردەستە بی بـە دەسـتی دوژمنانت
قوربانی دەشت و کێوت بێ ئەو گیانەی لەبەرمایە
لـە نـەی خۆشـتـرە لام، قاسپەی کـەوی کـوێسـتـانت



کەلار /تەمموزی ٢٠١٧

---

١٨٠ کەریم: ناوی بەندەیە (کەریم ئاغاوەیسی).

# ئومێدت هـەبێ

کوردە دەی دەرسێك وەرگر لـە مـێژوو
ساڵی (حەفتا و پێنج) نازانی چی بوو[١٨١]
کاتێ ناکۆك بین ئێـمـە لـەگـەڵ یـەك
دوژمن یەکدەگـرن بە بێ یەك و دوو
****
زۆر جـــار وتـراوە و بـینـراوە و بـووە
هـەرکەس نەخۆش بێ خـۆ نەمـردووە
چـەنـدەها نـەخـۆش چـاك بووەتـەوە
هــەزاران ســاغـیـش گـیـانی دەرچووە
****
ئـومـێـدت هـەبـێ بـەوەی کـــە مـاوە
ژیـان هـەر هـەمـووی خـۆ نـەفـەوتـاوە
قــســەی پێـشـیـنـان ڕاســت و ڕەوایـە
کـوێر هـەتـا ئەمـرێ بە تـەمـای چـاوە



کەلار / کانوونی یەکەمی ٢٠١٧

---

[١٨١] ساڵی حەفتاوپێنج (١٩٧٥): ڕێکەوتننامەی(جزائر) کە بووە هۆی هەرەسی شۆرشی کوردستان.
ئەم شیعرەم وەك ئومێدێك بە چاك بوونی دۆخی کورد دوای ڕووداوەکانی (١٦ی ئۆکتۆری ٢٠١٧).

# ئێمەی کورد

ئێمەی کورد هێندە دڵپاك و سادەین
بە قسەی دوژمن زوو باوەڕ ئەکەین
هێندە دڵپاکین لە تەنگانەیشدا
بەرامبەر دوژمن خاوەن بەزەیین
****
لە هەر چوار لاوە دەورە دراوین
لەنێو گەلانا هەر بەش خوراوین
ئەنفال و کوشتن یان کیماباران
هەر بە ئەمانە پاداشت کراوین
****
هەر ئەوانە بوون کە جاری جاران
لە سایکس بیکۆ و پەیمانی لۆزان
مافی کوردیان تێدا پێشێل کرد
خاکیان دابەشکرد کوردیان فەوتان



کەلار

# ئەی وڵاتم

ئـەی وڵاتــــم تـۆی ئــاواتـم
هـەرکات بڵێی مـن لـەلاتـم
ســـەربـازێکم هەمـوو کـاتێ
بـە گیـان و دڵ من فـیداتـم
****
بـۆ بێنـازیت گـەلێ پەسـتم
به نەغمەی بولبولت مەستم
بۆ چیمه گیانم بۆ تۆ نەبێ
فیدای تۆ بێ هزر و هەستم
****
هـەتـــا مـــاوە گـڕ و تـیـنـم
بۆ نیشـتمان وەك پەرژینـم
لـە پێنــاوی ســەربـەخۆیی
پێشکـەشی بێ مـاڵ و ژینـم

❋ ❋ ❋

کەلار / ١٧ / ٥ / ٢٠٢٠

# ئاخ وەتەن

ئـاخ وەتـەن بـۆ چـی وەهـا فەوتـاوی
بـۆ چـی بـەم شــێوە کز و دامــاوی
خـۆزگــە ئەمـزانی هـۆکـاری چییـە
وەهــا لـــە گێژی خـەمـا خنکاوی
****
دەســتـی ناپاکە وەهـای لـێ کردووی
یان چارەنووسە بەم دەردەی بردووی
داخی بێکـەســی یان جـەوری ڕۆژگـار
وەهـا بـەم شـێوە هـەروەکو مـردووی
****
هەرچەنـد ئەتبینم وەهــا بێ ڕەنگی
کـە لـێوبـەبــار و وەك سـیا سـەنگی[182]
قـاژەی جەرگـم دێت بـۆ زەبوونی تـۆ
نـازانـم تـاکـەی هـەر هـای لـە تەنگی[183]
****

[182] لێوبەبار: کەسی خەفەتبار ـ سیا سەنگ: لێرەدا واتا ڕەنگی ڕەش هەڵگەراوە
[183] تەنگی: تەنگانە (نەهامەتی، نارەحەتی) لێرەدا واتا: تاکەی هەر داگیراوی و لە تەنگانەدای.

نـاکـەس و نـاحـەز دەورەی لـێـداوی[١٨٤]
بـە دەســـتـی دوژمن گـیـرۆدەی داوی
بـەڵام ئـومـێدت هـەبێت کــە ئەڵـێن
ســـتەم هـەتـا سـەر نـامـێـنێت بـاوی[١٨٥]



کەلار / ١٠ / ٥ / ٢٠٢٠

---

١٨٤ ناکەس و ناحەز: ناڕەسەن و نەیار.
١٨٥ نامێنێت باوی: لەناو دەچێت (ستەم بەردەوام نابێت).

# زۆر هاوارم کرد

مەپرسن یاران بۆ چی خەمبارم
لەبەر چی وەها زەردە ڕوخسارم
لە داخ بێکەسی، ئەم گەلی کوردە
دڵ پەرێشان و هەم بێ قەرارم
****
زۆر هاوارم کرد بۆم گەل و هۆزە
وتم: نیشتمان خاکی پیرۆزە
هەموو یەکبگرن دژی داگیرکەر
بەڵام نەبیسرا ئەم هەست و سۆزە
****
وتم: بابەس بێت ئیتر ئێمەی کورد
پەندێك وەرگرین لەوەی کە ڕابوورد
گەر یەکنەگرین ئەوەیش کە ماوە
کاتێك ئەزانین دوژمن ئەویشی برد

***

کەلار / ٢١ / ٦ / ٢٠٢٠

# دوژمن هەرگيز وا نەزانى

دوژمن هـەرگـيز وا نـەزانى، خـۆ ڕۆژگـار هـەروا نـابێ
خەرمانى كورد گڕى گرتبێ و، لـە پاڵـيشـيـا ڕەشەبابێ[١٨٦]

هەر ئەو گڕوكلپەى كە وا، ڕەنجى گەلى كوردى سووتان
ڕۆژێكيش دێت بسـووتێنى لاشـە و (كەلاكى بۆگەنتان)[١٨٧]

هەر ئەو پێكەنينەى كردتان لەسەر تەرمى لاوەكانمان
ڕۆژێكيش دێت ڕۆڵـەكانمان، لێتان بكاتە شين و گريان

گڕى تۆڵەى ڕۆڵەى كوردم، خەندە لابا لـەسـەر لـێوتان
كاروكردارى چەپـەڵـتان، بگرێ يەخەى هەر هەمووتان[١٨٨]



كەلار

---

[١٨٦] خەرمانى كورد: لێرەدا خەرمان واتا بەرهەمى ڕەنج و تێكۆشان و خەباتى گەلى كورد.

[١٨٧] كەلاكى بۆگەنتان: كەلاك (لاشەى) بۆنكردوو ئەم وشە بۆ ئـاژەڵى مردارۆبـوو يـان تۆپيـو بـە كـار دێـت، لێرەدا مەبەست لە تەرمى دوژمنى ستەمكارە.

[١٨٨] كاروكردارى چەپەڵتان: چەپەڵ(خراپ) واتا كاروكردارى خراپتان.

# خۆشەویستی وەتەن

ئـەی وەتـەن گـەر دوژمـن پـەنجەکانم بشکـێنێ
بـۆ ئـەوەی پێنـووس هەڵنـەگرێ و نەتـوانێ

سـەرووەری تۆ لە لاپەڕەی مێژوو بنەخشێنێ[189]
یان سـینەم شـەق کـات و دڵـیشـم دەربێنێ

یان دێـڕ بـە دێـڕی شـیعـرەکانم بسـووتێنێ
یان دەربەدەر و ئاوارەم کات، بۆ هەر شوێنێ

خەیاڵـی خـاوە دوژمـن هـەرگـیز نـاتـوانێ
نـاوی تۆ ئەی وەتەن، لـە دڵما هـەر ئەمێنێ



کەلار

---

[189] سەرووەری: شکۆ و گەورەیی.

# من ئەڵێم

من ئەڵێم کەمە ئەگەر بۆ شکۆی خاکی
نیشتمان بە شەو بە ڕۆژ هەر هەوڵ بدەی

گەر خۆشی و شادی ژیان سەرانسەر
لە بۆ نیشتمان هەمووی لە دەست دەی

بۆ بەرژەوەندی خاکی نیشتمان هەرچییە
تاڵی و ناخۆشی هەیە هەمووی بنۆشی

من ئەڵێم کەمە گەر لە منالی هەتاکو
پیری لە بۆ نیشتمان بە دڵ تێبکۆشی



کەلار

# زانســت

گـەنجـێـەی زانـســت هــەردوایی نـایـە
هــەوڵــی بــۆ بــدە هــەتــا هــەتــایــە
چـونـكـە فـەرمـوودەی زاتـی خــوایــە
ئــایــە زانــاكــان وەك نـــەزان وایـــە[١٩٠]
هـەتــا ئـەتــوانـی هـەوڵـدە بـۆ زانـیـن
زانـــســـت: چــرایــە بـۆ ئــایـن و ژیــن
ئەبـێ بنووسـرێت بـە پـیـتـی زێـریـن
تـا لـە یـادمـان بێـت هەتاكو ئەمـریـن
قەلەمی دەستی مامۆستا و خوێندكار
یـان بێـڵـی دەسـتی جوتیـار و هــەژار
قـەزای بكـەوێ نەك جارێ سـەد جار
لـە خـۆفـرۆش و پـیـاوی ســتـەمـكـار

* * *

كەلار / ئازاری ٢٠١٤

---

[١٩٠] لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی (الزمر) ئایەتی ژمارە (٩) خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ ﴾.

# مرۆڤ چەند جۆریکە

دەور و زەمـانـێ وایـە تێی کـەوتـووین
لە ئاستی ڕاستی هـەموو وەك مردووین[191]

کـەسـی وا هـەیـە زۆر بـێ ویـژدانـە
چاکـەی خـەڵکیشی لـەلا تـاوانـە

نـاوی ئـەم ئەبات بـاسـی ئـەو ئەکـات
زۆر بـێ شـەرمـانە هـیچ شـەرم نـاکـات

درۆ و تـاوانـی خـۆی لا بـچـووکـە
گرانی خـەڵکی لـە لای ئـەو سـووکـە[192]

دوو شـت زۆر باوە لای خەڵکی نـەزان
یەکـەمیان درۆ، دووهـەمیان بـوختـان

بـرا: گـوێ بـگـرە تـۆ لـە ئـەم پـەنـدە
نـەزان کـاری خـۆی زۆر لای پەسـەنـدە

---

[191] واتا: لەئاستی کاروکردەوە و قسەی ڕاست وەك مردوو بێدەنگین و پشتیوانی لێ ناکەین.

[192] واتا: درۆ و تاوان و کردەوەی نەشیاوی خۆی بە بچووك و بە کەم و ئاسایی دەزانێت، بەڵام کاروکردەوە و خووڕەوشتی جوانی کەسانی تر بە کەم و بە چاوی بێ بەها و سووك سەیری دەکات.

بـۆیـە خـواوەنـد بەخــشـیویـە پێـمـان
بە ئێمەی بەندە دوو گوێ و یەك زمان

بـۆ ئــەوەی کــەوا ئــێـمـە تـێبـگـەیـن
کـە دوو ببیســتین، یەك قـسـە بکـەیـن(١٩٣)

ئــاخ پـلــە و پـایــە بــەژیـری بـوایــە
کاری خەڵك بـە دەسـت، ژیـرۆ بـدرایـە

هــەرچی دەسـتـپـاك و ژیــر و زانــایـە
لــە نـــاو وڵاتـــا پـاداشـــت بـکــرایــە

هـەرکەس لـە جـێی خـۆی دابـمـەزرایـە
کەس جـێگـەی کەسـی زەوت نەکـردایـە(١٩٤)



کەلار / ئابی ٢٠١٤

---

١٩٣ واتـا: پێویسـتە ئێمـەی مـرۆڤ دوو هێنـدەی قسـەکردن گـوێ بگـرین و ببیسـتین (زیـاتر گـوێ بگـرین و ببیستین) و کەمتر قسە بکەین و بڵێین (زیادەڕەوی نەکەین لە قسەکردن)دا.

١٩٤ زەوت نەکردایە: داگیرنەکردایە (کەسانی شیاوو چاك و دەستپاك لە جێگەی چاك و شایستە دابمەزرایە و دابنرایە، کەسانی نەشیاو جێگەکەیانی داگیرنەکردایە).

# لەخۆبایی بوون

هەرگیز مەنازە بەهێز و بازوو
ئەبێ کۆچ بکەیت درنگ بێ یان زوو
نەڵێی سامانم هەردوایی نایە
یاخود زانستم لە خەڵکی جیایە
نەکەی کە بڵێی تۆ کێیت و من کێم
ئایە لە خاك نین بۆچی ناڵێی پێم ؟
هەردوو لە خاکین چی من چی تۆ
گرنگ دوا ڕۆژە نەبین ڕەنجەڕۆ
هەرگیز مەنازە بەهێز و جوانی
کاتێ کە پیر بوویت ئەوسا ئەزانی
کە هێز و جوانی و سەروەت و سامان
هەموو ئەمانە بێ سوودن بۆمان
ئەوەی بۆ دونیا و دوارۆژ بەکەڵکە
ئاسایی بژی تۆش وەك ئەم خەڵکە
نەکەی تێکەڵ کەی لە ڕەش و لە بۆر[١٩٥]
ئەبێ جێی بێڵی چی کەم بێ یان زۆر

---

[١٩٥] واتا: هەمەجۆر ( حەرام و حەلاڵ ) تێکەڵ مەکە، زۆرو بۆر گرنگ نییە، چاك وپاك گرنگە.

نـەڵـێی مـن کـێم و ئـەویـتـر کـێـیـە
نـەڵـێی مـن ســەرم ئـەویـتـر پـێـیـە
خۆ ئەگـەر واش بێ زۆر چاك بزانـە
سەر هەرچەند بەرزە بەپێوە جوانـە
هـەمـوومـان بەندەی پـەروەردگـاریـن
دەوڵەمەند، هەژار، جوان و ناشـیریـن
به دەسـتی خـوایە سـاغی و نەخۆشی
هەر بەدەست ئەوە خۆشی و ناخۆشی
هــەمـوو گـیانـداران ئــاژڵ و بـەشــەر
ئـەوەی لـەم دونـیـا گـیانـی ها لەبـەر
دروســتـکــراوین لــە دڵــۆپــێك ئــاو[١٩٦]
بـۆ چـی بـنـازیـن بـە شـۆرەت و نــاو



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٤

---

[١٩٦] خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی (فاطر) ئایەتی (١١) فەرموویەتی:
﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٍ﴾ واتا: خوا ئێوەی لە خاك دروستکردووە، لەوەودواش لە نوتفەیەك (لە دڵۆپێك ئاو: مەنی ).

# ئەدیب و شاعیرانی کورد[197]

ئەگەر لابدەینەوە لاپەڕەکانی، ئەدەب و شیعر بە وردی
هەر لە مەحوی و مەولەوی و، سالم و کۆساری و کوردی

پیرەمێرد و قانع و بێخود و، شێخ نوری و حەمدی
کاردۆخی و کاکەی فەلاح و، دڵدار و دیلان و هەردی

موفتی پێنجوێنی و مەفتون و، شێخ سەلامی عازەبان
جگرخوێن و مدهۆش و، هێمن و هەژاری موکریان

نالی و ناری و سەودایی و، بابەتاهیری هەمەدان
ویسالّی و خانای قوبادی و، وەلی دێوانەی سەرگەردان

ئەسیری و ئەحمەد موختار و، لوتفی و بێکەس و گۆران
حاجی قادر و مەلای گەورە، لە کۆیەیی شاری شاعیران

مەلا عەبدولکەریمی مودەریس زانا و شاعیر و شەرعزان
مینە جاف و شێخ ئەحمەد شاکەلی، لەدەشتی گەرمیان

---

[197] تێبینی: لەم شیعرەمدا کە نووسیومە لەژێر ناوی (ئەدیب و شاعیرانی کورد) ناوی (٥٤) پەنجاو چوار ئەدیب و شاعیر و نووسەری دیاری و ناوداری کوردی تێدا نووسراوە، کە زۆربەیان خاوەنی دیوانی شیعر و کتێبی چاپکراون.

کانی و فانی و زەبیحی و، زێوەرو ئەورەحمان بەگی بابان
وەفایی و سـەیدی هەورامی و، عەبدوڵڵا بەگـی هەورامان

ناتیق و حەریق و بێسارانی و، فەتحوڵڵا بەگی جافرسـان
مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی، لەباکووری کوردسـتان

نووسـەر و زانـای کورد، سەعیدی نەورەسی بەدیعوزەمان
ئەمـانە کـەڵـە پیـاو و شـاسـواری، شـیعـر و ئەدەبن بۆمان

ئـەم هـەمـوو زانـا و نـووسـەر و، ئەدیـب و شـاعـیـرانـە
جێی شـانـازین بـۆ خـاك و، گـەلـی ئـەم نیشـتـمـانـە

ئـەمـە بـەشـێـك بوو لـەوانەی، کـە من باسـیانم کـردووە
ئەبێـت داوای لـێبـوردنکـەم، کـە زۆریـانـم لـەبیـرچووە



کەلار / ئایاری ٢٠١٥

# خەمی میللەت

وتم: قەڵەم هەستە بنووس
خەوتنت شەرمەزارییە
باسی خەمی میللەت بکە
چارەنووسی نادیارییە

میللەتێك کە هەر هەڵپەڕێ و
نەزانێت هۆکاری چییە
کوانێ بەنزین یان کارەبا
کوانێ مووچە ئەڵێن نییە

نابێت داوای ئاویش بکەی
ساڵەکەی وشکە ساڵییە
ئاودیو ئەکرێت نەوت بەلێشاو
کەس ناوێرێت بڵێ چییە

هەندێك لە گەنجەکانیشی
هەرخەریکی ئەتارییە
یان مۆدێلاتی جلوبەرگ
یان کافتریا یان یارییە

نەرگیـلـە و بلـیـارد و قـومـار
شـــتێـکی زۆر ئـــاســـــاییـە
بڵـێی چییە مـێژووی کـوردم
ئەڵـێت هـیچم لـەبــەر نـییـە

ڕۆز لـێدەدات زۆر پێی خۆشـە
گـەرپێـی بڵێی سـەرســەرییـە[١٩٨]
میـلـلـــەتـی دامــــاوی ئــــاوا
بـــەڕاســـتـی جـێی بـــەزەییـە

بـەســیـە (کەریم) وازبهـێـنـە
قـســـەکـانت ســــوودی نـییـە
مــردن لـەڕێی خـاکـی کـوردم
جـێی شـانازی و سـەربەرزییـە



کەلار / ئابی ٢٠١٥

---

[١٩٨] شانازی دەکات و زۆر پێی خۆشە گەرپێی بڵێی سەرسەرییە.

# کورسی دەسەڵات

کاتێ لەم دونیا هەلت بۆ رەخسا، چوویتە سەر کورسی[١٩٩]

وەهات لێ نەیەت، کە بێ ئاگا بی و لە کەس نەپرسی

راستە کەس تاسەر، لەسەر کورسی نامێنێت

سەدان ساڵە هەروا بووە، تازە دێت و کۆن ئەچێت

یەکێ نەبوو کە دەردی، ئەم گەلە داماوە بکا دەرمان

دەست و قۆلی لێهەڵماڵێ، ببێتە خزمەتکاری نیشتمان

هەرچی هات و وتی: نیشتمانم وەکو تاجە لەسەرما

سوێندی ئەخوارد و ئەیوت، ئەم بەرگەم کفنە لەبەرما

هەر ئەوەندە خزمەتکاری گەلە، تا وەرئەگرێ دەسەڵات

لە کەس ناپرسێ دواتر، چی بکات و چی نەکات

ئەگەر یەکەم پیتی سەرتاکانی، ڕیز بکەی ئەم هۆنراوە[٢٠٠]

تێدەگەیت بە تەواوی، کە چی لەنێویا نووسراوە

* * *

نیسانی ٢٠١٦

---

[١٩٩] کورسی: کورسی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی.

[٢٠٠] یەکەم پیتی سەرتای نیوەدێڕەکانی ئەم هۆنراوە ڕیزبکەی لەسەرەوە بۆ خوار نووسراوە (کورسی دەسەڵات)، واتا: پیتی یەکەمی یەکەم وشەی نیوەدێڕەکان.

# وەسیەت بێ کە مردم

تـوخـوا یـاران کـە مـردم ئـەم وەسـیّـتـەم مەفـەوتێـنـن
بە(نـاو مەلا)م بـۆ دامەنێـن و، قـورئـانم بـۆ بـخـوێـنـن[٢٠١]

کاکی نا مەلا بانگ مەکەن، لە قورئانا دەنگ بلەرێنێتۆ
چونکە ئەم کردارە بیدعەیە و، لە شەرعا جێی نابێتۆ[٢٠٢]

برام کە ئێمە ئەڵێین موسـڵمـانین و ئیسلامە ئاینمان
کەسیان ئەمەی نەکردووە نە(سەروەر و نە پیاوچاکان)[٢٠٣]

وەسـیەتم ئەمەیە بۆتان، ئەی دۆست و خۆشەویستانم
کـاتـێ کە ئـەجـەل هـات و، مــردن بـوو بـە مـیوانم

تـکـام وایـە کـە بـۆم مەکـەن، نـاڵـە و شـیوەن و هـاوار[٢٠٤]
مەگـەر بە ناچـاری، فـرمێسك لە چاو بتکێـتـە خـوار

---

[٢٠١] بەناو مەلا: (کۆلکە مەلا) ئەوانەیە کە لە بابەتەکانی ئایندا شارەزایی تەواویان نییە (مامۆستای ئاینی نین)، زۆر جار لە تەعزیەکاندا قورئان دەخوێنن.

[٢٠٢] بیدعـە: (داهێنـراو) بـە هـەموو ئـەو ڕێگا و شـێوازانەی عیبـادەت دەگوترێـت کـە داهێنـراون و لـە ناوەڕۆکی شەرع (بنەماکانی ئاین)دا نەبن و لە قورئان و سوننەتدا ئاماژەیان بۆ نەکرابێت.

[٢٠٣] سەروەر: (محەمەد) پێغەمبەری ئیسلام (د . خ). ــ پیاوچاکان: کەسانی خواناس.

[٢٠٤] ناڵە و شیوەن و هاوار: گریان و زاری لە خۆدان و لاواندنەوە.

نەکـەن بـۆ کـۆچـم بکـەن، ڕەش و شـــین و لـە خـــۆدان[٢٠٥]
بـۆ ئـەوە بگـرین کـە ئـەمـەیـە، دوا ڕۆژی هـەمـوومـان

لـەجـیـاتی مـەراســـیم و گــریـــان و هـــاوار شـــیـوەن
دەی بـا دۆسـتـانم لـەپـاش، کـفـن و شـۆردنم هـەوڵـدەن

تەرمەکەم بـۆ شـوێنێکی پـیـرۆز کـە مزگـەوتە، ببـەن
بـا مـوسـڵـمـانـانێ زۆر، نوێــژ لــەســەر تـەرمـم بکــەن

بـە هـێـمـنـی و زۆر لــەســـەرخـۆ، خـــزم و دۆســـــتـان
تـەرمم ببـەن بۆ هەوارگەی هەمیشـەیم، بۆ گۆڕسـتـان

لـە کـاتی نـاشتنم نەکەن، قـسـەی پـووچ و داد و بـێـداد
بەڵـکـو یـەك یـەك هـەمـووتـان، گـەردنم بکـەن ئـازاد

نەکـەن بـە(خـێـوەت )، ڕێـگـەو کـۆڵان داگـیـر بـکــەن[٢٠٦]
چونکە بەو خێوەت هەڵدانە ئازاری خەڵکی تر ئـەدەن

---

[٢٠٥] ڕەش و شین: جلوبەرگی ڕەش و شین (جلوبەرگی ئازیەتی).
[٢٠٦] خێوەت: (چادر) لێرەدا مەبەست ئەو خێوەتەیە کە بۆ تەعزییە (پرسە) هەڵدەدرێت.

لـە جیـاتی تەعـزییـە و، خـێوەت هەڵدان و قـاڵـەقاڵ
یـان بیدعەی (سێ ڕۆژە) و، (سـەرچلـە) و (سـەرساڵ)[٢٠٧]

بـپـاڕێـنـەوە بـەدڵ هـەمــووتـان، لـــە پـەروەردگـــار
کـە فــراوان بـکــا بـۆم، مـاڵـی تـــازەی نـوێ هـــەوار[٢٠٨]

هەر یەك بچێتە سەر ئیش و کاری، لەپاش ئەمانە
بێشك هەر گۆڕە جێگە و، مەنزڵی هەر هەموومانە

وەســیـەتـم بـۆ ئـێـوە یـاران، ئـەمـە بـوو کـە کـردم
لـــە یـــاد مـەکــەن وەســـیـەتـم، کــاتـێ کــە مـــردم



کەلار / ئابی ٢٠١٦

---

[٢٠٧] سێ بۆنە و یادکردنەوەیە کەخزم و کەسوکاری مردووەکان ئەنجامی دەدەن کە لە ئاینی ئیسلامدا درووست نییە (ڕێپێدرا نییە).

[٢٠٨] ماڵی تازە: ماڵی نۆی (گۆڕ)، ـ نوێ هەوار: جێگەو هەوارگەی نوێ (گۆڕستان).

# پشـيلەى گوێ قوت

دەمــەو شـــەفەقێك، كـاتـى بــەر بـەيــان
پشيلـەيەكم بە گوێى قوتەوە بيـنى لـە كۆڵان

گـوێـى قوت كـــردبوو، بــۆ دوور ئەيـنـوارِى
كلكى با ئەدا خۆى بە پڵنگ و بە شێر ئەزانى

بـە گـوێـى قـوتــەوە، خــەيالــى چــووبـوو
بـێـشـــك مـشـــكـێـكـى، بـەدى كــــردبوو[٢٠٩]

كـــە ئـــەم پـشــيـلـــەم بـيـنـى بـەم شـــێوە
ســـــەرم زۆر ســــورِمــا و بـيـرم كـــردەوە

وتـم زۆر ســـوپــاس بـۆ تـۆ خــوايــە گــيـان
بـە شـێوازێ جـوان، كـە ئـێـمـەت خـولـقـان

بـەخـشـيـت بـە ئـێـمـە، هـێـز و باڵا و بـيـر
وەك مـشـك بـۆ پـشـى نەبووين بە نـێـچـيـر

---

[٢٠٩] بەدى كردبوو: بينى بوو (بەرچاوى كەوتوو بوو).

گەر مرۆڤ وەکو مشك بوایە، قەبـارەی لەشی
ئایە جیاوازی لەگەڵی مشکا چی بوو بۆ پشـی؟

گــەر ئــەوەی وتـمـان، خـەیــاڵ نـەبـوایــە
مــرۆڤـ  بــەو شـــێوە، وا بـچـــووك بـوایــە

پـشــیـلـــە ئەبـوو، بــە پـڵـــنـگ لــێمـان[٢١٠]
لــە ئـێـمـەی مــرۆڤـ، تـــاڵ ئەبـوو ژیـــان

خـوانـد مــرۆڤی بـە جـۆرێك نـەخـشـان
بـاڵادەســتـره لـــــە گـــشـــت گــیـانـداران

بـۆیــە پـێویـسـتـە بـۆ مـرۆڤ گـشـــت کـات
چـــاکــەکـانی خـــوا فـەرامـــۆش نـەکـات



کەلار / کانونی یەکەمی ٢٠١٦

---

[٢١٠] واتا: ئەگەر لاشەی مرۆڤ وەك مشك بچووك بوایە ئـەو کاتـە پشیلە دەبـووە ئـاژەڵێکی دڕنـدەی وەك پڵنگ و مەترسیدار دەبوو بۆ مرۆڤ.

# زمان و زیان

ڕاسـتـیان فـەرمـووە پـیـاوی پـێـشـیـنـان
گەر دار بە دەس بـووی ڕۆژێ لە ڕۆژان

هـەرگـیـز ئـەو دارە، تـۆ مـەوەشـێـنـە
چـونـکـە ڕۆژگـار ڕۆژی لـە شـوێـنـە

هـەر لـە کـۆنـەوە ئـەمـە وتـراوە
پـەنـدێـکـی جـوانـە بـۆمـان جـێـمـاوە

خـۆ ئەگـەر ژیـان دوو نـوخـتـەی لادەی
ئـەبـێ بـە زیـان گـەر لـێـم تـێـبـەگـەی

(ژیان) و (زیان) دوو نوخـتـەی بـەیـنـە[٢١١]
زیـان زۆر تـاڵـە و ژیـان شـیـریـنـە

بـە وتـەی شـیـریـن خـەڵـکی بـدوێـنـە
بـە تـانـەو تەشـەر کـەس مـەڕەنـجـێـنـە

ژیـان بـاخـێـکـە جـوان و بـێ وێـنـە
تـۆیش چـەنـد گـوڵـێـکـی تـێـدا بـڕوێـنـە

---

[٢١١] زیان: ئەگەر دوو نوختە(خاڵ) زیاد بکەین بۆ (ز) ی وشەی زیان وشەکە ئەبێت بە ژیان.

لـــە لایـەکـی تر، جـیـاوازی نێـویـان
تـەنها یـەك پـیـتـە (زمـان) و (زیـان)[٢١٢]

ئـەو پارچە گۆشـتـەی کـە لـە دەمـایـە[٢١٣]
گـــەر بـیـپـارێـزی زۆر بـە بـەهــایـە

بـەڵام هـەر کـەسێ، گـەر نـەیـپـارێـزێ
مـارێـکـی وایـە، خـۆیـشـی ئـەگـەزێ

بـێـگـومـان کـەســی عـاقــڵ و دانــا
کـردەوەی جوانـە و قـسـەی پـڕ مـانـا

بـەڵام کـەسـانـی نــەزان و نـەفــام
دایـم سـەرقاڵـن بـە قـسـەی بێ تـام

***

کەلار / نیسانی ٢٠١٧

[٢١٢] واتا: ئەگەر پیتی (م) ی وشەی (زمان) بگۆڕێن بۆ پیتی (ی) ئەوا دەبێت بە وشەی (زیان).
[٢١٣] ئەو پارچە گۆشتەی: مەبەست (زمان)ـە کە مرۆڤ ئەگەر نەیپارێزێت خاوەنەکەی تووشی نەهامەتی و کێشە و دەردەسەری دەکات.

# خۆزگەم بە جاران

ئـاى چەنـدە خـۆش بوو سـالآنى پێشوو
خەڵكى ئـاسـوودە و دڵـى بێ خـەم بوو

هەرچەند كە جاران خەڵكى هەژار بوو
بەلآم بێ خەم بوو هەرچەند نەدار بوو[٢١٤]

كـەسـێـك تيكـەيـەك، نـانـى هـەبـوايـە
حـەزى ئەكـرد خەڵكى، لـێى بخـواردايـە

خـەڵكى لـە شـارێك، يـان لـە دێيـەكا
وەكـو بـرا بـوون، لـەگـەڵـى يـەكا

بـەلآم داخەكـەم ئێستـا نـەك هـاوسێ
بـرا هـەوالـى، بـرا نـاپـرسـێ

جـاران كـەس قيزى لـە كـەس نە ئەكرد
كە چى زۆر كەم بوو نەخـۆشـين و دەرد

جـامـێك ئـاو و دۆ لـە كـۆمـەڵـێكا
گشـتى لێى ئەخوارد يەك بە دواى يەكا

---

[٢١٤] نەدار: (هەژار) بێ ماڵ و سامان.

نـانـی گـەنـم و جـۆ و ڕۆنـی خـۆمـاڵـی
کـەرێ و دۆیش جارجار ئەخرایـە پـاڵـی

ئـەمـانـە لــەســەر ســیـنـی دائـەنـرا
بـە کـەوچـك ڕۆنـی خـۆمـاڵـی ئەخـورا

هـەمـووی ئەخـورا ئـەو سـەر سـینـییە
کەس نەی ئەزانی چەوری خوێن چییە

ئەزانی بـۆ چـی نەخـۆشــین کـەم بوو؟
کەش و هەوا پاك خەڵکی بێ خـەم بوو

جـاران (چـاوێشـە) یـان (لـەرز و تـا)یە[٢١٥]
ئەم سـاڵ بۆ ئەو سـاڵ (هەوا و پەتـا)یە

ئێـسـتـا ئـەم ژینگە وەهـا پیـس بووە
خـەڵـکی گـیـرۆدەی هــەزار دەرد بووە

ژیـانـی جــاران، ســادە و ئـاســان بوو
بـژێـوی ژیـان، بـە ڕەنـجـی شــان بوو

بـە ئـاژەڵــداری یـاخــود کـشــتـوکـاڵ
بـەم ئیشـانـەوە خەڵك ئەبوو سـەرقـاڵ

---

٢١٥ (چاوێشـە) و (لـەرز و تا) دوو جۆر نەخۆشین جاران زۆر بوون.

خـەڵکی بـە شـــوانـی یـاخـود گاوانـی
بـە دەســتی ئەکـەوت نـانـی خـێـزانـی

جاران کە خانوو هەرچەند لە قوڕ بوو
جلوبەرگ زۆربـەی پـڕ پینە و شـڕ بوو

بـەڵام ئـەو کـاتـە، (فرتوفـێڵ) کـەم بوو[٢١٦]
تـەنـانـەت نـانیش، تـامی خـۆی هـەبوو

هـیـچـییـان نـەبوون، ئـەم ئـامـێرانـە
کـە ئێـسـتـاکـە هـەن، لـە ئـەم کاتـانـە

ئـامـێری گــەورەی ســاردەمـەنی مـاڵ
(مەشکە) و (کونە) بوو بەدرێژایی ساڵ[٢١٧]

(پـێخـەف)ی جـاران لـە لادێ و لـە شـار[٢١٨]
مەوج و بـەڕە بوو، نەك قاڵـی و کومبار[٢١٩]

بـەدار و پشـــقـل، لــــە وەرزی زســـتـان
ســـۆبـە دەم ئەدرا، کـــاتـی ئـێـــواران

---

٢١٦ فرتوفێڵ: فێڵبازی (ساختەکاری).

٢١٧ (مەشکە) و (کونە): پێستی مەڕومالات بوو. (مەشکە): بۆ دۆ، (کونە): بۆ ئاو، بەکاردەهات.

٢١٨ پێخەف: ئەو کەلوپەلی ناوەماڵەیە کە مرۆڤ بۆ خەوتن و حەسانەوە بەکاری دێنێت.

٢١٩ مەوج: (جاجم) جێگرەوەی بەتانی ئێستا بوو. بەڕە: (فەرش) جێگرەوەی قاڵی ئێستا بوو.

نەوت زۆر بە کەمی بە کار ئەهێنرا
مەگەر جارجارێ بۆ (لۆکس) و (چرا)[٢٢٠]

بەڵام ئێستاکە (باو) باوی نەوتە[٢٢١]
هەندێ کەس بە دەست نەوتەوە فەوتە[٢٢٢]

نەوتی ئەم خاکە، بە (لێشاو) ئەڕوا[٢٢٣]
بەڵام داخەکەم، بێگانە ئەیخوا

***

کەلار / ئایاری ٢٠١٧

---

٢٢٠ لۆکس و چرا: دوو ئامێری ڕۆشنکەرەوە بوون.
٢٢١ باو: سەردەم. باوی نەوتە: سەردەمی نەوتە.
٢٢٢ فەوتە: مردووە، تیاچووە. فەوت: مردوو، تیاچوو.
٢٢٣ لێشاو: لێشاوی دەریا.

# هەژار و دەوڵەمەند

زۆربەمان ئەمە، بە چاو ئەبینێ
لە زۆر کۆمەڵگا، لە هەموو شوێنێ
لەنێو کۆمەڵگا دوو چینی جیاواز
چینێ گرفتار چینێ سەرفراز
چینێ بالآدەست خاوەنی پارە
چینێکیش داماو یەکجار هەژارە
کاکی دەوڵەمەند قسەی ڕەوایە
هەرچییە بڵێ ئەڵێن هەروایە
دەوڵەمەند ئەگەر قسەی هەڵە بوو
ئەڵێن وەهایە زۆر ڕاستت فەرموو
بەڵام خۆ هەژار گەر ڕاستیش بڵێ
ئەڵێن ڕاست نییە ئەوەی کە ئەیڵێ
دەوڵەمەند بڵێ بینیومە ئاسن
مشك بە ددان کردوویە کونکون
ئەڵێن بۆی هەیە مشك زۆر هارە
ددانی مشك هەر وەك (منشارە)[٢٢٤]

---

[٢٢٤] منشار: (هەڕڕە) هەڕڕەی ئاسن بڕ.

گـەر هـەژار بڵـێ ساڵـێ لـە سـاڵان
(بـەڕە)یـە شـرمـان مـشـك دایڕزان[٢٢٥]
ئەڵێن ڕوو نـادا، هـەرگیز شــتی وا
مـشـکی دامـاو، چۆن (بـەڕە) ئەخـوا
زۆر حـەیفـە ژیـان وا بچێـتـە سـەر
کـەی مـاڵ و سـامان ئەبێـتـە پـێـوەر
ڕەواجـی نییـە ڕاسـتگـۆ ئێـسـتـاکـە
بـە خـاوەن پـارە ئەڵـێن پیـاوچـاکـە
ئەگـەر هەژار بی هـەرچەند زانا بی
قسەت بێ سوودە هـەرچەند دانا بی
بـەڵام دەوڵـەمەند قسـەی پەسـەندە
با هەر نەزانێ دوو کۆی دوو چەندە[٢٢٦]



کەلار / ئایاری ٢٠١٧

---

٢٢٥ بەڕە: فەرش (فەرشی ناوماڵ) ڕاخەر.

٢٢٦ دوو کۆی دوو: واتا: ئەگەر ئەوەندە گێل و نەزانیش بێت نەزانێ (٢ + ٢) دەکاتە = (٤).

# مافی ئافرەت

کـاتێ پـرس و ڕا بە ئـافـرەت بکـەی
وەهـا نـەزانی کـارێ سـووك ئەکـەی

بەڵکوو ئـەو کـارە جوانـتـرین کـارە
ئـافـرەت دیـاریـەکـی پـەروەردگـارە

مـافـی ئـافــرەت جـێـی شـــانــازیـە
ئـەبـێ بـزانـیـن مـافـیـیــان چـیـیـە

ئـافـرەتـان مـافـیـان دیــاری کــراوە
لـە شـەرعـا هـاتـووە و بـۆی دانـراوە

سەروەری ئیسلام فەرموویە پێمان[٢٢٧]
پێویستە ئێمە چاك بین لەگەڵیان

ئـافـرەت دایـك و خوشـك و کـابـانـە
ئـافـرت ڕوونـاکـی مـاڵ و خـێـزانـە

---

[٢٢٧] سەروەری ئیسلام: (محمد) دروودی خوای لەسەر بێت، پێشی وەفاتی، لە ساڵی ١٠ی کۆچی لە وتاری حەجی ماڵاوایدا وەسیەتی کردوو فەرمووی: " واستوصوا بالنساء خیراً "
واتا: " وەسیەت بەکەن کە چاکاکەکار بن لەگەڵ ئافرەتان" (لە خوا ترس بن و بە رەحم و سۆزبن لەگەڵ ئافرەتان).

هەرکەسێ مەرد بێ هەتاکو ئەمرێ
ڕێـزی ئـافـرەت، پێـویســتـە بگـرێ

بـەڵام ئـافـرەتـیـش ئەبێـت بـزانـێ
ڕێـزیش بـۆ کـەسـی بەرامبـەر دانـێ

هـەر لـە خـۆیـەوە نەیکات بـە هـەرا
نـەیکات بــە دوژمـن بــرا لـــە بــرا

ڕێزی خۆی بگرێ لـە هەموو شوێنێ
قاڵـەقـاڵ نـەکا و دەســت ڕاوەشـێنێ(٢٢٨)



کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٧

---

[٢٢٨] قاڵەقاڵ نەکا: دەنگەدەنگ نەکات و خۆی بە زیاتر و چاکتر بزانێت.

# ژیانی دونیا

گـەر ئەتـەوێ خـۆشـی بنۆشـی
ئەبـێ هــەوڵــی بـــۆ بــدەی
ڕێگای خۆشـی پڕیەتی لـە تاڵی
نـابـێ هـەرگــیز کــۆڵ بــدەی

دونـیـایـەك كـە مـیـوانـی تێـیـدا
بە پلـەو پایەت مەنـازە سا دەی
تەمەن درختێكی وشكە نەكەی
بەگڕی تاوان ئاگری تێبـەردەی

چـونـكــە هـــــەر داری وشـكـە
بە ئاسانی ئەسووتێ و گڕ ئەگرێ
بەڵام چاكەی چاكەكار زیـندووە
هـەرچەنـدە كە خۆیشـی بـمـرێ

وەك وتــراوە، سـەفـەری نـێـوان
ئەم دوو دونـیا هـەر هەنگاوێكە
هــەر ئەبـێ ئـەو سـەفـەرە بكا
مـنـاڵــە، پیـرە، یـاخـود لاوێكە

ئـــەم دونـیـــایــە ڕاوچـیـەکـی
بە توانایە و مردنیشـە داوەکەی
هـەر ئەبـی ببـی بە نێـچیـری و
نـاتـوانـی لـــــەو داوە ڕابکـەی

گـەر گـوڵـت خـۆش ئەوێ ئەبـێ
ئارامـت بێ لـە ئـازاری دڕکەکەی
هەتا دەسـتت دڕکی پیانـەچـەقێ
چـۆن ئەتوانی بـۆنی گوڵ بکـەی

دەی توخـوا دونیایەك بەم شێوە
وەهـا بێـت دوا ڕۆژ و وەفـاکـەی
کـــەی شـایستـەیـە کـە ببـی بـە
عـەودالـی و خـۆتی بە فـیداکـەی



کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٧

# قۆناغی ژیان

ئەگەر تێفکرین کە چۆن خولقاوین
چۆن پەروەردگار بە دی هێناوین
لە دڵۆپێ ئاو دوای چەند قۆناغێك
لە قۆناغی خوێن تا ئەبێ بە ئێسك
لەپاشی چوار مانگ گیانی دێتەبەر
لە جەستەی دایك ژین ئەباتەسەر
لەپاش ئەمانە لە دایك ئەبێت
بۆ ناو ژیانی دونیای ڕۆشن دێت
دێتە ناو یەکەم قۆناغی ژیان
ساوا و بێ هێزە کۆرپەیەکی جوان
لەپاش ئەمانە منداڵە و نەزان
بێ خەمە هەتا دە دووانزە ساڵان
پاشان قۆناغی، جوانی و لاویە
قۆناغی ئەشق و هەرزەکاریە
لاویش تێپەڕی نۆرەی پیرییە
پێوەنت ئەکا و ئاگات لێ نییە

بـزانــە پـیـری ســـــەری لــێ داوی
بـۆت دەر ئەکـەوێت کـەوتویتە داوی

بــەوە بـزانــە ســـــەری لــێـتـداوە
ڕوومەت لـۆچ بووە و هـێزت نەمـاوە

نـاتـوانـی وەکــو، جــاران دانیـشـــی
پـاڵ نـەدەیتـەوە و قـاچ ڕانەکـێشـــی

لەپاشی پـیـری و ئـەم هەموو دەردە
جـا وادەی کۆچـە بێ بگـرە و بـەردە[٢٢٩]

هـەرجـۆرێ بژیـیـن ئێـمـە لـەم دونـیـا
لـە کۆشك و تەلار یـان چوڵ و چـیـا

ژیـن کـۆتـایـی دێت ڕۆژێ لــە ڕۆژان
دەکـوژێـتـەوە مـۆمـــی تەمـەنـمــان



کەلار / تەمموزی ٢٠١٧

---

[٢٢٩] واتا: لەدوای قوناغی پیری ئیتر نوبەی مردن و ماڵئاوایە لە ژیانی دونیا.

ئەم شیعرەم باسی قۆناغەکانی دروست بوونی مرۆڤ دەکات کە لە قورئانی پیرۆزدا لە ئایەتی (١٤)ی سوورتی (المؤمنون)دا، هاتووە و فەرموویەتی: ﴿ ثـمَّ خَلَقْنَـا النُّطفَـةَ عَلَقَـةً فَخَلَقْنَـا....﴾ هـەروەها لـە بـارەی دروست بوونی مرۆڤ پێغەمبەر(د.خ) فەرموویەتی: ( إِنَّ أحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُـهُ فِـي بَطْـنِ أُمِّـهِ أَرْبَعِـينَ يَوْمًـا، ثـمَّ يَكُـونُ عَلَقَةً مِثلَ ذَلِكَ، ثمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثلَ ذَلِكَ، ثمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكًا فيُؤْمَرُ بأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، وَيُقَـالُ لَـهُ : اكْتُـبْ عَمَلَـهُ وَرِزْقَهُ وَأَجَلَهُ،..... ) رواه البخاري (٣٢٠٨).

# جیاوازی نێوان

ڕۆژێك دانشــتم لەگـەڵ هەژاری
بینیم لــە ناخی زووخاو ئەباری
وتم: بۆم باسکە باسی یەکسانی
لە ئەو بارەوە هەرچی ئەزانی
جیاوازی نێوان چین و توێژەکان
بەرپرس و هەژار، پلە بالاْکان
وتی: جیاوازی نێوان من و بەرپرسان
من بە شەو و ڕۆژ بێ پشوو و وچان
بە گەرمای هاوین بە سەرمای زستان
هەر هەوڵ ئەدەم، بۆ بژێوی ژیان
ئەو شەو خەریکی بەزم و ڕابواردن
لەگەڵ یارانا خواردنەوە و خواردن
ڕۆژیش تا عەسر بۆ خۆی ئەخەوێ
خۆی شەحن ئەکا دیسان بۆ شەوێ[٢٣٠]
منم: ناو لەپم شەقارشەقارە[٢٣١]
ژیانم تاڵە وەك ژەهری مارە

---

[٢٣٠] خۆی شەحن ئەکا: دەخەوێت و دەحەسێتەوە و خۆی ئامادە دەکات بۆ شەوی داهاتوو.

[٢٣١] شەقارشەقار: شەق شەق بوو (شەقبردوو، قلیشاو)، واتا ناوی دەستم شەق شەق بووە.

منم بێ لانە و ئاوارەی شاران
ئەویش خاوەنی کۆشك و دیوەخان
منم شار بە شار ئەگەڕێم بۆ کار
ئەویش جانتاکەی پڕە لە دۆلار
ئەو چەندین موڵك و بازاڕی هەیە
چەندها دەفتەر دۆلاری هەیە[٢٣٢]
من گشت سامانم هەر دوو دەفتەرە
یەکیان هی زەختە، ئەویتر شەکرە[٢٣٣]
منم ناترسم ڕۆژی تەنگانە
قۆچی قوربانیم بۆم نیشتمانە
منم گیان فیدا بۆ خاکی وڵات
ئەو خێر و بێری ئەم خاکە ئەبات
من شانم کۆڵی قورس ها لەبانی[٢٣٤]
ئەو هەر نەجمە و داڵ ها لەسەر شانی[٢٣٥]

---

[٢٣٢] یەك دەفتەر دۆلار: سەد گەڵای سەد دۆلاریە، کە دەکاتە (١٠٠٠٠) دە هەزار دۆلار.

[٢٣٣] دوو دەفتەر: دەفتەری نەخۆشی فشاری خوێن(زەخت) و دەفتەری نەخۆشی شەکرە کە لە خەستخانەکان دەیکەن بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی ئەو نەخۆشیانە بوون،بۆ وەرگرتنی دەرمان، وە هەروەها زەخت (فشاری خوێن) و شەکرە دوو نەخۆشی درێژخایەنە.

[٢٣٤] کۆڵ: بار. کۆڵی قورس(کۆڵ و باری قورس).

[٢٣٥] نەجمە و داڵ: (ئەستێرە و داڵ) پلەی سەربازیە، یەك داڵ دەکاتە چوار ئەستێرە(ڕائید).

مـن سـالّـێ تـەواو چـاوەڕێ ئەکـەم
هـەتـا بـەهـار بێـت، سـەیـرانـێ بکـەم
ئەو ساڵی چەند جار ئەچێ بۆ سەیران
لـــە بـۆ پـاریس و لـەنـدەن و لـوبنـان
مـن لـــە نـاو قـــوڕ و لـیـتـەیە ژیـنـم
ئـەو ئەڵـێ ئـێـسـتـا مـن لـــە بەرلـینم[٢٣٦]
ئـەگـەر پـێـی بڵـێـی: بـرام وا نـابـێ
ئـەم گـشـت سـامـانـە بـۆ تـۆ تـەنهابـێ
ئەڵـێت: واز بێـنـە لـــەم بۆڵە بـۆڵە
من ڕیشـەم دەرهات، لەو شـاخ و چۆڵـە[٢٣٧]
ئـەزانـی چـەنـــدە خـــەبــاتـم هـــەیـە
ئـەم دەسـتـکـەوتـانـە هـێـشـــتـا نـیـوەیـە[٢٣٨]
تـەمـــەنـی لاوی و ژیـــــانـم هـــەمـــوو
بـۆ تـۆ و نیشـتـمان من لـەکـیـسـم چـوو
هــەژار پـێـی ئەڵێت: گـوێ بگـرە کـاکـە
مـنـیـش ڕەنجـمـدا، بـۆم گـەل و خـاکـە

---

[٢٣٦] بەرلین: پایتەختی فیدراڵی کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتووە.
[٢٣٧] ڕیشەم دەرهات: ماندوو بووم، تێکۆشاوم، (ئەزیەتم کێشاوە).
[٢٣٨] نیوەیە: نیوەی پاداشتی هەوڵوتێکوشان.

مـن هـەرگـیز نـاڵـێم ڕەنـجـت نــەداوە
ڕەنــج و خـەبــاتـت دیـــار و تـــەواوە
بـەڵام خـۆ مـنیش (دەستەبـار)ت بـووم[٢٣٩]
ڕۆژی تـەنگـانـە هـــەر هـاوكـارت بـووم
بــرام جـەنـــابـت خــۆچـــاك ئەزانـی
مـنیش شــەو و ڕۆژ هـەتــا ئەمـتـوانـی
خۆم و (تەراكتۆر) لـە خزمەتـا بـووین[٢٤٠]
كاتێ دێ بە دێ بۆ (جەولـە) ئەچووین[٢٤١]
(درێخیم) نـەكـرد لـــە خـزمـەت كـردن[٢٤٢]
نــامـەی نـهـێـنـی بــۆ نــاو شـــار بــردن
بـە نـــان و قــووتـی مـــاڵ و مـنـــاڵـم
بـە تێكـۆشــانـی چـوار وەرزەی ســاڵـم
(ڕژێم)یش بە تـۆپ ماڵـی ئەڕووخان[٢٤٣]
خـەلـە و خەرمـانـی سـاڵـی ئەسـووتان

---

[٢٣٩] دەستەبار: (هاوكار) ئەو كەسەیە كە هاوكاری كەسێك دەكات بارەكەی لەگەڵدا بار دەكات.
[٢٤٠] (تەراكتۆر): مەوكینەوعەربانەكەم (تەراكتۆرەكەم).
[٢٤١] جەولە: گەڕیان، ڕۆیشتن لەم شوێن بۆ شوێنێكی تر.
[٢٤٢] درێخیم: كەمتەرخەمیم.
[٢٤٣] ڕژێم: مەبست لە ڕژێمی حكومەتی عیراق.

منیش بەشی خۆم ڕەنجم کێشاوە
لە پێناوی گەل تێم هەڵدراوە
لەدوای ئەو هەموو کاولکارییە
خەم و مەینەتی و ئەم هەژارییە
لەدوای ئەنفالی ئەو هەموو کەسەم
هێندە خەم زۆرە، چەنێکی باس کەم
ئەمە بوو باس و بیروبۆچوونم
ئەمە بوو ئێشی ناخ و دەروونم



کەلار / تەمموزی ٢٠١٧

# جەژنی جاران

ئـــــــای، تـــوو خـــــوا یــــاران
چـەنـــــد خـــۆش بـــوو جــــــاران
کـاتـی مـنـاڵـی لـــە ڕۆژی جـەژنـان
جـلـــی تــازەمــان، ئەکـــردە بـەرمـان
یەك دوو پەنجایی جەژنانەی خزمان
لـەگەڵ پێنج فلسـی دە فلسی خۆمان[٢٤٤]
جارجار بۆ خۆشـی ڕاوەشـێن گـیرفان
کـە ئەیدا لــەیـەك، ئەهـات زڕەیـان[٢٤٥]
دوای نـانـی جـەژن لـەگـەڵ هـاوڕێیان
هـەمـوو پێکـــەوە ئەچـوینـە کۆڵان
دواتریـش ئەچوین بۆ شـوێنی یــاری
شـوێنیك بـوو کــە وا کـرابـوو دیـاری
سـواری ئەسـپ و عەرەبانە، ئەبووین
بـە چەپڵەلێدان ئەهـاتین، ئەچووین



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٧

---

[٢٤٤] پەنجایی: پەنجا فلسی، لەگەڵ (پێنج فلسی ، دە فلسی)یش دراوێکی ئاسنی عێراقی بوون.

[٢٤٥] زڕەیـان: زڕەیان (دەنگیان).

# زانا کەسێکە

هـــەر کاتێك زانــا لــەنــاو نـەزانـا
وەك یـــەك دانــرا لـــەنــاو مـیـزانـا[٢٤٦]

هەر کاتێك (دین)یان لـێ بوو بە کـاڵا
دابـەزیـن بـە وەســف بـە شــان و بـاڵا[٢٤٧]

زانــاکــان لـــەبــەر، بـژێــوی ژیـــان
دانیشـتن وەك بەرد هیچیـان نەدرکان[٢٤٨]

لـە ئـاسـتی ڕاسـتی گوێیـان کـرد گـران
ئـەگـــەر وەهــا بـوو حـاڵـی زانـایـان[٢٤٩]

ئـیتـر چاوەڕێی چاکـەی چی ئەکـەی
لە کوێ چاوەڕێی دین لەدەست نەدەی[٢٥٠]

---

٢٤٦ میزان: قەپان(کێشانە).

٢٤٧ مەبەست زانـا و مامۆسـتایانی ئاینیـە ئەگەرئاینیان وەك کاڵایـەك بـە کار هێنا و پیاهەڵدان وەسـف و سەنایی ستەمکاریان کرد.

٢٤٨ ئەگەر زانا و مامۆستایانی ئاینی لەبەر بژێوی ژیان وەك بـەرد بـێ دەنـگ بـوون و هـیچ هەڵویسـتێکیان نەبوو دژی نادادپەروەری و ستەمکاری. وشەی (نەدرکان) واتە: بێ دەنگبوون.

٢٤٩ پاڵپشتی ڕاستیەکانیان نەکرد و لە بیستنی قسەی ڕاست گوێی خۆیان گران کرد (کەڕ کرد).

٢٥٠ ئیتر چۆن چاوەڕێی ئەوە بین بارودۆخی ژیانمان باش بێت و ئاین و بیروباوەڕمان پارێزراو بێت.

زانـا کـەسـێـکـە بـە هــێـز و تـوانـا
ڕاسـتـی قـبـوڵ بـێ، بـە (لار) بڵـێ نـا[٢٥١]

ئـەوە بـــە ڕاســـتـی خــادمـی دیـنـە
ژیان چەند تاڵ بێ لای ئەو شـیـرینـە[٢٥٢]



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٧

---

[٢٥١] لار: بە کاری لار و ناڕەوا بلێ نەخێر (نا).

[٢٥٢] ئەو جۆرە زانا و مامۆستا ئاینیانە بەڕاستی خزمەتکاری ئەم ئاینە پیرۆزەن (ئاینی ئیسلام).

# وا دیسان جەژنە

وا دیسـان جـەژنـە جـەژنی قـوربـانـە
جـەژنـی سـەرانسـەر مـوسـڵمـانـانـە

یاخـوا پیـرۆز بێت لـە هەمـوو جیهان
بە تایبەت خزم و دۆسـت و هاوڕێیان

گـەردنـی هـەمـــووی یـاخــوا ئـازاد بێ
ڕۆژانی ژینتان هەمـووی هەر شـاد بێ

ئـازادکـەن بـەنـدە ئێـوەیـش ئــازیـزان[٢٥٣]
نـەوەك ڕەنجـابوون ڕۆژێ لـــە ڕۆژان

هەر بەخۆشی بێت یاخوا گشـت ساڵێ
شـادی و خۆشی بێت لـە هەموو مـاڵێ



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٧

---

٢٥٣ اتا: ئەی خزم و دۆستان ئێوەیش گەردنی من ئازاد بکەن.

ئەم پارچە شیعرەم وەك پیرۆزبایی بۆ جەژنی قوربانی ساڵی ١٤٣٨ کۆچی / ئەیلولی ٢٠١٧ زایـنی. بـۆ خـزم و دۆست و هاوڕێیانم نووسیوە.

# ئامۆژگارییەك بۆ ڕۆڵەکانم

لەگەڵ ئازیزان، ڕۆژێك لە ماڵا
ئەم پارچە شیعرەم هات بە خەیاڵا

ئەم شیعرەم نووسی بۆ ڕۆڵەکانم
وەك ئامۆژگاری، بۆ دوای نەمانم

وتم ئازیزان ڕۆڵەکانی خۆم
تکام ئەوەیە جوان گوێ بگرن بۆم

ڕۆڵە گوێ بگرن بۆ ئامۆژگاریم
بۆ ئەو وانانەی، کە وا من بینیم

وەسێت بێ ڕۆڵە، ئەگەر من مردم
فەرامۆش مەکەن ئەم قسەی کردم

یاسین، محەمەد، سۆران، تۆ ئەڵێم[٢٥٤]
لەگەڵ ئێوەمە جوان گوێ بگرن لێم

جوان گوێ بگرن لێم هەمووتان ڕۆڵە
هەرگیز هەوڵ مەدەن بۆ ڕق و تۆڵە

---

[٢٥٤] یاسین و محەمەد و سۆران: ناوی کوڕەکانی بەندەیە، ئەم شیعرەم وەك وەسیەت و ئامۆژگاریەك نووسیویە بۆ ڕۆڵەکانم (منالەکانم)، ئامۆژگاریەکی گرنگیشە بۆ نەوەکانیتریش.

لـێبـوردن چاکـە، هــەر لـێبـووردە بـن
بـە قسـەی نەفـام هـەرگـیز هـەڵ مەچـن

لـە کـۆڕ و کـۆمـەڵ، کـاتـێك دانیـشـــتـن
جـارێ هــیچ مـەڵـێن، تەنـهـا گـوێ بگـرن

هـەتـا ئەتـوانـن، چی زۆر بێ و چی کـەم
یــادی خــــوا بـکــەن، بـە دڵ و بـە دەم

قـسـەی کـەس مـەبـڕن گـەورە تـا مـنـاڵ
لـەهـەر جێگـایەك کـۆمەڵ بێت یـان مـاڵ

بـاسـی خــراپـەی هــیچ کـەسـێ مەکـەن
(تانەوتەشەر)یش لــە هــیچ کەس نەدەن[٢٥٥]

زۆر چـاك گوێ بگـرن لـە بۆ قسـەی چاك
خاکی بن هەموو بێ دەنگ بن وەك خاك

ڕووخـۆش بن لـەگـەڵ، هـەمـوو کـەسێکـا
ڕوودرژ هــیچ کـەســێ، حــەزی لـێ نـاکـا

زۆر چـاکـەکاربن، لـەگـەڵ گـشـت کـەسـێ
بـە تـایبـەت خــزم و دۆســـت و دراوســێ

---

[٢٥٥] تانەو تەشەر: قسەی نەشیاو و سووکایەتی کردن و بەکەم زانینی کەسانیتر.

لــە کاتـی ســەودا و بـەیـع و مەعـامەلـە[٢٥٦]
زۆر لــەسـەر خـۆ بن هــیـچ مەکـەن پەلـە

کـاتـێـك فـرۆشــتـان، شــتـێـك بـە یـەکـێ
چـی عـەیـبـی هـەیــە هــەمــوو پـێ بـڵــێ

بــاکــو حــەڵاڵ بـێـت، ڕزق و ڕۆزیــتــان
هـەوڵـی بـۆ بـدەن، بە ڕەنـجـی سـەر شـان

چـاوتـان لــە رزق و ڕۆزی کــەس نـەبـێـت
ڕازی بن بـەوەی، کــە خــوا دایـوە پـێـت

دەربــارەی خــاك و گــەل و نـیـشــتـمـان
هـەرگـیز سـڵ مەکەن لـە مـردن بـۆیـان[٢٥٧]

دەرحـەق بـە خــاکـی ئـەم نـیـشــتـمـانـە
ســیـخــوڕی نـەکــەن قــەت بـۆ بێـگــانـە[٢٥٨]

خــاکـی نـیـشــتـمـان ڕۆڵــەکـانـی مــن
شـەرەفـە هـەرگـیز نـەیـدەن بـە دوژمــن

---

[٢٥٦] سەودا و بەیع و مەعامەلە: کڕین و فرۆشتن.

[٢٥٧] سڵ مەکەن: نەترسن، واتا: هەرگیز لە مردن نەترسن لە پێناوی خاك و گەل و نیشتماندا هەمیشە گیان فیدابن بۆ خاك و گەل و نیشتمان.

[٢٥٨] سیخوڕی: جاسووسی، واتا هەرگیز سیخوڕی (جاسووسی) نەکەن بۆ بێگانە دژی خاکی نیشتمان.

مەبنە پیاوی کەس، هەتاکو ماون[٢٥٩]
گەر بەم شێوە بن، بە ڕاستی پیاون

لەتێك نانی وشك، لەگەڵ قومێ ئاو
بیخۆن باشترە، لە پلاوی ناپیاو[٢٦٠]

ئەگەر بەم شێوەی کە ئەڵێم پێتان
هەڵسووکەوت بکەن من ڕازیم لێتان

ئیتر ئاسوودەم، لە کاتی مردن
هیچ پەشیمان نیم، پەروەردەم کردن



کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٨

[٢٥٩] مەبنە پیاوی کەس: مەبنە خزمەتکار و کۆیلە و ئەڵقە لە گوێی هیچ کەس و لاینێك.
[٢٦٠] پلاوی ناپیاو: چێشت وسفرەوخوانی کەسانی نامەرد و ناپیاو، (پلاو)یش واتاچێشتی برنج.

# دز جۆری زۆره

دز هـەیـە دزی مـاڵ و سـامانـە
دز هـەیـە دزی وتـەی جـوانـە

دزی وا هـەیـە لـە فەیسـبووکا[٢٦١]
هەر بابەتی جوان لەهەر شوێنێکا

بەرچاوی کەوێت جوان کۆپی ئەکا
زۆر ئـاسـایـە و هـیـچ شـەرم نـاکا

نـاوی خاوەنی، بێ ئـاگای لـێ بێت
ئەیسڕێتەوە و ناوی خۆی دائەنێت[٢٦٢]

نـاوی خـاوەنی لائەبـات بـێ خـەم
لۆگۆ و نـاوی خـۆی دائەنـێ کـاکـەم

زۆر بـێ شـەرمانـە دایـدەبـەزێنێ[٢٦٣]
لای هـاوڕێکـانی خـۆی پـێـدەنوێنێ

---

٢٦١ فەیسبووك: یەکێکە لە بەرنامەکانی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان لە ئەنتەرنێتدا.

٢٦٢ واتا: ناوی ئـەو کەسـەی نووسـەر و خـاوەنی بابەتەکەیـە دەسڕێتەوە و نـاوی خـۆی بـە سـاختە لەسـەر بابەتەکە دەنووسێت و دادەنێت و خۆی دەکات بە خاوەنی بابەتەکە.

٢٦٣ دایدەبەزێنی: پۆستی دەکات (بڵاوی دەکاتەوە) لە فەیسبووك و تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان.

هەتا پێی بڵێن چەند دانا و ژیرە
چەند بلیمەتە، چەند ڕۆشنبیـرە[٢٦٤]

من ئەم بابەتە بۆیـە بـاس ئەكـەم
ئـامۆژگـاریـە بـۆ ئـێـوە و بـۆ خـۆم

بـرای بەڕێـزم، خوشـكی شـیـرینم
پێنووس هەڵگـرە و ئادەی بتبینم

هـــەرچـی ئەزانی ئـەوە بنـووســە
باهیـچ كەس نەڵێ هی فلان كەسە



كەلار / كانونی یەكەمی ٢٠١٨

---

[٢٦٤] چەند بلیمەتە: چەند بە توانا و لێهاتووە.

ئەم شیعرەم دەربـارەی ئـەو كەسانە نووسـیوە كە لـە فەیسـبووك و تـۆڕە كۆمەڵایەتیـەكانی ئەنتەرنێتـدا، بابەتی وەك ( نووسین، وتـە، شـیعر، ....هتـد) كەسـانی تـر زەوت دەكـەن بـە سـاختە نـاو و لۆگـۆی خۆیـانی لەسەر دادەنێن دەیكەن بە هی خۆیان.

# تەمـەن دارێکـە



ڕۆژێ لــە ڕۆژان هـەروا بـە ڕێکـەوت
وێنەی درختێك من بەرچـاوم کـەوت

درخـت دارێکی گـەورە و سـێبـەردار
دووچاری تـیـری جـەفـای ڕۆژگــار

کاتێ ئـەم دارەم، من کـەوتە بەرچاو
لایـەکی ســــــەوزە و لایـەکی ڕزاو

تـەمـەنـی دونـیــا، مـــردن و ژیــان
بە خـەیـاڵی خۆم بـەم دارەم شوبهان

تـەمـەن دارێـکـە، ڕۆژێ لـــە ڕۆژان
وا هەڵدەوەرێت بـە سـووك و ئـاسـان

هـەتـا لـــەم دونیـا مـاویـت و ئەژیـت
هـەر چاکەکـاربـە، هـەتاکو ئەمـریـت

بـا کاتێ مردی، دونیـات بەجێهـێشت
بـا بـاسـی چاکـە و پیاوەتیت بکـرێـت

بـۆیـە وەکـو مەرد ڕێگای چـاك بگـرە
بـە مـەردی بـژی و بـە مـەردی بمـرە

بـا خەڵکی نەڵێ، نەفرەت لـە گۆڕی
ئۆخەی ڕزگاربووین لە زوڵم و زۆری



کەلار

# لێیان پرسیم

چی فێربووی لەو تەمەنەی کە ڕابوورد
وتم ئـەوەی فـێربـووم و هەســتم پێکرد

کـە هـەر کـەسێك، کانزاکـەی زێـڕ بێت
هـەر بـە زێـڕی ئەمێنـێتەوە و ناگۆڕێت

بـەڵام ئـەوەی کــە زێـڕ نەبێت ئەڕزێت
ڕۆژگـــــار ئەیگۆڕێت و ژەنگ ئەگـرێت

زۆر شــتێك هــەیـە، وەکـو خـوێ وایـە
زیـــادی لـێ بـوخـرێـت، دەرد و بـەڵایـە

وشـەی وایش هەیـە پیتێك زیاد بکرێت
مـانـای وشـەکـە هـەمـووی تێـکدەچـێت

شـیـرینـە لـەلام وشــە و قـســەی حـەق
فـێنـکـە لــەلام وەك شــنـەی شـەفـەق

پیـتی (دال) مەخـە، سـەر(حق) وریـابـە[٢٦٥]
لـەگـەڵ گـشــت کـەسـێك وەکو بـرابـە

---

[٢٦٥] حق: ڕاستی (حەق)، لە زمانی عەرەبیدا وشەی (حق) ئەگەر پـیتی (دال)ی بـۆ زیـاد بکرێت (حـق + د) وشەکە دەگۆڕێت و دەبێتە (حقد)، وشەی (حقد)یش واتا: بوغز ( ڕق و کینە).

ئـەگـەر زيـادى كـەى ئەبێت بـە (حقد)[٢٦٦]
حقد خـراپـتـرە لـە سـەد ئێـش و دەرد

تـەمـەن پـڕيـەتى، لـە تـاڵى و خـۆشـى
بـە دەس خـۆت نـييـە ئەبێت بينـۆشـى

ديـمـەنى بەهار، لـەگـەڵ كـانى و ئـاو
وەك زسـتان سـەختە بـۆ كـەسـى داماو

دوو كـۆڕ و كـۆمـەڵ زۆر بـێ بـەهـايـە
يـەكـەم، كـە بينيـت ژن تيـا كوێخايـە[٢٦٧]

دووهەميان، كـە پيـر تيا بێ بەها بێت[٢٦٨]
دەم ڕووت پێشەوا و ئاغا و كوێخا بێت

* * *

كەلار

[٢٦٦] حقد : بوغز (ڕق و كينە).

[٢٦٧] ژن تيا كويخايـە: لە هەر كۆڕ و كۆمەڵێكدا بڕيار و فەرمان بەدەستى ژنان بێت (ژن تيـێ دا كويخا بێـت و پياوانيش بێدەسەڵات بن).

[٢٦٨] كـە پيـر تيـا بێ بەها بێ: هەر كۆڕو كۆمەڵێك كە ڕێزى كەسە بـە تەمەنـەكانى تێـدا نـەگيرا و كەسـانى مناڵ و هەرزە و دەم ڕووت پێشـەوا و خاوەنى قسە و بڕيار بن.

# لەگەڵ کۆرۆنا

(کۆرۆنـا) کـێـیـە، لـــە تـۆ نـاتـرسـێ؟[٢٦٩]
وەرە پـێـم بـڵـێ کـێـیـە، چی کـەسـێ؟

ڕێگات بڕیوە ئەم خەڵکە چی بکات؟
هـەرووەك جانـەوەر ڕووت کـردە وڵات

نە شـادی ماوە، نە گەشـت و سـەیـران
میللـەتت هەموو کـردووە سەرگەردان

کـۆرۆنـــا دەبـــڕۆ، لــــێـرە مـەمـێـنـە
واز لـــە ئـەم خـەڵـکـە، دامـاوە بـێـنـە

(کەریم) چی ئەڵێی ئەم قسە چیە
چوونم بۆ هەرکوێ بەدەست خۆم نییە

کـێ ئەڵێت ئـەگـەر، مـن نـەهـاتـمـایـە
ئـەم وڵاتـەی تـۆ جـێی شـەڕ نـەبـوایـە

---

[٢٦٩] کۆرۆنـا: نـاوی ڤایرۆسـی پەتایـەکی کوشـندەیە ناسـراوە بـە (کۆڤیـد ١٩) کـە بـۆ یەکـەم جار لـە شـاری (ووهان)ی وڵاتی چین سەری هەڵدا، دواتر بڵاوەی کرد بـە زۆربـەی وڵاتـانی جیهانـدا و بـووە هـۆی مردنـی خەڵکانێکی زۆر، بەوە هۆیەوە زۆربەی وڵاتان قەدەغە کردنی هاتووچۆیان ڕاگەیاند و خـەڵکیان ناچار کـرد کە لەماڵەکنیاندا بمێنینەوە.

من ڤایرۆسێکم لە چین دروست بووم
بەڵام دواتریش بۆ زۆر وڵات چووم

تۆ زۆر بێ ئاگای لە (ئیغوور)ی چین[٢٧٠]
چی ئەکەن لەوێ کەسانی بێ دین

یان موسڵمان لە وڵاتی بۆرما
چۆن ئەناڵێنن لەژێر ستەما

لەسەر ڕووی زەوی بێ دینی و فەساد
قورئان سوتاندن، بیرۆکەی ئیلحاد

چەوسانەوەی خەڵك بە هەموو شێوە
لەنێو دونیادا پەرەی سەندووە

لە دوای ئەمانە ئەتەوێ چی بکەم
خوا من نەنێرێ و سەریان لێ بدەم؟

فەساد و ستەم لە هەر چی شوێنێ
(مەی و سوو) خواردن پەرە بسێنێ[٢٧١]

---

[٢٧٠] ئیغوور: (هەرێمی ئیغوور) لە ئێستادا هەرێمێکە لە وڵاتی (چین) موسڵمانانی ئەم هەرێمە ڕووبەڕووی ستەم و ئەشکەنجە و ئازارێکی زۆر دەبنەوە لە لایەن وڵاتی (چین) و کاربەدەستانی.

[٢٧١] مەی و سوو: ئارەق و ریبا، واتا مەی و ریبا خوارن بڵاو ببێتەوە.

ئەچم بۆ ئەوێ لێرە نامێنێم
من سەربازێکم بێ شوێن و بێ جێم

هەر چەندە کێشم زۆر بێ بەهایە
بەڵام شێوازم وەك تاجی شایە[٢٧٢]

جیاوازی ناکەم لەگەڵ هیچ چینێ
کێشە ئەوەیە خەڵکی نامبینێ

پێویستیم نییە بە نان و بە ئاو
هێندە بچووکم نابینرێم بە چاو

بەڵام تا بڵێی من زۆر کووشندەم
لای کەسی تەمەڵ زوو گەشە ئەکەم

تاکە چارەسەر، کە دژی منە
پاکوخاوێنی و زۆر دەست شۆردنە

بەرامبەر (سابون) من زۆر زەبوونم
هۆکارێ چاکە، بۆ لەناو چوونم

هیچ پێویست ناکات هێندە بترسیت
ئەوەند باسوخواس لە من بپرسیت

---

[٢٧٢] شێوازم وەك تاجی شایە: شێوەی ڤایرۆسی کۆرۆنا وەك شێوەی تاج وایە (تاجی سەری پاشاکان).

پـاکـوخـاوێـنـی خــۆت جـوان ڕاگــرە
خــۆت بـپـارێـزە و دەســتـت بـشــۆرە

هـەتـا ئەتـوانـی لـــە مـاڵ مـەچـۆدەر
مەچۆ دەشت و دەر بۆ گەشت و سەفەر

لـە مـاڵ دانیشــە هەتـا بـۆت ئەکرێت
کەسیش بێ ئەمـری خواوەند نـامرێت



کەلار / ٢١ / ٣ / ٢٠٢٠

# ماموستا کێیە

وەرە پێت بڵـێـم مـامـۆسـتـا کـێـیـە
بـەرز و بـەڕێـزە لـە هـەمـوو جـێـیـە

کـەسـێك ئەوەنـدە بـەرزو بـەڕێـز بێت
خاوەن زانست و دەروون پڕ سۆز بێت

هـەر لـە ئەلفوبێـی زمـانـی کـوردی
دۆی دادە و دارا دوو دارەکـەی دی[٢٧٣]

بیـرکاری و زانست هەمووی فێرکردی
قۆنـاغ بـە قۆنـاغ زۆر جـوان بـە وردی

پێـویـسـتـە کـە وا دەسـتـی مـاچ بکـەی
نـەك جیـاتـی پاداشت شەقی تێهەڵدەی



کەلار / ئازاری ٢٠١٨

---

[٢٧٣] دوو وانەیە لە کتێبی ئەلفوبێی کوردی پۆلی یەکی سەرەتایی.
ئەم شیعرەم بەناوی (مامۆستا) بۆ ئـەو خۆپیشاندان و گرژی و ناڕەزایـە نووسیومە کە دروست بـوو دژی پاشەکەوتی موچە لە ٢٥ی ئازاری ٢٠١٨ ، کە هـەر لـەو ڕۆژەدا مامۆستایەك لەلایـەن دوو کەسـەوە بەشـەق لێی درا، ئەو ڕووداوەش کاردانەوەی توندی مامۆستایانی لێکەوتەوە.

# هاوڕێیەکی خۆم

هاوڕێیەکی خـۆم ڕۆژێ هـات بـۆ لام
دوای چاکوچۆنی و مەرحەبا و سـەلام

وتـی: حـەز ئەکـەم مـن خـۆم بنـاسـم
کـەسێکی چۆنـم، خـراپ یان خاسـم

وتـم: ئەتـەوێت ڕاسـتیت پـێ بـڵێـم
هەرچەند بۆی هەیە دڵگران بی لـێـم

بـەڵام بـۆ ئـەوەی بـاش خـۆت بنـاسـی
بـزانـی چـۆنـی، خـراپ یـان خـاسـی

هیچ پێویست ناکات کە من بڵێم پێت
بـە گوێرەی ڕۆژگار بـۆت دەرئەکەوێت[٢٧٤]



کەلار / کانوونی دووهەمی ٢٠٢٠

---

[٢٧٤] بە گوێرەی ڕۆژگار بۆت دەردەکەوێت: ڕۆژگار سـەنگی مەحەکـە بـۆ ناسـینی خەسـڵەت و خووڕەوشـتی مرۆڤەکان، ڕۆژگار چاك و خراپ ئاشکرا دەکات.

# ژیان سێ ڕۆژە

ئـەم ســـێ ڕۆژەیـە ژیـــان[٢٧٥]
ئێـمـە دڵـخـۆشـــین پێـیان

دۆێنێ بوو لە کیسمان چوو
کــە وا بــوو بـە ڕابــوردوو

ئەمڕۆیش کـە تێیدا ئەژین
بـە پـارە و مـاڵ سـەرقاڵین

ســبـەیش کــە وا نــازانین
ئەمـرین یان لـــە ژیـانین

دونیـایەك کــە ئـاوا بێت
تـام و چێـژی چی تیـا بێت

* * *

کەلار / کانونی دووەمی ٢٠٢٠

---

[٢٧٥] واتـا: ژیـان هـەمووی وەك سـێ ڕۆژ وایـە (دوێـنی، ئـەمرو، سـبەی)، ڕۆژی یەکـەم ئـەو تەمەنەیـە کـە تێپەڕیووە و بوو بە ڕابوردوو، ڕۆژی دووەمەیش ئەو تەمەنەیە کە ئێستایە تێیدا دەژیـن، ڕۆژی سـێیەمیش تەمەنی ئایندەیە کە داهاتووە، تەنها خوا دەزانێت چی تێدا ڕوودەدات.

# گا شێت و پاڵەوان

پاڵـەوانێـکی بـە هـێز و دەســـڵات
ڕۆژێکیان بینی گایە شـێت بۆی هات[٢٧٦]

پاڵـەوان هـەتـا تـوانی هـەڕای کـرد
خەڵـکانێکی زۆر لـۆمـەیان ئەکـرد

وتـیـان پـاڵـــەوان، تـۆ پـاڵـــەوانـی
بەرامبـەر ئـەو گا بـۆ چـی نەتـوانـی

دەی پێـمـان بڵـێ هۆکاری چـی بـوو
بـۆ چـی وا ڕاتـکـرد ئـارامـت نـەبوو

پـاڵـــەوان وتـی: مـاڵـــی وێـرانـم
گا کـەی ئەزانـێ مـن پـاڵـــەوانـم

❋ ❋ ❋

کەلار / ٦ / ٤ / ٢٠٢٠

---

[٢٧٦] گایە شێت بۆی هات: (چێل) گایەکی هار و سەرکەش بەلاماریدا، ڕووبەڕووی هات، ئەو پاڵەوان و کەسە بە توانا و بە هێز، پێدەچێت (عەنتەری کوڕی شەدداد) بێت.

# پەتای کۆرۆنا

خــوایـە هــاوارە لـــە ئـەم ئـافـاتـە
هــەر بـاسـی ئـەوە لـــە چـی وڵاتـە

دەســتـان بشـۆرن، دەمـتـان داپێـچن
دانیشن لە ماڵ، بۆ هـیـچ کۆی مەچن

لـــە مـاچـومـوچ و تـەوقـە وازبـێـرن
هــەر لـــە دوورەوە ســـڵاو بـنـێـرن

وازبێـنـن ئـیـتـر، مەچن بـۆ (تەعزێ)[٢٧٧]
بـۆ ڕەشـبـەڵـەك و بەزمـی هەڵـپەڕكێ

بـەینـێ واز بێـنن لــە ئـەم ڕەفـتـارە
مـەڵـێـن نـەورۆزە و كـاتـی بـەهــارە

چـونكـــە بـڵاوە دەردێـكـی ئـــاوا
خۆت بپارێزە پشت ببەست بە خـوا

هیچ پێویست ناكا بۆ سەردان بچین
موبایـل هەیـە بـۆ هـەواڵ پرســین

---

[٢٧٧] تەعزێ: پرسە مردوو (تەعزیەیی مردوو).

کـۆ مـەبـنـەوە لــــە مــاڵ و کـۆڵان
بۆ بەزم و یاری و دۆمینە و کۆنکان

لـە جیاتی ئـەوە ویـردی خـوا بکـەن
کـات زۆر گرنگـە بـە فـیڕۆی مـەدەن

خـۆت بـپـارێـزە لــەم بـەڵا و دەردە
پـەتــای کـۆرۆنـا (کـۆڤـیـدی نـۆزدە)[٢٧٨]

بـڵـێـین خـوایـە تـۆی پشـت و پەنـا
ڕزگـارمان بکـەی لـە دەست کـۆرۆنـا

❋ ❋ ❋

کەلار / ١٣ / ٦ / ٢٠٢٠

---

[٢٧٨] کۆڤیدی نۆزدە: ( کۆڤیدی ١٩ ) ناوی فەرمی نەخۆشینی کورۆنایە.

# چاكە و خراپە

حەیفـە بـۆ ئێمـە هێندە دامـاو بین
وا بـە ئـاسـانـی گـیـرۆدەی داو بین[٢٧٩]

هەرچییەكمان بیست بڵێین وەهایە
بڵێین هەرهەمووی خەتای دونیایە

دونیـا چـی بڵـێ خـەتـای خـۆمـانـە
هـیـچ نـەگـۆڕاوە هـەر وەك جارانـە

دین وەهـا نـاڵـێ، تـۆزێـك وریـابـە
بە دەسـت خـۆمانـە چاكـە و خراپـە

خـــودا دایـنـاوە، دوو ڕێـگـا دیـــارە
یەكێكیان ڕاسـتـە و یەكێكیان لارە

ڕێگەی ڕاست ڕێگەی بەختەوەرییـە
ڕێگەی لار و خـوار دەردە سـەرییـە[٢٨٠]

---

[٢٧٩] واتا: زۆر جێگەی داخە كە ئێمەی مرۆڤ هێندە خۆشباوەڕ بـین (بـە ئاسانی بـاوەڕ بكـەین بـە هـەموو قسە و باسێك).

[٢٨٠] ڕێگەی ڕاست: ڕێگەی چاكە و چاكەكاریە كە دەبێتە هۆی بەختەوەری بۆ مرۆڤەكان،
ڕێگەی خوار و لار: ڕێگەی خراپە و خراپەكاریە كە دەبێتە هۆی دەردەسەری بۆ مرۆڤەكان.

ستەم زاڵ ببێ لە هەر شوێنێکا
نیفاق و فەساد گەشەی تیا ئەکا

لەسەر ئەم دونیا هەرچی ڕوو بدا
لە شەڕوشۆڕ و لە کاری بەدا[٢٨١]

بەردێك لە ئاسمان بکەوێتە خوار
بدات لەسەری داماو و هەژار

من ئەڵێم دەستی ستەمی تیایە
چونکە ستەمکار دوژمنی خوایە



کەلار / ٥ / ٨ / ٢٠٢٠

---

[٢٨١] کاری بەد: کاری خراپ (خراپە کاری) وشەی (بەد) واتا: خراپ.

# خەسڵەتەکان

مەرد بە پیاوەتی
نەك بە سەروەتی

ژن شەرم و شکۆ
نەك چاو و برۆ

پیاو بە ڕاستگۆیی
نەك درۆی قەویی

دیوەخان بە نان
نەك درێژ و پان

گەورە و شەهامەت
نەك شان و شەوکەت

خەسڵەتی جوان
نەك هەڵە و تاوان

بەڵێن و پەیمان
نەك ماڵ و سامان

زانـــا بـە زانـســـت
نـەك نـەزان و پەســت

مــرۆڤ بـە ڕەوشـــت
نەك بە دەست و مشت

❋ ❋ ❋

کەلار / ٢٥ / ٨ / ٢٠٢٠

# ئای چەند ڕقمە

ئـای چەنـد ڕقمـە لـە سـیاسـەت
لـە گـەنـدەڵـی و نـاعـەدالـــەت

ئـای چەنـد ڕقمە، لـە کەسانـێ
هـێـنـدە گەوج بـێ، کـە نـەزانـێ

بــەردێ لــەســەر بــەردێ دانـێ
هـێـنـدە تەمـبـەڵ بـێ نـەتـوانـێ

تـێـبکـۆشـی بـە شـــان و بـــاڵ
بـۆ بـژێـویـی مـــاڵ و مـنـــاڵ

ئای چەند ڕقمە من لە چرووك
لــە کـەسـانی ڕەزیـل و سـووك

ئای چـەنــد ڕقـمـە، لــە درۆزن
بـێ جیـاوازی پیـاو بـێ یـان ژن

ئای چەند ڕقمە، من لە دووڕوو
ئای چەنـد ڕقمە، من لـە جادوو

ئای چەند ڕقمە لە منالێ
باوکی لە دەستی بنالێ

ئای چەند ڕقمە لە ماستاوچی
چاکەت تەکێن، ئاژاوەچی

ئای چەند ڕقمە لە بێ پەیمان
لە کەسانی هەرزە و دووزمان

هێندەی ئەم هەموو ڕقانە
ڕقمە لەوەی، بێ ویژدانە



کەلار / ١٢ / ٨ / ٢٠٢٠

# قسەیەکی خۆش

با کەمێك لادەین لـە خەم وخەفـەت
قسەیەکی خۆش بکەین بۆ سوعبەت[٢٨٢]

ڕۆژی کـابـرایـەك وتـی بیسـتـوومـە
ئیـتـر نـامێنـی ئـەم پەتـا شـوومـە

وتی بـەم زوانـە لـە هـەمـوو شـوێـنێ
پـەتـای کـۆرۆنـا نـاوی نـامێـنێ[٢٨٣]

وتـم پێـم بڵـێ، سـەرچاوەت چییـە
وتـی ژنـانـی گـەڕەك وتـوویـە

هەموو بـە کۆی دەنگ بڕیاریان داوە
پـەتـای کـۆرۆنـا وادەی نـەمـاوە



کەلار / ١٠ / ٩ / ٢٠٢٠

---

٢٨٢ سوعبەت: گاڵتەوگەپ (بۆ خۆشی)

٢٨٣ پەتای کورۆنا: ( کۆڤیدی ١٩ ) نەخۆشینی و پەتایەکی مەترسیدار بوو.

# سیاسەت چییە؟

ژنێك لـە پیاوی خۆی ڕۆژێ پرسی
وتی: پێم بڵـێ، سیاسەت مانای چی؟

- پیاو:

وتی لـە بیـرەتە پێش هاوسەرگیری
چەند بەڵـێنم دا، هـیچم هـێنا دی؟

- ژن:

وتی نـەوەڵڵا هـێشـــتا چـاوەڕێـم
وەڵامی ڕاســتیت ئاشـکرا بوو لـێـم

بـەڵام ســیاسـەت جـاران وا نـەبـوو
ســیاسـەتـمـەدار کـەسـی دانـا بـوو

ســیاسـەت ئـێسـتا، وای لـێـهـاتووە
بـەڵام خـۆ جـاران، وەهـا نـەبـووە

جـاران بـە کـەسـی دانـا و قسـەزان
چارەسەرکەری کـێشـەی دوو نێوان

پێـیـان ئەوتــرا، ســـیـاســـەتـمـەدار
ئاکاریان جوان بـوو بـە کاروکـردار

بـەڵام ئێستاکە خەڵکی لـێی پەسـە
ســـیـاســـەت واتـە: درۆودەلـــەسـە



کەلار / ٢٥ / ١١ / ٢٠٢٠

# بە خەیاڵ بینیم

بـە خەیـاڵ بـینـیـم من لـــە جێگایەك
دوو کەس دانیشتبوون هەریەك لەلایەك

ڕووت و ڕەجاڵ و دەسـت و پێ بەسـراو
سەرکز و بێ هـێز، ڕەنگ زەرد و دامـاو

وتـم: بـە یـەکـیـان بـرا خـەڵـکی کوێی
تـۆ نـاوت چـییـە، لـە کوێ نیشـتـەجێی؟

وتی: مـن مـاڵـم ها لـە گـشـت شـوێـنێ
چـی مـــرۆڤـ هـەیـە نـــاوی مــن دێـنێ

نـاوم: (ویژدانە) گشت کـەس ئەمناسێ
بـەڵام هـیـچ کـەسێ، لـــە مـن نـاپرسێ

وتـم: بـــەویـتــر، تــۆ نـــــاوت چـیـیـە؟
بــۆ وا دامـــــاوی و، چــی هــۆکــارییـە؟

بـۆ چـی بـەم جــۆر پـێـوەنـد کــراوی
بـۆ چـی وا دیـــل و گــــــیـرۆدەی داوی

بـۆ چ وا بـێ رەنـگی، بـۆ چی وا کـپـی؟
ئـاخی هەڵکێشـا و هـاتـە جـواب وتـی:

مـن: (دادپـەروەری)م، مـن جاری جاران
جێی شـانازی بووم لای شـاه و سـوڵـتان

بـەڵام مـن ئێـســتـا پێـشـــێل کـراوم
لـە هەموو شـوێنی بـەس بـە نـاو ماوم

وتـم: خــەم مـەخـۆن ژیــان بـێ ئـێـوە
هـیچ مـانـای نـییـە و تـاریکـەشـــەوە

لـــەو ســـاوە ئـێـوە بـاوتـان نـەمـاوە
ژیــان زۆر تـاڵــە، خەڵکێش دامــاوە

خـەڵکی بـێ ئـێـوە ژیـانـی تێکـچـووە
کـەشـتی شــادیان نـوقـمـی خــەم بـووە



کەلار / ١٣/ ١٢ / ٢٠٢٠

# نان و دیوەخان

ڕۆژێ ڕێـبوارێ هــەژار و شـەكـەت[٢٨٤]
ڕێی کەوتە ماڵێ گـەورە بەرِێکـەوت

زۆر دانیشت کە چی هیچ دیار نەبوو
نە سفرەوخوان نە فەرموو فەرموو

لـە پاشی بەینێ هەڵسا پێ میـوان
پـێـوای درێـژی و پـانـی دیـوەخـان[٢٨٥]

خاوەن مـاڵ سـەری لـەم کارە سـورِما
وتـی: بـە مـیـوان، پێـم نـاڵـێی بـرا

بـۆ چـی ئـەیـپێوی ئـەم دیـوەخـانـە
خـۆ بـچـووك نـییـە، زۆر فـراوانـە

وتی: ئـەمـەوێت مـنیـش لـەمـەودوا
دروسـتـی بکـەم دیـوەخـانێ وا

---

٢٨٤ شەکەت: ماندوو.

٢٨٥ پێوای: پێوانەی کرد، واتا: درێژی و پانی ژووری دیوەخانەکەی پێوانە کرد.

لـەم شـیعرەمدا مەبەسـتم ئەوەیـە: کـە گـەورە و فراوانـی مـاڵ و دیوەخـان مـەرجی سـەرەکی نییـە بـۆ بەخشندەیی و خانەدانی، بەڵکو میوان دۆستی سفرە و خوان مەرجی سەرەکییە.

خاوەن ماڵ وتی تۆ چۆن ئەتوانی
دیوەخان دانێی وا بە ئاسانی

وتی: پێت بڵێم بە بێ دڵ ئێشان
دیوەخانی وا، بێ خوان و بێ نان

بۆ هەموو کەسێ سووك و ئاسانە
بۆ چی ناتوانم، لە کوێ گرانە

❋ ❋ ❋

کەلار / ٢٦ / ٧ / ٢٠٢١

# دەس کە شکا

هــەر لــە کۆنـەوە وتـراوە و ئەوتـرێ

دەس کـە شـکـا، ئەبێ مـل هـەڵـی بگـرێ

داری بـێـبــەر، بـێ شــك ئـاســوودەیـە

بـەڵام داری بـەرداره بەردی تێـدەگیـرێ

****

دەسـتێ دەمی سـتـەمکـاری پێ نەکوتـرێ

حەیفە بـۆ مـل، کـە لـە ئەسـتۆی بگـرێ

داری بێبەر بێجگە سێبەر چییە سوودی؟

بۆیـە ئەبێ هـەر بسـووتی و ئاگـر بدرێ



کەلار / ئابی ٢٠١٧

# کەسێکم ئەوێ

کەسێکم ئەوێ دەرد تیمار بکا
خزمەتی گەلی دەردەدار بکا
خۆی بە بچووکی هۆزی بزانێ
نەفرەت لە چینی ستەمکار بکا
****
خۆی بە ئاغا و گەورە نەزانێ
منیش بە کۆیلە و خزمەتکار دانێ
حاشا من کەسی وەهام هەر ناوێ
ئەو پلاو بخوا و من نەمبێ نانێ
****
کەسێکم ئەوێ دڵسۆز و ئازا
کاتی تەنگانە هەر وەکو برا
ڕۆشن کا لە بۆم شەوی تاریکم
بۆ ڕێگەی دوورم ببێت بە چرا



کەلار / ئابی ٢٠١٧

# دووڕوو

کەسانی دووڕوو هەموو کات ڕسوان[٢٨٦]
سەرشۆڕی دونیا و بەردەرگای خوان
کاتی کە دیار نیت وەك مار ئەتگەزن[٢٨٧]
بەڵام ڕوو بەڕوو پێت ئەڵێن قوربان

****

هەر وەکو ڕێوی بە مەکر و نازن
لە فرتوفێڵا یەکەم فێڵبازن
گورگێکی درن لە پێستی مەڕا
ڕەفیقی قافڵە و شەریکی دزن



کەلار

---

[٢٨٦] واتا: مرۆڤی دووڕوو (منافق) هەمیشە ڕسوا و سووك و بێ نرخە.

[٢٨٧] وەك مار ئەتگەزن: کە دیار نەبیت بە خراپە باست دەکەن (غەیبەتت دەکەن).

# یەکی ئایار

پەیـامی من بـۆ تـۆ، ئـەی کاکـی کرێکـار
تـۆ شـایەنی زۆر زیاتری لـە یەکی ئایـار[٢٨٨]
یـادی تێکـۆشـانت، دژی چـەوســانـەوەت
شـکـۆدار و پـیـرۆز بێـت هـەزاران جـار
****
قوربانی شەقارشەقاری لەپی دەستت بم
قوربـانی تـوانـا و سـۆز و مەبەسـتت بم
نـانی ڕەنجی شـانی تۆ، دەرمـانـە بۆ دەرد
قوربانی پێڵ و پاچ و هێز و هەستت بم



کەلار / ١ / ٥ / ٢٠٢٠

---

٢٨٨ یەکی ئایار: (یەکی مایو) ڕۆژی کریکارانی جیهانە.

# دونيا و دواڕۆژ

پێـم بڵـێ خـۆشـی ئـەم دونيـا كـامە؟[٢٨٩]
كـە بەرگی ڕاستی چەند گەزێ خامە[٢٩٠]
نێـوانـی دونيـا و دواڕۆژ يـەك پيتـە
كــە پيـتـی (واوە) بـۆ (كاف) و (لامە)[٢٩١]

****

هێـنـدە بـێ ئـاگـاين وەهـــا ئـەزانين
ژيـان تـاسـەرە و هـەرگـيز نـامـرين
مـقـۆ مـقـۆيـە و بگـرە و بـەردەيـە[٢٩٢]
هەموو لـەگـەڵ يەك دوژمنی يەكـين



كەلار / ٤ / ٨ / ٢٠٢٠

---

[٢٨٩] وشەی(كامە) لێرەدا وەك پرسيار هاتووە واتا: كامەيە (كوانێ خۆشی ئەم دونيا).

[٢٩٠] خامە: خام جۆرە پارچە (قوماشێكە) بۆ كفن (كفنی مردوو) بەكاردێت.

[٢٩١] پـيتی واو: ئـەو پيتـەيـە كـە لـەنيوان هـەردوو وشـەی (دونيـا) و (دواڕۆژدا)يـە (الـدنيا و الآخـرە)، وە هەروەها پيتـەكانی كـاف و لام (ك.ل) واتـا: وشـەی (كل) كـە لـەزمانی عەرەبيـدا مانـای هـەموو (گشت) كـە ئاماژيە بە ئەوەی هەموو مرۆڤێك دەبێت هەوڵ بدات بۆ دونيا و دواڕۆژی خۆی.

[٢٩٢] مقۆ مقۆ: ناكۆكی و دژايەتی يەكتری كردن.

# ئەو پارچە گۆشتەی

ئەو پارچە گۆشتەی کە لەناو دەمە
کلیلی شادی و سەرچاوەی خەمە
ئەگەر بۆ چاکە بە کاری بێنی
نموونە و هاوتای لە دونیا کەمە
****
ئەگەر نەیگری دەرد و بەلایە
نەك بەلا بەڵکو وەکو مار وایە
پڕ ئاشووبەیە و ئاسوودە نابێت
ئەو کەللەی ماری ئاواى تێدایە
****
هەرچەند بە کوردی ناوی زمانە
بەلام سەرچاوەی سەد دەرد و ژانە
گەر بیپارێزی لە هەردوو دونیا
بۆ گشت برینێك وەکو دەرمانە



کەلار / ١٩ / ١١ / ٢٠٢٠

# پێمخۆشە

پێمخۆشـە وەکـو گـوڵاڵــەی بـەهـار
هەمیشـە گـەش بم لــە دڵـی دڵدار
پێمخۆشـە وەکـو شــنـەی شـادی بم
بـۆ دڵـی کـەسی دامــاو و خـەمـبـار
****
پێمخۆشە وەکو بەندە و خزمەتکار
بـۆم نیشـتمـانـە بـە وتــە و کــردار
پێمخۆشە دونـیـا هەمـووی پێکـەوە
تـەبـا و بــرا بن دژی ســــتەمـکار



کەلار / ١٢ / ٥ / ٢٠٢٢

# زەردە خەنەی هەژارێك

هەژاری داماو بێ نان و بێ ئاو بەرگی شڕ لەبەر
هەموو تەمەنی بە نارەحەتی ئەو ئەباتە سەر

ئەگەر دەرکەوێت زەردەخەنەیەك لەسەر لێوانی[٢٩٣]
ئەڵێن دڵخۆشی بە پارە نییە زۆرخۆشە ژیانی

هەرچەندە ژیان پڕە لە خەم و تاڵی زۆر تیایە
تامی شیرینی کەس نەی ئەزانی تاڵی نەبوایە[٢٩٤]

زۆر کەسێ هات و شانازی کرد و خۆی بادا
بەڵام بوو بە خاك ئێسك و پرووسکی لە زەویدا



کەلار / ئابی ٢٠١٧

٢٩٣ زەردەخەنەیەك لەسەر لێوانی: بزە و خەندە لەسەر لێوانی.

٢٩٤ شیرینی: خۆشی و شادی ـ تاڵی: خەم و ناخۆشی. واتا: ئەگەر خەم ناخۆشی نەبوایە کەس هەستی بە تام و چێژی خۆشی و شادی نەدەکرد.

# کەی خــودا فەرمووبەتی

کــەی خـــــودا فـەرمــوویـەتـی[٢٩٥]
کـە دەست لـە دونیـا بشـۆریـن
هـەر بەرگی شڕ لـەبـەرکـەیـن و
هــەرگــیـز خـۆمـان نـەگـۆڕیـن

خـــــودا پـاکـــــە و بـێـگـومـان
پاکـانیـشی هــەر خــۆش ئەوێـت
کێ ئەتوانێ بە گوڵ بڵێ ناشیرین
کـاتێ کـــە خـونچە دەرکـەوێـت



کەلار

---

٢٩٥ لـەم شـیعرەمدا مەبەسـتـم ئەوەیـە: کـە خـوای گـەورە نەیفـەرمووە هـەوڵ و کۆشـش مـەدەن، یـان نەیفـەرمووە جلوبـەرگی جـوان و خـاوێن و نـوێ لەبـەر مەکـەن، بـەڵکو فەرموویـەتی خـودا پاکـە و کەسـی پاکیشی خـۆش دەوێـت، هەمیشـە وەکـو گـوڵ جـوان بـن، بـا نەوەکانیشـتان وەکو خونچەی گـوڵ شـانازیتان پێوەبکەن.

# چی لە زیو کەی

لـە ئـەم دونیـــا چـی لــە
زیـو کـەی یـان لـە زێـڕ کـەی
کـە نــاتـوانـی کـاتـێ مــردی
هـیچیـان لـەگەڵ خۆتاببـەی[٢٩٦]

دەی ببخشـە لـەوەی هـەتـە
بە دەسـتی خۆت هەتـا مـاوی
ئەجەل ڕاوچییـەکـی دانـایـە
کـەس ڕزگاری نـابێ لـە داوی



کەلار

[٢٩٦] لەم شیعرەدا مەبەستم ئەوەیە: مرۆڤ کە مرد زێڕ و زیو هیچ سوودێکی نییە بووی، چونکە مـرۆڤ کـە مــرد هیچـی لەگـەڵ خۆیــدا نابــات، بۆیــە پێویســتە هەمیشــە بەخشــندە بــین، وە هــەروەها پێناســەی ئەجەل(مردن)م بە ڕاوچی کردووە و (مرۆڤ)یش بە نێچیری ئەجەل.

# نەوت بە من چی

پـرسـیـم لــە کـەسـێك، خەمخـۆری وڵات
لــە بـارەی نـەوت و دەسـتـکـەوت و داهات

**وتی:**

نەوت بە من چی کە من عەودالْ و دەربەدەربم[٢٩٧]
ئاوارەی شاران و هەمیشە بەرگی شڕ لەبەربم

**وتم:**

دەربـارەی شـکـۆی گـەل و خـاکـی نیـشـتمان
چییـە بۆچوونت لـە بارەیەوە بۆم بکە بەیان

**وتی:**

گـەر بـە شـکـۆداری نەژیم لـەسـەر ئـەم خـاکـە
بـە زیـنـدووی لـەنێـویـدا بـشـارێمـەوە چاکـە

❋ ❋ ❋

کەلار

---

[٢٩٧] عەودالْ: بێ لانە و بێ مالْ (ئاوارە).

# دەی با بەس بێ ئیتر

دەی با بەس بێ ئیتـر خوێنی میللـەت نـەڕژێ
دەی با بەس بێ ئیتـر دڵـی دایكـان با نەبـرژێ

نـەشـكـێ پشـتـی بـاوكی دامـاو بـۆ ڕۆڵـەكەی
دەی با ساتێ دوور بین لە شـەڕ بڵـێین ئۆخەی

نەفـرەت بكـەین لــە كـوشــتن و لــە تۆقـاندن[٢٩٨]
دوور بین لە خەم بۆ ژین بژین نەك بۆ مردن



كەلار

[٢٩٨] تۆقاندن: ترساندن.

وە هەروەها بەندە لەم هۆنراوەدا مەبەستی ئەوەیە: كە لەمـەودوا ئـیتر بـا ڕۆڵەكانی ئـەم گـەل و نیشتمانە دوور بن لە شەڕ و كوشتار و هەڕشە و دووبەرەكی و نەفرەتی لێ بكەین و نەبینە داردەستی دەسـەڵاتداران، بۆ ئەوەی چی تـر دڵی دایكان نەسووتێت و پشتی باوكانی داماویش نەشكێت بـۆ كـوژران و لەدەسـدانی ڕۆڵەكانیان، وە هەروەها خەمـەكان فـەرامۆش بكـەین و هـەوڵ و كۆشش بكـەین بـۆ ژیـان و ئومێـدمان بـە دواڕۆ هەبێت.

# ماڵی دونیا

ماڵی دونیا وەك ماقڵەیە، حەیفە هێندە پەرۆشین بۆی[٢٩٩]
هەموو ئەبێ بە جێی بێڵین، ئەمڕۆ منم سبەی خۆ تۆی

هەرگیز مەگری بۆ ڕۆژگارێ، کە تەمەنت تێیدا وون بوو
بەڵکوو بگری بۆ کەسانێ، کە چۆن ویستت وەها نەبوو

ساڵێکی تر لە تەمەن چوو، کە چی بە خۆمان نەزانی
حەقە خەمی لە بۆ بخۆین، لە جیاتی ڕەقس و گۆرانی



کەلار

---

[٢٩٩] ماڵی دونیا: لەم شیعرمەدا مەبەستم ئەوەیە ماڵی دونیا وەك ماقڵەی مناڵان وایە، هیچ پێویست ناکات کە مرۆڤ بگری (خەمبار بێت) بۆ ئەو تەمەنەی کە لەکیسی چوو (ڕبووردوو) لە لایەکی تریشەوە پێویست ناکات کە لە یادی لەدایکبوونیاندا ئاهەنگ بگێرن (سەما بکەن و گۆرانی بڵێن) و خۆشی بکەن، کە چی لە ڕاستیدا تەمەن لە هەموو یادی لەدایکبوونیاندا مۆمی ساڵێکی دەکوژێتەوە و کەم دەکات.

# مرۆڤەکان

مـرۆڤ سـندوقـێکـی داخـراوە
هـیچ کەسـێك نـاخی نازانێت
کـە هـاتـە قسـە هەموو کەس
ئەتـوانـێ نـرخـی بـۆ دانـێت [٣٠٠]

گـەر وشـەکـانی مـرۆڤـی بـاش
تـام و ڕەنگـیـان هـەبـوایـە
ئەبوایـە تامی لـە هەنگوین و
ڕەنگی لە گوڵ جوانتـر بوایـە

هـەڵـە نـییـە ئەگـەر مـرۆڤ
تـوانـاکـانـی بـە کـار بێـنـێت
بەڵـکوو هەڵە، لــــەوە دایـە
کـە مرۆڤ خۆی، لـێ بگۆڕێـت [٣٠١]



کەلار

٣٠٠ واتا: مرۆڤ لە گفتوگۆ و قسەکردندا ناخ و توانا و لێهاتووی دەردەکەوێت (ئاشکرا دەبێت).
٣٠١ واتا: مرۆڤ خۆی لە کەسانی تر بە زیاتر و گەورەتر بزانێت (لە خۆی دەربچێت).

# ڕۆڵە وریابە

ڕۆڵە وریابـە لەگەڵ یارانا وەکو برابـە
لـەگـەڵ نـەیـاریـش هــەر چاکـەکاربـە

پێـت بڵـێم ئێـسـتـا دونـیــا چ بـاسـە
نامەرد باڵادەست، مەردیش کەساسـە

بـە مـەردی بـژی، دووربـە لـە نامـەرد
با لەسـەر مـەردی بدرێیتە بـەر بـەرد

ئەگـەر نەتوانی قسـەی حـەق بکـەیت
نەکەی بۆ ناحەق چـەپڵە لـێ بدەیت



کەلار

# دایك و باوك

گوێڕایەڵبە لە ئاستی فەرمانی خوا
ناخت پڕکە لە وریایی بۆ ئەوەی وا

سەرفراز بیت لە دونیادا هەتا ماوی
دوور بیت لە شەیتان و گۆبەندو داوی

بۆ دایك و باوکیش گوڕایەڵبە بە وردی
چونکە منالْ بوویت، بە خێویان کردی



کەلار

# پەتى ستەم

راستە ئەڵێن جام کە پڕ بوو لێی ئەڕژێت
پەتی ستەمیش هەر لە ئەستوریدا ئەبچڕێت[٣٠٢]

برینی لاقبرغەی ئەسپ هۆکارەکەی ئاوزنگیە
ئەسپ بێ دەنگە، بۆیە سوار ئاگای لێی نییە[٣٠٣]



کەلار

---

[٣٠٢] پەندی پێشینانە مەبەست لێرەدا ئەوەیە: کە هەرکاتێك ستەم پەرەی سەند و زۆر زیادی کرد بێگومان ئەو ستەم و ستەمکاریە تێادەچێت و نامێنێت.

[٣٠٣] ئاوزنگی: دوو ئاسنە بە ڕاست و چەپی زینەوە، سوار پێی تێ دەخات.

(سوار)یش واتا: ئەسپ سوار، سوارچاك.

وە هەروەها ئەم شیعرە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە هەرکاتێك ستەم پەرەی سەند و زۆر زیادی کرد بێگومان ئەو ستەم و ستەمکاریە تێادەچێت و نامێنێت، بەڵام لە لایەکی تریشەوە هۆکاری سەرەکی بەردەوام بوونی ئەو ستەم و ستەمکاریە بێدەنگ بوونی ستەم لێکراوەکانە، وە هەروەك لە کۆتایی شیعرەکەدا هاتووە: ئەسپ بێدەنگە بۆیە سوار ئاگای لێ نییە.

# پژمە

کەس نەڵێت پژمە، وەکو یەك وایە
من ئەڵێم پژمەی دەوڵەمەند جیایە

دەوڵـەمەند پژمـی لــەنــاو کۆمـەڵا
هەمـوویان وتیان: یەرحەمەك ئەڵڵا

هـەژارێ پژمی گـشــت وتیان خـوایە
پەنات پێ ئەگرین لـە ئەم (پەتا)یە[٣٠٤]



کەلار / نیسانی ٢٠٢٠

٣٠٤ پەتـا: هەڵامات (فلاوەنزە).

# پارەی وا هەیە

هەرگیز خەم مەخۆ بۆ هەندێ پارە
پـــارەی وا هـەیـە وەك ژەهـری مـارە

بـە دزی و بەرتیـل مـاڵـی ئەم و ئەو
ڕۆژ پـەیدای ئـەكا و دایدەنێ بە شەو

پـاریـەك وەهـا گــەر پــەیـدا بكـرێت
ئەبێ لـــــە بـارِ و قـومـار دابنرێت



كەلار

# وێنەی ڕەش و سپی

جـاران وێنەکـان ڕەش و سـپی بوون
بـەڵام دڵەکـان، پـڕ لــە خۆشـی بوون

ئێسـتا وێنـەکان جوان و ڕەنگاوڕەنگ
بەڵام دڵەکـان ڕەش وەك شـەوەزەنگ[(٣٠٥)]



کەلار

[٣٠٥] شەوەزەنگ: تاریکە شەوی ئەموستەچاو.

# شێوازی ڕەوشت

شێوازی ڕەوشت هەر وەكو ئـاوە[٣٠٦]
یـان سـازگـارە یـان وەك قـوڕاوە

ئـاوی لیْلْ هەرگیز ڕامەوەشـێنە
دەستكاری مەكە، وازی لـێ بێنـە

بەڵكـو بن بگرێت پـاك ببێتـەوە
سـازگـار ببێت بە شكلْ و شـێوە



كەلار / ٢٨ / ٥ / ٢٠٢٠

---

٣٠٦ لەم شیعرەمدا شێوازی خووڕەوشتی مرۆڤەكان وەك دوو ئـاو پێناسـەم كـردووە، یەكـەم: ئـاوێكی سـازگار واتا كەسێكی هێمن و ئارام، دووەم ئاوێكی قوڕاوی و لێلْ واتا كەسێكی تووڕە و نائارم، واتا: پێویستە لەگـەڵ كەسانی تووڕە و نائارمدا بە هێوری و ژیرانە مامەڵە و هەڵسوكەوتیان لەگەڵدا بكەین.

# فەلوجە

یاخـوا كـاول بی فەلوجەی بێ فـەڕ
خـێرم لـێت نـەدی زیـاتر لـە شـەڕ[٣٠٧]

كـە هـاتـمـە بــازاڕ دەمـەو نیـوەڕۆ
دیم كەناس هەموو بوون ڕەنجـەڕۆ[٣٠٨]

هـەمـوو بێزارن لـەبـەر پیسـی تـۆ
لـە بۆنی سیانكە و لـە بۆنی بۆسۆ[٣٠٩]



فەلوجە / ١٩٨٠

---

[٣٠٧] كاول بی: وێران بی، / فەلوجە: یەكێكە لە شارەكانی پارێزگای رومادی (الانبار)،
خێرم لـێت نـەدی: خێرم لێ نەبینیت (خێر و خۆشیم لەنێوتا نەبینی و نەحسامەوە).

[٣٠٨] دیم: بینیم (سەیرم كرد).

[٣٠٩] سیانكە: چڵكاو، / بۆسۆ: شتی سووتاو.

بەندە ئەم شیعرەم لە سەردەمی ئاوارەیی دا نووسیوە، ئەو كاتەی كە زۆربـە گـەلی كـورد ئـاوارەی شـارەكانی ناوەڕاست و خواروی عێراق كرابوون (ترحیل كرابوون).

# کەسی چاکەکار

چەند خۆشە مرۆڤ تا ها لە ژیان
بۆ هیچ کەس نەیبێت زەرەر و زیان

کاتی کۆچ بکات، جێگەی دیار بێت
شارێ بۆ کۆچی تەواو خەمبار بێت

ئەها، ڕاستیەکان چۆن دەرئەکەوێت
کەسی چاکەکار خەڵك خۆشی ئەوێت

کاتێ کۆچ بکات خەڵك بۆی خەمناکە
لەدوای مردنیش چاکە هەر چاکە[٣١٠]



کەلار / حوزەیرانی ٢٠٢٠

---

[٣١٠] واتا: کەسی چاکەکار لەدوای مردنیش خەڵکی هەر باسی چاکەکانی دەکەن.
ئەم شیعرەم بۆ کۆچی دوایی کەسایەتیەکی خێرخواز و چاکەکار و بۆ خوا سوڵحاوی دەڤەری گەرمیان نووسیوە کە ناوی کاك (ئەحمەد) بوو، کە بە نەخۆشی ڤایرۆسی کۆرۆنا لە ڕێکەوتی (٢١ / ٦ / ٢٠٢٠) کۆچی دوایی کردووە.

# نەکەی مەغرور بی

نەکەی مەغرور بی بەپلە و پایە[٣١١]
ژیـان و مردن بە دەسـتی خـوایە

ڕاسـتە کە ئەڵێن دونیا کا و بـایە
سـەری بێ ڕۆژی لـەژێـر خـاکـایە[٣١٢]

ئەمە پاداشـت و وەفـای دونـیـایە
هەرچەنـدە ئەڵێن کە بێ وەفـایە

ئومێدت هـەبێ دونـیـا هـەروایە
چی ناخـۆشـیە، خۆشـی لـەدوایە



کەلار / ١٦ / ٨ / ٢٠٢٠

---

[٣١١] مەغرور: (مغرور) وشەیەکی عەرەبییە واتا: لەخۆبایی.

[٣١٢] دونیا کاو بـایە: پەندی پێشینانە واتا: ژیانی دونیا کۆتایی پێ دێت وەك کا (پـووش وپـەڵاش) چۆن بـا دەیبـات خـۆی ڕاناگرێـت، / سـەری بـێ ڕۆژی لـەژێر خـاکایە:ئەمش هـەر پەنـدی پێشـینانە واتـا: تـەنها مردووەکان کە لەژێر خاکدان رزق و رۆزیان لەسەر زەوییدا نییە.

# لە بیرت چوو

هەرچی هەوڵ و کۆشـشت بـوو، لـە ڕابـردوو
لـە دونیادا لـە پێناوی ئاسـوودەیی، بۆ داهاتوو

بەڵام ئەفسوس بێ ئاگا بووی، لە بیـرت چوو
دونیـا پێشـتـر بـۆ کەسـی تر، کەی وەفای بوو

هـەرچی هـەوڵت لـەگـەڵـیـادا، بـە فیـڕۆ چوو[٣١٣]
تۆ حاتەم و کە چی ئەویش، چرووك دەرچوو[٣١٤]



کەلار / ١٤ / ٩ / ٢٠٢٠

---

[٣١٣] بە فیڕۆ چوو: بێ هوودە ڕۆیشت (بێ سوود ڕۆیشت و ڕابوورد).

[٣١٤] حاتەم: حاتەمی تائیی، یەکێك بووە لە میواندۆست و بەخشندەکانی سەردەمی خۆیی.

# هەر ئاوە هۆکاری

لـــە ئـاو خنکاو بـۆ ئـاو خنکاو
هەردوو هەر مەرگ و تیاچوونە
بـــەڵام تـەنـهـــــا جـیـاوازیـان
زۆر بـوونـە یـان هـەر نـەبـوونـە[٣١٥]

هـــەردوو هـــەر ئـــاوە هـۆکـاری
هـێـنـدە زۆر لـــە لایـە، دەریـــایـە
بـەڵام لـە لایـەکی تـریـش قـاتـە
دڵــۆپـێـکـی بـۆ ژیــــــان دەوایـە



کەلار / ١ / ١٠ / ٢٠٢١

---

[٣١٥] لەم شیعرەمدا باس لەوە دەکەم کە هەندێ جار زۆر بوونی شتێك یان نەبوونی بە یـەکجاری هۆکـارێکی سەرەکیە بۆ نەمان و تیاچوون، بۆیە لێرەدا مانای ئەم شیعرە ئەوەیە:
ـ لە ئاو خنکاو: کەسێکە کە لە نێو ئاودا دەخنکێت، (بەهۆی زۆر بوونی ئاو).
ـ بۆ ئاو خنکاو: کەسێکە کە لە تینوا بۆ ئاو دەخنکێت، (لە بێ ئاویدا).

# ئێلی جاف

پێناسەی ئێل و هـۆزی گەورەی جاف[٣١٦]
بۆت پێناسەکەم ڕاسـت و بێ خیلاف

گــەورە و بچـووکی ڕۆژی تـەنگانـە
شــێرە، دلــێرە، مــەردی مەیدانـە

بـۆ وەعـد و بەڵـێن خـاوەن وەفایـە
بـۆ کەسی بێ کـەس پشـت و پەنـایـە

گــەورە و بچـووکیـان دڵــفــراوانن
خــاوەن ڕەوشــت و ئـاکـاری جوانن

مـەرد و دلـێرن، سـەردار و شــوانی
هـەمـوو وەك بران گـشـت تیـرەکانی

خەسـڵەتی جـوان، خـزمەتی مـیـوان
خـاوەن کـەرەمـن، خـاوەن دیـوەخـان

*** 

کەلار / ١٤ / ١٢ / ٢٠٢٠

---

[٣١٦] ئێلی جاف:(عێلی جاف) یەکێکە لە هۆزە گەورەکانی کورد لـە هـەردوو بەشـی ڕۆژهـەڵات و باشـووری کوردستان، لە چەندین تیرە (عەشیرەت) پێکهاتووە.

# شاتری

تـیـرەی شـــاتـری مـــەرد و دلـــێـرن[٣١٧]
ڕۆژی تـەنگانـە هـەر وەکو شـــێـرن

هـەر وەکـو هەمـوو تـیـرەکانی جاف
مـــەرد و دلـــێـرن بـێ لاف و گـەزاف

جاڤـن و بـۆ جـاف جێگـای شـانـازین
تـەبـا و یەکـرِیزن کاتی شـای و شـین[٣١٨]

خـــاوەن کـەرەم و نـــان و دیـوەخــان
خـاوەن خەسـڵـەت و ئـاکـاری جـوان

خـاوەنی ســەدان مـەردی کـەڵـەپیـاو
بـۆ شـــیـن و شـــای پــرس پێکــراو

خـــاوەنـی ســـــەدان کـەســـانـی دانـــا
پیـاوی ئـاینـی و مـامـۆســـتا و زانـــا

---

[٣١٧] تیرەی شاتری (عەشیرەتی شاتری): یەکێکە لە عەشیرەتە گەورەکانی ئیلی جاف.

[٣١٨] کاتی شای و شین: کاتی خۆشی و ناخۆشی.

ئـەم شـیعرەم بـۆ بـەڕێز کـاک ( عوسمـانی حـاجی براهیمـی شـاتری) نووسـیوە بـە بۆنـەی ئـەو میواندارِیـە گەورەی عەشیرەتی شاتری کە لە ١٥ / ١٠ / ٢٠٢١ لە گەرمیان کردیان.

لــە ئـاشــتـەوایـی هـەمیشــە دیـارن
بـۆ لــێـبووردەیی خـــاوەن بـڕیـارن

مــێـژوو شـــایـەتی ئـەدات بـۆ ئـەوان
کە چەند لێبووردە و ئازا و بە وەفان



کەلار / ١٥ / ١٠ / ٢٠٢١

# ڕۆغزایی

ڕۆغـزاییش وەکـو بـاقی تـیـرەکان[٣١٩]
لـەنـاو ئێلی جاف دیـارە پێگەیان

چ لـە ئێستادا و چ لـە ڕابووردوو
ناویـان تۆمـارە لــە پەڕەی مێژوو

عەشــیــرەتێکن گــەورە و فـراوان
دڵسۆزی یەکن بێ کێشە و تەبان

خـاوەنی ســـەدان پیـاوی خانەدان
کـەسی دیـاری و خـاوەن دیوەخان

خـاوەنی ڕێز و جێگـەی شـانـازین
بۆ کۆڕ و کۆمەڵ هەوێنی ئاشـتین

لــەنــاوی جـافا هەمیشــە دیـارن
بـۆ بــرایتی، بــرا و دەســـتبـارن

٣١٩ ڕۆغزایی: یەکێکە تیرە و عەشیرەتە گەورە و ڕەسەنەکانی ئێلی جاف.
ئەم پارچە هۆنراوەم لەسەر داوای هاوڕێی بەڕێزم کاك ( عـەتا فـەتاح ) نووسـیوە و پێشکەشـە بـە هـەموو خزمانی عەشیرەتی ڕۆغزایی.

لەنێوی جافیش گشت تیرەکانی
بەگزادە و میر و ڕەنجدەر و شوانی

هەموو ناسراون بە ئاکار جوانی
بە بێ جیاوازی گشت خێڵەکانی

* * *

کەلار / ١٢ / ٢ / ٢٠٢٢

# ئەی نەوەی جاف

قوربانی دەست و تیرت بم، ئەی دلێری هۆزی جاف[٣٢٠]
ئەی مەردی رۆژی مەیدان، ئەی شێری سینە ساف

ئەی رۆشنبیری وڵات، ئەی پێشمەرگەی نیشتمان
بە پینووس و تفەنگت، کوێر بکە چاوی دوژمنان

بە یەکڕیزی تێبکۆشن، بۆ سەربەخۆیی بێ وچان
با دەرکەوێت ئاسۆی ئازادی، لەسەر شاخی کوردستان

ئەی نەوەکانی هۆزی جاف، بێ جیاوازی هەر هەمووتان
بە ڕەچەڵەك گشت جوانڕۆین، چ مورادی بن یان گۆران[٣٢١]



کەلار/ تەمموزی ٢٠١٨

---

٣٢٠ هۆزی جاف: ئێلی جاف (عێلی جاف) لە سێ بەش پێکهاتووە (جوانڕۆی، گۆران، مورادی).

٣٢١ جوانڕۆ: شاری جوانڕۆ لە کوردستانی ڕۆژهەڵات مەڵبەندی سەرەکی و سەرچاوەی ڕەسەن و ڕەچەڵەکی هەموو تیرەکانی ئێلی جافە، وە هەروەها جافی جوانڕۆ یەکێکە لە بەشە سەرەکییەکانی جاف و ناسراوە بە (جافی ئێران)، مورادی و گۆران دوو بەشن لە جاف، جافی مورادی یەکێکە لە بەشە سەرەکییەکانی جاف و ناسراوە بە (جافی عێراق)، (جافی گۆران)یش یەکێکی ترە لە بەشەکانی جافی ئێران و ناسراوە بە جافی گۆران یان (جافی کرماشانی).

# جافێکی سینە سافم

سەربەرزیە بۆ من کە لە نەوەی ئێلی جافم
لە تیرەی ئاغاوەیسی و جافێکی سینە سافم[٣٢٢]

دەستپاکی و بەخشین و خزمەتی میوان
خەسڵەتێکن لە نەریتی باب و باپیران

یاخوا دیوەخان و دەواری جاف هەر بمێنێ
جێگەی پەنا بێ، بۆ ئەوەی پەنای بۆ دێنێ



کەلار / ١٠ / ٩ / ٢٠٢٠

[٣٢٢] ئێلی جاف لە سێ بەش پێکهاتووە "جوانڕۆیی، مورادی، گۆران" تیرەی ئاغاوەیسی: یەکێکە لە تیرەکانی ئێلی جاف لە بەشی جوانڕۆیی، بەندەیش (کەریم ئاغاوەیسی) سەر بە ئەم تیرەیەم کە ناسراوە بە (تیرەی ئاغاوەیسی).

# تیــرەی نەژوێنی

تیــرەی نەژوێنی جاف، جێگەی شانازییە
خـاوەنی (کـەرەم)ن، جـێگـەیـان دیـارییە[٣٢٣]

ڕۆژی تەنـگـانـە هـــەرکـامـیـان ببیـنـی
شـێرە، پڵـنـگـە، لـەنێـو جـافـا نەژوێنـی

هـەمـیشـــە واڵایـە دەوار و دیـوەخـانـیـان
مــەردن و دیـارن، بـۆ خـزمـەتـی مـیـوان

سەخاوەت و کەرەمیان هـەر دوایی نـایـە
جافن، خەسـڵەتی جافیش هـەر وەهـایـە



کەلار / ٣٠ / ١١ / ٢٠٢٠

---

[٣٢٣] کەرەم: سەخاوەت ( بەخشندە).

# ئاغاوەیسیم

گەر ئەپرسی لە ئاین و نەتەوە و نیشتمانم
ڕەچەڵەك ئاغاوەیسیم و کوردم کوردییە زمانم[٣٢٤]

سینەم هەمیشە قەڵغانە، لەبۆ خاکی کوردستانم
بە ئاین و بیرو باوەڕ، سوپاس بۆ خوا موسڵمانم



کەلار / تشرینی یەکەمی ٢٠١٧

---

٣٢٤ ئەم شیعرەم لە کتێبی (تیرەی ئاغاوەیسی و خێڵەکانی)دا تۆمار کراوە (نووسراوە).

# دڵی شێتم

تـووخــوا گـیـانـه دڵ بـەرگـەی
دووری تـۆ لـــە کویٚ ئەگـرێـت
مەگـەر هـەر خـاك بـەسـەرکا و
قـورِی دووریـت لـەسـەر بگرێـت[٣٢٥]

هــیـچ شـك نـابـەم لـەم دونـیـادا
کـە بـەدیـاری بیبەخـشـم پێـت
تەنـهـا پـارچـە گۆشـتێك نـەبێـت
کـە پێـی ئـەڵـێن دڵێکـی شـێـت[٣٢٦]

خۆشــەویســتیت وەکـو خـوێـنـە
لــەنــاو دڵـمـا دێـت و ئـەچـێـت
تــاوانـی شـێـت تـوخـوا گـیـانـە
دەی پێم بڵـێ ئـەبێـت چی بێـت

---

[٣٢٥] واتـا: دڵ لـەدووری خۆشەویسـتەکەی چـۆن دەتـوانێ ئـارم بگرێـت، مەگـەر تـەنها هـەر خـاك (خـۆڵ) بەسەردا بکات و قورِ لەسەر بگرێت (قورِ بپێوێت).

[٣٢٦] دڵێکی شـێت: دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی و ئەویندار و سەرلێشێواو.

تـەنـهـــــا ئـــەوە نـەبـێــت
بە ئاگرى خەم بۆت ئەسووتێت
دڵـى شـێـتم ئـامـادەيـە بۆ سـزا
بـەبـێ تــاوان ســــزا بــدرێـت

دڵـێ هـێـنـدە بـە وەفـــا بێت
تـاوانـە گەر سـتەمى لێ بكرێـت
يـاســـاى ژيـــان هـــەروا بـــووە
كـە پـايـز هـات گوڵ هەڵوەرێـت

لــە دونـيـــادا ئــاســـوودەيـە و
بێ خەمە شـێت هەتـا ئەمرێـت
ژيــر ئـەبێـت هـــەر بنـاڵـێنـێ و
فرمێسكـى خـوێننينى بســـڕێـت(٣٢٧)

* * *

كەلار / تەمموزى ٢٠١٦

[٣٢٧] واتــا: مرۆڤـى ژير(عاقـڵ) دەبێــت هەميشــە لــە دونيــادا بــەهۆى هەســتكردن بــە ئــێش و ئــازار و نەهامەتيەكانى ژيان لەژێر بارى خەمدا بناڵينێت و فرمێسكى چاوەكانى بسڕيت.

# دەردی پیرییە

دەردی پیرییە کە چاو نەیماوە
هـــێزی بینـینـی یـــارانی
بـە چــاوی دڵ مـن ئـەتبـیـنـم
خـۆشـەویسـتەکەی جــارانـی[٣٢٨]

لـــە نـاکـــاو پـیـری هــات و
بەهاری لە من کرد بە زسـتان
بـەسـەر دڵـمـا کـڕێـوەی خـەم
بـەسـەر سـەرما بەفری بـاران[٣٢٩]



کەلار / تشرینی دووەمی ٢٠١٧

---

[٣٢٨] واتا: هەرچەند دەردی پیری بووە بە هۆکاری ئەوەی چاوەکانم هێز و توانای نەماوە کە دۆست و یارانی ببینێ، بەڵام خۆشەویستیان لە دلدا وەهاجێگیربووە هەمیشە بە چاوی دڵ دەیانبینم.

[٣٢٩] بەهاری لێ کردم بە زستان (خۆشیەکانی لێ کردم بـە ناخۆشـی)/ بەسـەر دڵما کڕیـوەی خـەم (بەسـەر دڵما سەرما و سۆڵەی خەم)/ بەسەر سەرما بەفری باران(مووەکانی سەرمی سپی کرد).

# ئەی ئەو کەسەی

ئـەی شـۆخـی جوانـی لـــە دڵا شــیـرین
ئـەی مـژدەی خۆشـی بـۆ دڵـی خـەمگین

ئـــەی ئـــەو کـەســـەی وا دڵــمــت بـرد
لـەنـێـوانی پـەڕەی دڵـتـا زینـدانت کـرد

ئـەگـــەر نـــەرم و بـــە ســـۆز بـی بـۆی
ئەتـکـا بـــە جێ و مـەســکـەنـی خـۆی

دوای ئـــەوەی چـــوو نـەمــا لــــــە لام
بـــوو بـــە هـــی تـــۆ مـــن بـێ دڵ مــام

دوای ئـەوەی چـــوو بـــە جێـیهێشــتـم
بـــوو بـــە هـی تـۆ و بـێ دڵ کـــەوتـم[٣٣٠]

دەی تـوخــوا تـۆیـش ســـۆزت هـــەبێت
لـــــەگـــەڵ دڵـــێك وا شـــــەیـدات بێت

---

٣٣٠ بێ دڵ کەوتم: بێ دڵ مامەوە (دڵم بوو بە هی تۆ مەبەست ئەو شۆخە جوانەیە)

دەی پـێـم نـاڵـێـیت تـۆ چــۆن تـوانیت
وا بـە ئاسان لـەنـێو سـنگم دەری بێنیت

لــەنـێونـمـان تـۆوی جـوودایی بچێنیت
هـەروەك مەلـێك شاباڵـەكەی بقرتێنیت

من ئەزانـم هۆكارەكەی لـەبـەر چی بوو
بۆ چی تیرت بە ئەو شـێوە كاریگەر بوو

چونكە تیلمەی چاوەكانت وەكو تیر بوو
لـەنێوانی دوو كـەوانی ئەبرۆت دەرچوو



كەلار / كانونی دووەمی ٢٠٢٢

# دڵ کـە دیلی ئەوینی

دڵ کـە دیلی ئـەوینـی تـۆ بـێ هەتـا مـاوە
لــە ئـازادی خۆشـتـرە لای ئـەو کـۆت و داوە [٣٣١]
هێنـدە نزیك بێت لـە بـۆنی هەناسـەی تـۆ
چ پێویستی بـە ئـازادیـە، یان بـۆنـی گوڵاوە
****
ئـەوە کـەی (دیلی)یـە گــەر بێـت و ئـاوابێ
خۆر و مانگ هەردوو لە ناخی ئەوا ئـاوابێ [٣٣٢]
بـە ڕەواڵــەت پـیـر و پـەككـەوتـە بـەڵام !
لـە دەریـای ئەوینا تەمەنی جوان و سـاوابێ [٣٣٣]



کەلار / ٩ / ٨ / ٢٠٢١

---

[٣٣١] کۆت و داو: پێوەند، ئەو کۆت و زنجیرەیە کە پێی کەسانی دیل و زیندانی پێ دەبەسرێت.

[٣٣٢] واتا: ئەوە کەی دەستەسەربوون و دیلییە ئەگەر بێت وەها بـێ، کـە ئـەو هێنـدە جوان و شۆخوشـەنگە وەك تیشك و ڕووناکی خور و مانگ وایە کە لە ناخی ئەودا جێگیر و ئاوا ببێت.

[٣٣٣] ـ بە ڕەواڵەت: بە شکڵ و شێوە.

ـ جوان و ساوابێ: ساوا (کۆرپە) بۆ نموونە بە منداڵی کۆرپە دەڵێن منداڵی ساوا.

# بێ تۆ

بێ تۆ بێ شـەوقە دڵـی پـڕ خەمم
بە بێ تۆ تاڵە هەنگوین لـە دەمم
بێ تۆ تـاریکــە ڕوونــاکی چـاوم
بێ تۆ ئـاشــنـای شــین و مـاتـەمم
****
بێ تۆ ڕۆژی ڕوون لام شەوی تارە
بێ تۆ مەجنوونم جێگـەم کۆسارە
بێ تۆ لــە لای من شـادی بێ نـازە
بێ تۆ ژیــانـم وەك ژەهــری مـارە
****
بێ تۆ ماڵی دڵ بـە خــەم ئـاوایـە
بێ تۆ بـەهـــارم وەك پـایـز وایـە
بێ تۆ داســتـانی ســەختی ژیـانـم
بـە ســـەدان کـتێب کـۆتـایی نـایـە



کەلار / ١٧ / ٣ / ٢٠٢٢

# منم لە دووریت

منم لــەدووریت خەمبار و ماتــەم

منم مـالّـی دلّ ئـاوەدان بـە خــەم

منم گـیـرۆدەی داوی عەشـقی تـۆ

منم کـوژاوی نـــازی دوو دیــدەم

****

منم دلّ بۆ تۆ بـووە بە مەجنوون

منم وەك فەرهاد لـەپای بیستوون

منم سـەنگتاشی کێوی خـەمی تـۆ

منم بـە تـیـرت پێکــراوە دەروون



کەلار / ٢٨ / ٦ / ٢٠٢٢

# ئەوینی تۆیە

ئەوینی تـۆیـە کـە وەهـای لـێم کـردووە
ئـەم دڵـەم بـە دەست خەمەوە نەمردووە

غـەریبم دڵ پـڕ لـە ئـازارم لـەدووریت
ئەم هەموو ئازارە، بۆچ ئەبێت نەبینیت

بێ وەفا هەروایە، سـتەمە کار و کرداری
هەنـاسـە ساردە، ئـەوەی ببێت گرفتاری

یەکێ هێندە بوو بێت دووچاری ئەوینی
سەیرە لە فەرهاد، بێ ئاگا بێت شـیرینی(٣٣٤)



کەلار / کانونی دووەمی ٢٠٢٠

---

٣٣٤ فەرهاد و شیرین: دوو ئەویندار(خۆشەویستی) یەکتری بوون لە چیرۆکی(شیرین و فەرهاد)دا.

# ئەگەر مەپرسی

ئەگـەر مەپرسـی جە حالـم چێشەن[٣٣٥]
دڵ سەوداسەرەن دەروون پڕ ئێشەن

جـەو ساوە دیدەم جە دیدەت دوورە
دەروون پـڕ ژانـەن دیـدەم بێ نوورە

جە ئەشـك هـونین بێزار بی دیـدەم
دۆسـتم نەمانەن بێجگـەن جە خەم



کەلار

---

[٣٣٥] ئەم شیعرەم (ئەگەر مەپرسی) بە زمانی (هەورامی) نووسیوە مانای شیعرەکەیش ئەمەیە:
ئەگـەر ئەپرسـی لـە حـاڵم چێیە، دڵ سەوداسـەرە و دەروون پـڕ ئێشـە، لـەو سـاوە چاوم لـە چـاوت دوورە، دەروون پڕ ژانە چاوم بێ نوورە، لە فرمێسکی خوێنین بێزار بوو چاوم، دۆستم نەماوە بێجگە لە خەم.

# دۆینی شـەو

لـە دەردی دووری تۆ دوێنی شـەو
تـا سـەحـەر هـەر تـلامـەوە
نـە خـەم مـاڵـئـاوی لـێکـردم
نـە شـادیش هـات بـە لامـەوە

چاو نـەچووە خـەو بە فرمێسکی
سـەرینی تـەڕ کـرد بـەو شـەوە
دەم بە هاوار بووم وەکو دەروێش
لـە زیکـرا دڵ بـە زووخ و زامـەوە



کەلار / ٣٠ / ٨ / ٢٠١٨

# وەك سەرابێك بووی

تۆ بووی ئومێدت بەخشی بە دڵ
بەڵام لە بەختی منی کوڵۆڵ
تەنها وەك سەرابێك بووی[٣٣٦]
بۆ کەسی تینوو لە دەشتی چۆڵ

باخی بەهاری ژیان هەر چەند
گەش و بۆن خۆش بوو بەری
بەڵام لە ناکاو بە پایزی تەمەن[٣٣٧]
سەراپا هەمووی، ڕزی و هەڵوەری



کەلار

---

[٣٣٦] سەراب: ئەو دیمەنەیە کە وەك ئاو بەدی دەکرێت لەدوورەوە لە دەشتی چۆڵ و بیابان و سەر ڕێگاوبانەکاندا مرۆڤ وا دەزانێت ئاوە بەڵام تەنها دیمەنێکە وەك ئاو وایە، بۆ ئەو کەسانەی کە لە دەشتی چۆڵ و بیاباندا تینووییانە کە لەدوورەوە دەیبینن دڵخۆش دەبن وا دەزانن ئاوە.

[٣٣٧] پایزی تەمەن: لێرە مەبەستی (تەمەنی پیری)یە.

# ئەزانم وەکو

ئـەزانـم وەکـو فـەرهـادی کـۆکـەن[٣٣٨]

مـوبتەلای دەرد و ئـێشـی ئـەویـنی

ئـەزانـم وەکو مەجـنوونی شـەیـدا

چەندە خەمبار و چەند ماتەمینی

ئـاواتـەخـواز بووی ڕۆژێ لـە ڕۆژان

بـۆ بـاخـی گـوڵـی ببـیـە پـەرژیـنی

بـەڵام ڕۆژگــــار، بــواری نــــەدا

ئـەو ئـاواتـەی دڵ بـە چـاو ببیـنی



کەلار / ئابی ٢٠٢٠

---

٣٣٨ ئەزانم وەکو: ئەم شیعرەم بۆ هاوڕێیەکی خۆمم نووسیوە.

# خۆشەويستى

خۆشـــەويســـتى دەردێكـى ســــــەخـتـە
كـەم كـەسـێ بەرگـەى ئــازارى ئەگرێ
يان ئەبێ وەكو مەجنوون بە كێوانەوە
يان وەكو فەرهـاد بێسـتوون هەڵكەنێ

خۆشـەويستى نەريـتى هەروەها بووە
لە بێ ئارامى عاشق لە ئازارى ئەمرێ
بـەڵام خۆشـەويســـتى ڕاســــــــــتى
لـــــە دەروونـــدا ئـەوينێكـە نـامرێ



كەلار / ١٥ / ٤ / ٢٠٢١

# دڵ و پەرداخ

دڵ وتی: من مشتێ گۆشتم، نێو سینەیە جێگا و شوێنم
بە پەرداخی بەتاڵ مەستە، هەست و سۆزی پڕ ئەوینم

من و پەرداخ هەردوو وەك، یەك بێ شوێن و جێین
وەك دوو عەودالْ لە بۆ، ئازیزێك ئەگەڕێین

پەرداخ لە بۆ هاوڕێی، مەست و ئالودەی مەی
منیش لەنێو دەریای، قووڵی خەمی بێ پەی

هەرچەند پەرداخ وەکو، نەشتەر غەرقە لەنێو ناخم[٣٣٩]
بێ ئازارە کە ئەبینم لەسەر، سەرمە خۆش دەماخم



کەلار / ٧ / ٩ / ٢٠٢٠

---

[٣٣٩] غەرقە لەنێو ناخم: نوقمە لەنێو دەروونمدا.

ئەم شیعرەم وەك پێناسەیەك بۆ ئەو وێنە نووسیوە، کە لە ٦ / ٩ / ٢٠٢٠ لە ڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووکەوە بەڕێز کاك حسەین عەلی بەگی سەلیم بەگ بۆی ناردم، وێنەکە بریتی بوو لە وێنەی پەرداخێك بەشی خواروی پەرداخەکە نوقمی دڵێك بوو (چەقی بوو بە دڵێکدا)، کاك حسەین وتی: دوێنێ ئەم وێنەیان بۆ ناردووم کە لە پێشبڕکێیەکدا داوای هۆنراوەیەکیان کردووە تەعبیر لەم وێنە بکات.

# وتم ئەی دڵ

وتم ئەی دڵ پێم بلێ بۆ وا داماوی
کامیـان سـەرنـجی زۆر ڕاکێشاوی

بـــزەی ســـــــــــەر لـــێوی
یـــان تـیلـــــمـەی چـــــــاوی[٣٤٠]

دڵ هـاتـە وەڵام بـە سـەد ئێـشـەوە
بـە دەروونێـکی پـڕ لــە ڕێـشـەوە[٣٤١]

وتی من خۆمم پێشکـەش کـردووە
هیچ نیـم بە تەنگی کێشمەکێشەوە[٣٤٢]



کەلار / ١٤ / ٦ / ٢٠٢١

---

[٣٤٠] بزەی سەر لێوی: خەندەی سەر لێوی ( زەردە خەنە. / تیلمەی چاوی: نازی چاوی.

[٣٤١] واتا: بە دەروونێکی پڕ لە برینی سارێش بووەوە، برینێك کە خەریکە چاك دەبێتەوە پێی دەڵێن: ئەو برینە سارێش بووە (زامە سارێژ بووە).

[٣٤٢] واتا: هیچ نیم لە هەوڵی کێشمەکێش و بەرەنگاربوونەوە (بگرەوبەردە).

# ئەی شۆخی بە عیشوە

ئـەی شـۆخی بـە عیشــوە ناترسی
لە ئاهم سەراپا جەستەت گربگرێ
خـۆ ڕاوچـیش ڕەحم بە نـێچـیـری
ئەکات لـــە هـەزاران جـارا جـارێ

نـازانـم تـۆ چۆن هـێـندە بێـباکی
کـە دڵـدارت لـەبـەر دەستا بـمـرێ
ئـایـە هۆکـاری بێ دینیتـە کـە وا
بـرژانگت تیـری کوشـــندە ئەگرێ

پێـویســت بـەو هـەموو تیـرە ناکا
بـەســە بـۆ کوشـتنم تـەنها تیـرێ
دڵ گرفتاری نیگای پـڕ نـازی تۆیە
حەیفە کە هێندە تیـری لێ بدرێ

بـەڵام تـۆ حەقەتە خـوێنم بڕێژی
چـونکە دڵمت بـۆ بـەخێو ناکرێ
وتم: مەبەسـتـم خۆم نییـە قوربان
نامەوێ بـە خوێنڕێژ ناوت ببـرێ

دڵ هێندە سەرمەشقە لە ئەوینا
مەست و بێباکە ستەمی لێ بکرێ
گرفتاری تیری نازی تۆیە بۆیە وا
بووە بە جێگەی هەموو ئازارێ

هەرگیز مەکەن مەنعی دڵ یاران
چونکە لە لێوی شەکر ئەبارێ
وتم بترسە خوانەکات نەوا گیرابێ
نزا و ئاهی سەردی دڵی دڵدارێ



کەلار / ٢٠ / ٧ / ٢٠٢٢

# مەکەن لۆمەم

مەڵێن یاران بۆ چ دڵ ئاشنایە بە خەم

یان بۆ چ خوێنینە فرمێسکی دیدەم

لەبەر فیراق و دووری یارە بۆیە وەها

پەرۆشە حاڵم، دەخیلە مەکەن لۆمەم

****

بێ ئەو جێگەی دەرد و ئازارە سینەم

وەکو پەروانە سووتاوم بە گڕی شەم

چیمە ئیتر لە باسی خۆشی ئەم دونیا

یان باسی جوانی لێو و برۆ و پەرچەم



کەلار / ١٢ / ٩ / ٢٠٢٢

# گۆڕ بەهەشتی باوەڕدارانە

ئـەو ڕۆژەی مـــردن ئەبێت بـەمـیـوان
زمـان لاڵ ئەبێـت لـەئـاســت وشـەکان[٣٤٣]

لاشــە نـایمـێـنێت نـە هـێز نـە تـەکان
گـشـت پوچەڵ ئەبێت کـردار و پـیـلان[٣٤٤]

لـەم سـەر زەمـینە کە دێـین و ئەچـین
ڕۆژێـك لــە ڕۆژان هـەرئەبێت بـمـرین

دەی بـا بـۆ دوارۆژ توێشـوو هەڵـبگرین[٣٤٥]
بـۆ نـاو ئـەو گـۆڕەی کـە گـڵە سـەرین[٣٤٦]

بـۆ ئـەو ڕۆژانـەی بـێ یــار و هــاودەم
گەر چاکەکاربیت ڕائەکشێیت بێ خـەم

---

[٣٤٣] واتە: کاتی سەرەمەرگ ئەو کاتەیە کە زمان توانای وتنی هیچ وشەیەکی نییە.

[٣٤٤] واتـا: جەسـتە کـاتی سـەرەمەرگ هـیچ هێـز و توانایـەکی نییـە هـیچ کارێـك ئـەنجام بـدات، وەهـەروەها هەموو ئەو پیلان و ئیش و کارنەی کە بەنیازبووە ئەنجامی بدات پووچەڵ دەبێت.

[٣٤٥] توێشـوو: ئـەو خـوراك و ئازوقەیـە کـە جـاران کاروانچـی لەگـەڵ خـۆی دەیـبرد بـۆ ڕێگـا، بـەڵام لێـرەدا مەبەست ئەوەیە کردەوەی چاك بکەین بۆ ئەوەی ببێتە توێشوویەك بۆ دوارۆژمان.

[٣٤٦] گڵ (خاك ـ خۆڵ)، واتە: لەناوی گۆڕدا سەرینی مردووەکان تەنها گڵە (خاك و خۆڵە).

گۆڕ وەکو بەهەشت کراوەیە بۆت
ئەڵێن بەبێ خەم ڕاکشێ بۆ خۆت

ناوی ئەو گۆڕە هەر وەکو دەشتە
چونکە نموونەی باخی بەهەشتە

حەز ئەکەیت زوو بێت ڕۆژی دوایی
ڕۆژی وەرگرتن پاداشتی خوایی

بەڵام خۆ ئەگەر خوا پەنا بدا
خراپەکار بیت لەسەر ڕووی دونیا

ناو گۆڕ چاڵێکی پڕ لە ئاگرە
لە ئاگری دونیا زۆر خراپترە

کاتێ فریشتە دێتە ژور سەرت
بۆ چەند پرسیارێك کە نییە لەبەرت[٣٤٧]

ئەڵێن خواوەندت کێیە بزانم؟
بەدەم (هاها)وە ئەڵێت نازانم[٣٤٨]

---

٣٤٧ لیرەدا مەبەست پرسیارەکانی ناوی گۆڕە، کە کەسانی کافر و بێباوەر ناتوانن وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە و لەبەریان نییە.

ئەڵــێـن: (ئایـن)ت چـی بـوو لـە ژیــان
ئـەو پیـاوە کـێ بوو کـە ناردیان بۆتـان

یەعـنـی (محەمەد) شـەفـیع و ســەردار[٣٤٩]
بـەدەم (هاها)وە وەکـو شــێـت و هـار

ئەڵـــێـت: نـــازانــم وەڵامــم نـیـیـە
ئـەو نـەزانیـنـە هـۆی بـەد بـەختـیـە[٣٥٠]

خـوایـە بـۆ خـــاتـر نـــاوی پـیـرۆزت
بـۆ خـــاتـر زۆری بــەزەیـی و ســـۆزت

(کەریم) ببخـشـە لـــە هـەڵـە و تـاوان[٣٥١]
ببـم بـە هــاوەڵ لـەگــەڵ پیـاوچاکان



کەلار / ئەیلولی ٢٠١٥

---

٣٤٨ هـاها (هاها لا ادری): ( هاها نازانم) وەڵامی ئەو کـافر و بێباوەڕانەیـە لـەنێو گـۆڕدا بـۆ فریشـتەکان لـە بارەی ئاینی ئیسلامەوە.

٣٤٩ محمد: پێغەمبەری ئیسلام (د،خ) کە شیفاعەتکارە بۆ موسڵمانان لەڕۆژی دواییدا.

٣٥٠ واتە: نـەزانینی وەڵامـی فریشـتەکان، ئـەو نەزانینـە ئەبێتـە هـۆی دامـاوی و بەدبـەختی و چـوونە نێـو ئاگری دۆزەخ.

٣٥١ کەریم: ناوی بەندەیە (کەریم ئاغاوەیسی)

# محەمەد پێشـەوامانە

سـوپاس بـۆ خـوا کـە ئیسـلامـی بەخـشـی پـێـمـان
ئێـمـەی کـردە موسـڵـمـان و (محمد)یش پێشـەواـمـان[٣٥٢]

سەڵات و سەلامت لـەسـەربێ ئەی خۆشـەویستی خـوا
پـەروەردگـار فـەرمـوویـەتی ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى ﴾[٣٥٣]

ئەو پەیامە جوانەت کە لە جیهاندا ئەدرەوشـێـتەوە
زانسـتێکە کە زانیـاری بـە زانـاکان ئەبەخـشـێـتەوە

قوربانی ئەو پەیامەت بم، کە هـێندە ڕاست و ڕەوایـە
پەیامێکی هـێندە جوانە، مافـی هەموو کەسـی تیـایـە

قوربانی ئـەو پەیامەت بم، کـە هـۆی ڕزگـارییە بـۆمان
قوربانی ڕەوشـتت بم، کـە ناسراوی بە ڕەوشـت جـوان

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ فەرموودەی پـەروەردگـارە[٣٥٤]
ئـایـەتێکـە لـە قـورئـانـدا، وەکـو ڕۆژی ڕوون دیـارە

---

[٣٥٢] محمد: محەمەد پێغەمبەری ئیسلام (درووودی خوای لێ بێت).

[٣٥٣] ﴿ و ما يَنطقُ عَنِ الهوى ﴾: ئایەتی (٣) سێی سوورەتی (النجم) لە قورئانی پیرۆزدا،
واتا: قسەو گوفتاریشی (ئەوەی کە قورئانە) لەئارەزو و بازی و هەواو هەوەسەوە نییە.

[٣٥٤] ﴿ و إنكَ لَعَلى خَلُق عَظيم ﴾: ئایەتی (٤) چواری سوورەتی (القلم) لە قورئانی پیرۆزدا،
واتا: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت.

ئـایـەتی چـوارەمـە، سـوورەتی ( القلم ) لــە قـورئـان
وەسـفـی ڕەوشـتت ئەکـات، پەروەردگـاری میهـرەبـان

قوربانی فەرمـوودەکانت بم، کـە پـڕ لـە ئامۆژگـاریـە
کـە یـاسـایـەکـە بـۆ ژیـــان، یـاسـایـەکی یـەکجاریـە[٣٥٥]

خۆشـەویستیت بەجـۆرێـك، لــە دڵـما جێگـیـر بـووە
گەر دڵ لە لێدانیش کەوێ، ناوت لە دڵا هەر زیندووە



کەلار / کانونی یەکەمی ٢٠١٥

---

[٣٥٥] مەبەست فەرمـوودەکانی پێغەمبەری ئیسلامە (د،خ) کـە وەك ئامۆژگاری و یاسـایەکی پـڕ لەزانسـت و زانیاریە و هۆکاری بەختەوەریە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی.

# سـەیران لە ئیسـلامدا

ئـەم دینە جوان و پـاك و بێگـەردە، کە وا ئیـسـلامـە
لە هـەردوو دونیـا بۆ سەرفراز بـوون، یاسا و پەیـامـە

زۆر ئاساییە دەرچوون بۆ سەیران یان گەشت و گوزار
بۆ سەیری سروشـت، لـەرەی گوڵاڵـە لـە وەرزی بەهار

کـەی و چ کـاتێـك کـە لــە ئیـسـلامـدا حـەرام کـراوە
لــە چ ئـایـەت و فـەرمـوودەیـەکـدا، ئـایـە نـووســراوە؟

دەرچـونـمـان بـۆ دەشــــت، بـۆ گـەشــت و ســـەیـران
زۆر بە هـێـمـنـی و، بەبـێ تـاوان و بە ڕەوشــتێ جـوان

توانـا و دەسـەڵاتی پەروەردگـارمـان بێـنیـنـە بەرچاو
تێفکرین بە دڵ لە دیمـەنی شـاخ ، یـان دۆڵ و کـانیـاو[٣٥٦]

لە جیاتی سەما و تەپڵ و مۆسیقا و قسەی ناشـیـرین
سـوپاسی خوا کەین، لەو سـروشـتـانە بە دڵ تێفکرین

---

[٣٥٦] تێفکـرین: (بیربکەینـەوە) بیربکەینـەوە لـەو دیمـەن و درووسـتکراوانە و لـە توانـا و دەسـەڵاتی خـوای پەروەدگار.

لەگەڵ نامەحرەم نابێت هەڵپەڕین یاخود دانیشین[٣٥٧]
زۆر نارەوایە، چونکە حەرامە بە گوێرەی ئاین

خوشکی شیرینم کاتێ کە ئەچی، بۆ دەشت و بۆ دەر
ڕەفتەکەی سەرت تاجی زێڕینە، لای نەبەی لەسەر

ئەنجامی بدەین نوێژە فەرزەکان، نەیەڵین بچێت
سەیران دروستە هیچ حەرام نییە، گەر ئاوا بکرێت



کەلار / شوباتی ٢٠١٦

---

[٣٥٧] نامەحرەم: ئەو کەسەیە کە دەستنوێژی لێ دەشکێت (دەکرێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکەی).

# نیعمەتەکانی پەروەردگار

هێندە زۆرە، نیعمەتی پەروەردگار
بۆ بەندە هەرگیز ناکرێت ئەژمار
نیعمەتی جوانی، بەنرخ و بەها
﴿ وَإِن تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَا ﴾ [٣٥٨]
ئەمە یەکێکە لەو ئایەتانە
بۆ ئێمەی مرۆڤ کەوا بزانە
خۆی فەرموویەتی لەم ئایەتەدا
سەرژمێر ناکرێت نیعمەتی خودا
سوپاس بۆ خودا کە بەخشی پێمان
بە بێ بەرامبەر دوو ئەڵماسی جوان[٣٥٩]
ئەگەر نازانیت نیعمەتی چاوە
بۆ چاکە کردن، بە ئێمەی داوە
بۆ جیاکردنەوەی ڕێگای ڕاست و ڕوون
لە ڕێگای لار و هەڵدێر و تیاچوون

---

[٣٥٨] ﴿و إن تعدوا نعمة الله لا تحصوها﴾: ئایەتی (١٨) ی سوورەتی (النحل) لە قورئانی پیرۆزدا.

[٣٥٩] دوو ئەڵماسی جوان: دوو چاو کە یەکێکە لەنعمەتەکانی خوای گەورە بۆ مرۆڤ، بۆ بینینی ڕێگای ڕاستی، نەك بۆ شتی حەرام (نەزەری حەرام) و ئیرەیی بردن (حەسادەت ـ حەسوودی).

بـۆ زانیـنـی حـەق، بـۆ چاکــە کـردن
نـەك بـۆ نــەزەر و حـەســادەت بــردن

نیـعـمـەتێ تـریـش لـــەو نیـعـمـەتانـە
نیـعـمــەتی ژیــری کـــە زۆر گــرانـە

بــۆیـە گــرنـگــە، نیـعـمـەتـی ژیــری
چونکـە پێـویـسـتـە لـە لاوی و پیـری

نیعمـەتی دەم و دەســت و پـێ و ددان
نیعـمــەتی دڵ و لــوت و گوێ و زمـان

ئــەم نیـعـمـەتـانـە زۆر گــران بـەهـان
بـەراورد نـاکـرێـن بـە مـاڵ و سـامـان

کـەی توانـای هەیـە و ئەتـوانێ بـەنـدە
کـــە وا بــزانـێ نیـعـمـەتـت چــەنـدە

ســوپاس و ســتـایـش، بـۆ تـۆ خـودایـە
کـە چاکـەکانـت، هـــەر دوایـی نـایـە

* * *

کەلار / تەمموزی ٢٠١٦

# سۆزی پەروەردگار

هاوار و دەخیلە خوایە (کەریم)[٣٦٠]

لە تۆ زیاتر نییەتی پەنایەتر

لە دەرگای تۆ زیاتر

شك نابا و نییەتی دەرگایەتر

گەر بە سۆزی خۆت

ببەخشی هەموو دونیا

سۆزت وەکو دڵۆپێ ئاوە

کە دەربکرێت لە دەریا

نەفسی خراپی ﴿ أَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ ﴾م

هێندە سەرکەش و تاوانبارە[٣٦١]

فەرامۆشی کردووە دوا ڕۆژی

کە گۆڕێکی تەنگ و تارە

---

[٣٦٠] کەریم: ناوی بەندەیە (کەریم ئاغاوەیسی).

[٣٦١] أمَّارَةٌ بِالسُّوءِ: ( إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي) لە ئایەتی (٥٣)ی سوورەتی یوسف لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە واتا: نەفس زۆر فەرماندەرە بەگوناەو هەڵەو تاوان، مەگەر نەفسێك کە پەروەردگارم میهرەبانی پێ کردبێت. / سەرکەش: ملهووڕ

ئەگـەر بەنـدە هـەمـوو کـات
لـە کورنۆشـابم هەتا مـاوم
بەشـی یەکـێك لـەو چاکانـە
نـاکـات کـە پـێـت داوم

بەڵام بەوە دڵشادم کە فەرمووتە
﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ [٣٦٢]
ئەو موژدە نیشانەی گەورەییتە
تـۆ لـەگـەڵ بـەنـدە ئەیکەی

هـەر چاوەڕێـی سـۆزی تۆیـە
لـەو رەحـمـە بێ بـەشی نەکەی
بەندەیەکی ڕووڕەشـە و لاوازە
چـاوەڕێـی رەحـمـە پـێـی بکەی

ئومێدی هـەر بە رەحـمی تۆیـە
چی لـە ژیـن بێ و چی لە خاکا
گـەر سۆز و بەزەیی تۆ نەبێت
مـەگـەر هـەر خـاك بەسـەراکا

---

[٣٦٢] ﴿وَرَحمَتي وَسِعَت كل شَيٍ﴾: لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی ١٥٦ لە قورئانی پیرۆزدا، خوای گەورە فەرموومیەتی: ڕەحمەت و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

هـیچ لـە موڵکی تـۆ کـەم نـاکات
گـــەر ببـەخـشـــی هـەڵـەکـانـی
قـەڵـــــەمـی لـێـبوردنـت بێـنـی
بـەســەر ســەرکـەشــی و تــاوانـی

ئـەی نـەفس نـەکـەی بێ فـەرمانـی
زاتـێك کــە تـۆی هـێـنـایـە وجـود[٣٦٣]
نـەکـەی لادەی لـە فـەرمانـی زاتـێك
کـــــە نـاســـــراوە بــە (الـودود)[٣٦٤]

کـە ئـەو هـێـنـدە بـە تـوانـا بـێت
لـە نـەبوونـەوە تـۆی بـە دی هـێـنا[٣٦٥]
بێ ئەمەکی گەر تەمەنت لە تاوانا
بـەســــــەر ببـەی لـــە ئـەم ژیـنا

ئەی نـەفسـی خەتابـار هـەتـا کـەی
خـــەریـکــی عـەیـش و نـۆشـــی
هـەتا کەی نوقمی دەریـای تـاوانـی
هەر بـەرگـی نـەزانـیـن ئـەپـۆشـی

---

[٣٦٣] زاتێك: زاتی پەروەدگارە / هێنا وجود: پێشتر بوونت (وجودت) نەبوو، درووستی کردیت.

[٣٦٤] الودود: ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە، واتا زۆر بەسۆزو خۆشەویست و دۆستدار.

[٣٦٥] تۆی بە دی هێنا: تۆی خولقاند (درووستی کردیت).

هـەرچەندە کـە (کەریم) نـوقـمـی[٣٦٦]
دەریـــای تـاوانـە ئـەی پەروەرگـار
بـەڵام بە ئومێدە کـە ڕزگاری کەی
لـــە ســـزای ئـاگــری بڵـێـســەدار[٣٦٧]



کەلار / تشرینی یەکەمی ٢٠١٦

---

[٣٦٦] کەریم: ناوی بەندە (کەریم ئاغاوەیسی).

[٣٦٧] ئارگری بڵێسەدار: ئارگری بە گڕ و بە تین.

# ئەی ڕەمەزان

لەگەڵ ئاوابوونی تروسکەی
خۆری ڕۆژت ئەی ڕەمەزان
لەگەڵ ویرد و خوا پەرستی و
تەراویح و لەگەڵ قورئان[٣٦٨]

لەگەڵ شنەی شەماڵی پارشێودا
نەك یەك تاوان هەر هەموویان
گەڵای سەرپێچی هەڵوەری
لەگەڵ بەربانگ بە بای خەزان

لەگەڵ پاكبوونەوەی دەروون
لە ژەنگی یانزە مانگی تاوان
لەگەڵ کۆتایی تاریکی بێ باوەڕی
بە بەدری پیرۆزترینی مانگەکان

---

[٣٦٨] تەراویح: نوێژی تەراویح تایبەتە بە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز و لە شەوەکانی ئەو مانگەدا ئەنجام دەدرێت.

لەگــەڵ شـــەوی قـــەدری تـــۆدا
لەگــەڵ پـــاڕانــەوە و گــریـــان
لەگــەڵ نـویـێـــژی تـــەراویـــح و
مـانـەوەی خەڵك تـا بـەر بـەیـان

لـە گـەڵ تـۆدا ئـەی ڕەمـــەزان
زۆر شـــیـریـنـە گشـــت کـاتەکـان
هـەرچـەنـد هـاتی بـەڵام ئەڕۆیـت
جـێـمـان دێـڵـی هـەرووەك جـاران



کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٧

# لای پەروەردگار

برام ئەتەوێ ڕاستیت پێ بڵێم
دەی سا بزانە، باش گوێ بکرە لێم

لای پەروەردگار هەموو وەك یەكن
پادشا و گەدا و لات و دەوڵەمەن

جیاوازی نییە سپی و ڕەش و بۆر
گەر ناشیرین بن یا جوان بن وەك خۆر

تیرە و عەشرەت و، قەوم و كەس ناخوا
كردەوەی چاكە شەرتە لە لای خوا

ئەگەر لەم دونیا چاكەت كردبێت
بەردێكت لە ڕێی خەڵك لابردبێت

لە ڕۆژی دوایی ئەگاتە فریات
لە (پردی سیرات) ڕزگارت ئەكات[٣٦٩]

---

[٣٦٩] پردی سیرات: ئەو پرد و ڕێگایەیە كە لە ڕۆژی دواییدا دەبێت هەموو مرۆڤێك پێیدا بڕوات.
لەم شیعرەمدا وەك ئامۆژگاریەك ئەوە دەخەمەڕوو كە مرۆڤەكان هەموویان یەكسانن لای پەروەردگار و هیچ جیاوازیان نییە و دەبێت لەم دونیا ماڵئاوایی بكەن، بۆیە هیچ پێویست ناكات كە مرۆڤ لە خۆی بای بێت و لە خۆی دەربچێت (مەغرور بێت) بە پلەوپۆست و ماڵ و سامانی دونیا.

بـە مـاڵـی دونـیــا قـەت مەغـرور نـەوی
پــارچـەیـە (خــام) و دوو مـەتـــر زەوی[٣٧٠]

گـشت سـەروەتمـانە ئەگـەر دەستکەوێت
ئـەوە مـاڵـمـانـە گــەر ڕاســتـیـت ئەوێت

ئەبێت بیپـۆشــین هەمـوو ئـەو بـەرگـە
شـــوانـە، گــاوانـە، ئـاغـایــە، بـەگــە

❋ ❋ ❋

کەلار

[٣٧٠] پارچەیە خام: کفن ـ دوو مەتر زەوی: گۆڕ (قەبر)، ئەوە هەموو سامانی تۆیە هەرگیز بوغرا نەبیت.

# یاخوا گشت لایەك

یاخوا گشت لایەك هەر بەختەوەر بێ
بۆ خانەوادەی هەر سایەی سەر بێ

هەموو وەرزێكمان، وەرزی بەهار بێ
خۆری شادیمان هەر پرشنگدار بێ

ژیان بە خۆشی هەمووی بووەینە سەر
دواتر لەو دونیا لە دەشتی مەحشەر

كۆببینەوە، گشت دۆست و یاران
لەژێر سێبەری عەرشەكەی رەحمان[٣٧١]

لە رۆژی دوایی نەمانكا سەرشۆڕ
بە دوورمان بگرێت، لە سزای ناو گۆڕ

دواتر هەموومان لەگەڵ خزم و دۆس
دەستی یەك بگرین بڕۆین بۆ فیردۆس[٣٧٢]

---

[٣٧١] عەرشەكەی رەحمان: (عرش الرحمن) عەرشی پەروەردگار، كە لەو ڕۆژەدا (ڕۆژ دوایی) هیچ سێبەرێك نییە تەنها سێبەری عەرشی پەروەردگار نەبێت.

[٣٧٢] فیردۆس: بەهەشتی فیردۆس (جنە الفردوس) بەرزترین پلەی بەهەشتە.

**شوكرى خـوا بكـەين لـەوێ هەمووماـن**
**بـۆ ئـەو نيعمەتەى كە بەخشـى پێمـان**

**چـەنـد خـۆشــە يـاران مـرۆڤـ وەها بێ**
**ڕووسوورى دونـيا و بەردەرگاى خوا بێ**



**کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٧**

# ئەی پادشاهی پادشاهان

کانی دڵ لە دووری ویردی تۆ، وا قوڕاو و لیٚڵە[٣٧٣]
ڕوخساری تۆیە بەندە بۆی عەودالّ و ویٚڵە

یا کەسی بیٚ کەس کەریم دادی هیٚنا بۆ لات[٣٧٤]
منم وا نوقمی تاوانم، وەك گەدا دیٚمە دەرگات

مەسوتیٚنە بەگڕی دۆزەخت، بەندەی خەتاکارت
حەلیمی تۆ ڕەحمیٚ بکە بە بەندەی شەرمەزارت[٣٧٥]

مەحالّە و کەس ناتوانیٚ بە ڕەحمی تۆ نەبیٚت
دۆزەخیٚك کە داواکا، کەس لە ئەو ڕزگاری بیٚت[٣٧٦]

---

تیٚبینی: ئەم شیعرەم (ئەی پادشاهی پادشاهان) تایبەتمەندییەکی هەیە ئەویش ئەوەیە: ئەگەر یەکەم پیتی سەرەتای نیوە دیٚرەکانی ئەم شیعرە لەسەرەوە بۆ خوار ڕیز بکەین دەبینین نووسراوە (کریم محمد احمد) واتا ناوی سیانی بەندەیە (کەریم ئاغاوەیسی).

[٣٧٣] کانی دڵ کە دوور بیٚت لە یاد و ویردی پەروەردگار وا قوڕا و لیٚڵە (ڕۆشن نییە).

[٣٧٤] کەسی بیٚ کەس: پەروەردگارە. ـ کەریم: ناوی شاعیر(کەریم ئاغاوەیسی) واتا:
ئەی پەروەردگار وا کەریم هانا و هاواری هیٚنا بۆ لات.

[٣٧٥] حەلیم: (الحلیم) ناویٚکە لە ناوەکانی خوای گەورە، واتا: زۆر نەرم ونیان و هیٚدی و بە ئارام.

[٣٧٦] دۆزەخیٚك کە داواکا: (وتقول هل من مزید) وەڵامی دۆۆخ لە ئایەتی (٣٠) سوورەتی(ق)
واتە: ئایە کەسی تر ماوە خەڵکی زیاتر نییە؟!.

ئـومـێدم هـەر تۆی کە سـپی کەی لاپـەڕەی ڕەشم[٣٧٧]
حەیفە بێ بەش کەی گەدایەك کە بڵێ کوا بەشم

مـنم خۆم خستە پەنات ئەی پەنای بێ پەناهـان
دەرمانەکـە دەردی دڵ، ئـەی پادشـاهی پادشـاهـان[٣٧٨]



کەلار / تەمموزی ٢٠١٧

---

[٣٧٧] ئومـێدم هـەر تۆی کە سپی کەی لاپـەڕەی ڕەشـم: (ئومـێدم هـەر تـۆی ئـەی پـەروەردگار کـە لاپـەڕەی ڕەشـی پڕ لە تاوانم بسڕیتەوە و سـپی بکەیتەوە).

[٣٧٨] پادشـاهی پادشـاهان: پاشای پاشاکان (ملك الملوك) کە خوای پەروەردگارە، خاوەنی هەردوو جیهانە.

# هەستە نوێژکە

هەستە نوێژکە عەزیزم، چونکە نوێژ پاییەی دینە
هەر بە نوێژ ئەتوێتەوە، لە دڵدا ڕق و کینە

هەستە نوێژکە پێش ئەوەی، نوێژت لەسەرکەن[٣٧٩]
ئەزانی چەندی وەك تۆ، لەژێر ئەم خاکەدا هەن

لە بۆ نوێژ دەست هەڵگرە، لەهەرچی ئیش و کارە
ئەنجامیدە بە دڵ چونکە، فەرمانی پەروەردگارە[٣٨٠]

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾ پەروەردگار، بە ئێمەی فەرمووە[٣٨١]
فەرمانێکە ئەنجامیدە، تا تەمەن بەسەر نەچووە

حەیفە بەندە سفڵە بێ، کرنۆش بۆ (خوا) نەبا
تەمەنی کورتی چەند ساڵەی، لە تاوانا بدا بەبا



کەلار / ئابی ٢٠١٧

---

[٣٧٩] پێش ئەوەی نوێژت لەسەرکەن: پێش ئەوەی کە بمریت و نوێژ لەسەر تەرمەکە ت بکەن.

[٣٨٠] ئەنجامیدە بە دڵ: ئەنجامی بدە بە جوانی و چاکی (بە تەواوی).

[٣٨١] ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ﴾: لە ئایەتی(٤٣)ی سوورەتی (البقرە) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، واتا: نوێژەکانتان بە چاکی ئەنجام بدەن بە دروشمەکانیەوە.

# لاوێکی ئازا

لە وڵاتی (نەرویج) کۆمەڵێك هەڵسان[٣٨٢]
یـەکـێکـیـان هەڵسا قورئـانی سـووتـان

لاوێکی ئازا کە ئەمەی بینی پەلاماریدا
ملی کـابرای گرت بە شـەق تـێـیـهەڵـدا

خۆزگە گشت کەسێ وەك ئەو ئازا بێت
بـە دڵ عـەودالّـی فـەرمـانی خــوا بێت

رێـزی بـێ پـایان بـۆ ئەو پیـاوە مـەردە
بـۆ ئەو کارە جوان و بە دەسـت و بردە[٣٨٣]

ئـەو جـوامـێـری و ئــازا و مــەردییـە
لــــە لای مـوسـڵـمـان خـۆ نـامـۆ نـییـە

بـۆ تـێـهـەڵــدان و (قەپـۆز) شــکـانـدن[٣٨٤]
لـەنـاو ئیسـلامـدا هـەر بـووە و ئەبن

---

٣٨٢ نەرویج: ناسراوە و بە شانشینی نەرویج و یەکێکە لە وڵاتـە ئۆرپیـەکان و دەکەوێتـە بـاکووری ئۆرپـا و پایتەختەکەی شاری (ئۆسلۆ)یە.

٣٨٣ بەدەست و بردە: چالاك و بە توانا و کورج وگۆڵە.

٣٨٤ قەپۆز: واتای (قەپۆز)لە (فەرهەنگی خاڵ)دا واتا: دەم و لووتی هێندێ گیاندار.

پیاوی مەردی وا گەڵێك شیرینە
چونکە کەسێکی ئازا و بەدینە

زۆر زۆر بەنرخە پێڵاوەکەی پێی
حەقە لە مێژوو تۆمار بکرێ بۆی

حەق وایە کە وا ئەو پێڵاوانە
نمایش بکرێت لە (مۆزەخانە) [٣٨٥]

* * *

کەلار / تشرینی دووەمی ٢٠١٩

---

[٣٨٥] مۆزەخانە: (متحف) ئەوجێگەیە کە کۆمەڵێك شتی دەگمەن و بە نرخی تێدا دەپارێزێت و پیشانی خەڵکی دەدرێت.

تێبینی: ئەم شیعرەی (لاوێکی ئازا)م بۆ ئەو لاوە مەرد و ئازا نووسیوە کە ڕازی نەبوو سووکایەتی بە قورئانی پیرۆز بکرێت، کە لە ڕۆژی ١٦ / ١١ / ٢٠١٩ لە گردبوونەویەکدا (لارس پورسین) سەرکردەی کۆمەڵەی توندڕەوی (SIAN) لە نەرویج لە شاری کریستیانساند هەستا بە سووتاندنی قورئانێکی پیرۆز، بەڵام لەلایەن لاوێکی موسڵمانی پەناهەندە هێرشی کرایەسەر و درایە بەر شەق.

# ئاینی ئیسلام

ئـەگـەر لـە دینـی ئیسلام تێبگـەی
ئـەوسا ئەتـوانـی پێنـاسـەی بکـەی

ئیســلام دینێکی پـاك و بێگـەردە
دەوای هـــەزاران، ئـــازار و دەردە

پـڕە لــە کـار و خەسڵـەتی جـوان
ئـەوەنـــدە زۆرن نـاکـرێـن بـەیــان[٣٨٦]

یـەکێـك لـەوانـە ڕەوشـت بـەرزییـە
کـە خەسـڵەتێکـە هاوشـێوەی نییـە

خەسڵەتی تریش هەندێك لـەوانـە
وەك ئـارامگـرتن، کـاتـی تـەنگـانـە[٣٨٧]

دەست و داوێن پاك، زمان شیـرینی
ســـۆز و بـەزەیـی و پـاکـوخـاوێنی

---

[٣٨٦] واتا: ئاینی ئیسلام کار و خەسڵەتی جوانی زۆر تێدایـە (الأعمـال و الصفات الحسـنة) کـە لـە چـەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەدا هاتووە، بە ئاسانی ئەژمار ناکرێت.

[٣٨٧] ئارامگرتن (سەبر) لە کاتی تەنگانە و ناخۆشی و نەهامەتیـەکان یەکێکە لـە خەسـڵەتە و خووڕەوشتـە جوانەکان لە ئاینی ئیسلامدا.

ڕێـزی كـەسـانـی پیـرو پەككـەوتـە
بەخشین لەو ماڵ و سامانەی هەتە

ڕێـزی دایك و باوك هەتـاكو مـاون
زۆر جـوان بە باشـی دیـاری كـراون(٣٨٨)

مـافـی دراوسـێ و خزم و كەسـوكـار
چـاكـە بەرامـبەر، هـەژار و ڕێـبـوار

ئـەمـە بەشـێكـە لـەو خەسـڵەتـانـە
ئـایـنـی ئیسـلام، ئـایـنـێ جـوانـە



كەلار / ٧ / ٤ / ٢٠٢٠

---

٣٨٨ لە قورئانی پیرۆزەدا ئایەتی (٣٦)ی سوورەتی (النساء) یەكێكە لەو ئایەتانەی كە باسی ڕێز و مافی دایك و باوك و چەندین كەسی تری تێدا هاتووە لەوانە: كەسوكار و هەتیو و هەژار و دراوسی و هاوڕێ و ڕێبوار.

# مانگی ڕەمەزان

یاخوا بەخێر بێت مانگی ڕەمەزان
دڵخۆشی کردین وەك هەموو ساڵان

هەزاران سوپاس بۆ پەروەردگار
کە مۆڵەتی دا بە ئێمەی هەژار

بوو بە میوانمان ئەمجارەش دیسان
بۆ نوێژو ڕۆژوو، خوێندنی قورئان

بۆ پاڕانەوە و نزا و شەکوای حاڵ
بۆ سڕینەوەی تاوانی یەك ساڵ

بۆ نۆێژی ویتر و تەراویحی شەو[٣٨٩]
بۆ پارشێوکردن هەڵسانمان لە خەو

بۆ پاکردنەوەی دڵ و دەروونمان
لە بوغز و ڕق و لە کینە و تاوان

بۆ ئەوەی بزانین، حاڵی برسێتی
حاڵی هەژارێك، کە وا نییەتی

---

[٣٨٩] نوێژی ویتر و تەراویح: دوو نوێژی سونەتن، بەتایبەتی نوێژی تەراویح یەکێکە لەو نوێژانەی کە موسڵمانان لە شەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا ئەنجامی دەدەن.

**هەتا هەست بکەین بە ئێش و ئازار**
**بە سەختی حاڵی کەسانی نەدار** [٣٩٠]

**لەو پارە و ماڵەی کە خوا پێی داوین**
**بێ بەشیان نەکەین هەتاکو ماوین**



**کەلار / ١٣ / ٤ / ٢٠٢٠**

[٣٩٠] کەسانی نەدار: کەسانێکی هەژار.

# تویشــوو

کاروکــرداری کــەســــی گــەندەڵ کـار

هـەرگـیز نـاگـاتـە مەنزڵ و هــەوار

ڕێگـەی ڕاسـت بگرە هەتاکو مـاوی

یـادی خــوا بکــە تـــا نــەفەوتــاوی

مــردن ئــەمڕۆ بێت یـاوەکو سـبەی

ئـەبێتە مـیوان ئەبـێ سـەفـەرکـەی

ئـەسـبـابـی ســـەفـەر بکــە ئـامــادە

غـەمێکـی بـخـۆ ژیـن بـێ بـونیــادە

ئـەم ڕاوڕاوان و ئـەم بگـــرەوبـەردە

وریابە دوا ڕۆژ لە دەست بـەر مەدە[٣٩١]

هـەتـا ئەتـوانـی هــەوڵ و کۆشـشکـە

یـانی هەگـبەکـەت پڕکـە لــە چاکە

سـەفەرت دوورە هەڵگـرە تویشــوو

یـەخەت ئەگرێ درەنـگ بێ یان زوو

❋ ❋ ❋

کەلار / ١٢ / ٨ / ٢٠٢٠

---

[٣٩١] وریابە ڕۆژی دوایی فەرمۆش مەکە کاری چاك ئەنجام بدە بۆ ئەو ڕۆژە (ڕۆژی قەیامەت).

تێبینی: یەکەم پیتی سەرەتای ڕستەکانی ئەم هۆنراوە ڕیز بکەین لەسەرەوە بۆ خوار واتا: (ئەو پیتانەی بە ڕەنگی سوور نووسراوە) دەبینین نووسراوە (کەریم ئاغاوەیسی) کە ناوی بەندەیە.

# چۆن سوجدە نەبەم

چۆن سوجدە نـەبەم بۆ خالـقێ، کە سارێـژ ئەکا هەموو برینێ![٣٩٢]
چۆن سوجدە نـەبەم بۆ خالـقێ، من نـایبینم و ئەو من ئەبینێ!

چۆن سوجدە نـەبەم بۆ خالـقێ، کەناوی پیرۆزی تاك و تەنهایە
چۆن سوجدە نـەبەم بۆ خالـقێ، کـە نـاوی جـوانـی ( الله )یـە

چۆن سوجدە نـەبەم بۆ خالـقێ، کە خالـقی هــەردوو دونیـایـە
چۆن سوجدە نـەبەم بۆ خالـقێ، خاوەن پێنووسی ڕۆژی جەزایە



کەلار / ١٤ / ٢ / ٢٠٢١

[٣٩٢] سارێـژ ئەکا هەموو برینێ: چارەسەری هەموو برین و ئێش و ئازارێك دەکات.

تێبینی: بەندە هەر ئەم شیعرەم بە زمانی عەرەبیش نووسیوە بەناوی (کیف لا اسجد).

# ڕەوشت و ئیمان

دوو خەسڵەت لە لام بەرز و جوانە
یەکەم ڕەوشتە و دووهەم ئیمانە

چونکە ئەم دوانە هەردوو هاوبەشن
لە کردەوەدا بێ غەل و غەشن

ئەوەی لای ڕەوشت جوان و ڕەوایە
لە لای ئیمانیش بێشك هەروایە

هەردووکیان فەرمان ئەکەن بە چاکە
لایان بەڕێزە ئەوەی دەستپاکە

لە لایان سووکە دز و درۆزن
بە بێ جیاوازی گەر پیاو بێ یان ژن

ڕەوشتی بەرز و ئاکاری جوان
هەردوو بەشێکن لە دین و ئیمان



کەلار / ١١ / ٨ / ٢٠٢١

# ئەی قودسی پیرۆز

یـاران وا دیســـان کولــیاوە زامـی دڵـی ســووتـاوم
دیسان هاتەجۆش کوورەی دەروونی پڕ لە زووخاوم
بۆ لە دەستدانت ئەی قودسی پیرۆز هەزار مەخابن
وەك نمەی باران فرمێسکی خوێنین ئەتکێ لە چاوم

****

لـەپاش (سەڵاحەدین) کـە چی پـەیـدا نـەبـوو کەسێ[٣٩٣]
ســەد مەخـابن کـــە نەبـوو، دەسـتت بگـرێ دەسێ
هەمیشـە داگیـرکراوی دەسـتی ستەمکار و نـەیـاری
گەردەلولی دووکەڵی خەمە لەنێو سینەت هەڵدەسێ



کەلار / کانوونی یەکەم ٢٠١٧

---

[٣٩٣] سەڵاحەدین: سەرکردە (سەڵاحەدینی ئەیوبی)، کە لە ساڵی (١١٨٧ ز) قودسی رزگار کرد.

تێبینی: ئەم شیعرەم (ئەی قودسی پیرۆز) وەك هەست کردن بە ئێش و ئازارێك نووسیومە بـۆ ئـەو بڕیـارە شوومەی سەرۆکی ئەمریکا (دۆناڵد ترامپ) کە لە ٦ ی کانوونی یەکەم ٢٠١٧ ز واژۆی کرد و دانـی بـەوەدانا کە شاری قودسی پیرۆز پایتەختی ئیسرائیلە.

# هەزار جار نەخێر

هەزار جار نەخێر بۆ سووکایەتی
بـە زاتـی گـــەورەی، مــرۆڤـایەتی
دەریـا بـە دەمـی سـەگ گـڵاو نابێ
هەرچەند نەیاری حەوەحەویەتی[٣٩٤]

****

کەسێ گـەر تـۆزی ژیــر و زانــابێ
زەڕەیەك هۆش و بیـری تیـا مـابێ
ڕێز لـە پیرۆزی خەڵکی تر ئەگرێ
بـا لـە بـۆچوون و ئـاینـدا جیـابێ

****

کـەسی وا هەیـە هەر بەنـاو پیـاوە
بـەڵام بــە کـــردار زۆر نــاتـــەواوە
لـە بارەی ژیری گەر ڕاستت دەوێ
شـایـەنی نـاڵ و ڕەشـمە و لـەغاوە



کەلار / ٢٨ / ١٠ / ٢٠٢٠

---

[٣٩٤] حەوەحەو: (وەڕینی سەگ)، ئەم شیعرەم بۆ ئەو سووکایەتییە نووسیوە کە لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٢٠ (أیمانویل ماکرون)ی سەرۆکی فەرنسا کردی دژی پێغەمەری ئیسلام (د.خ).

# دڵ

دڵ بە ئومێدی خۆشی دونیاوە
کردەوەی چاکەی نەما و پێچاوە
بێ هۆش و نەزان سەرقاڵی دونیا
نەیزانی دونیا خۆی خاوەن داوە

****

دڵێ کە دوور بێت لە زیکری خوا
چۆڵ و وێرانە بێ ماڵە و ماوا
سوپاسگوزای بۆ پەروەردگار
سارێژی زامی دڵە وەك دەوا



کەلار / ٦ / ١٠ / ٢٠٢١

# ئەی پاکی بێگەرد

ئـەی پاکی بێگـەرد خـاوەنی هـەمـوو عالـەم
ئـەی شـــیفـای دەردی دڵ بـە بـێ مـەرهـەم
تـاعەتـی کەمە کەریم قورسـە بـاری تـاوانی
لە ڕۆژی جەزا نییەتی نە ماڵ و نە دەرهەم[٣٩٥]

****

بـە چاوی سـۆزەوە لـــە کـردەوەی بـڕوانـە
کـە لاپـەڕەی کار و کردەوەی، پـڕ لـە تاوانـە
نائومێدی نەکەی لـە دەریای پـڕ لـە سـۆزت
کە سۆزی تۆ دەریـایەکی بێ پەی و فراوانـە[٣٩٦]



کەلار / ٢٤ / ٣ / ٢٠٢٢

---

[٣٩٥] دەرهەم: دراو (پارە) واتا: بەندە (کەریم) لە ڕۆژی دواییدا هیچ شتێکی گرانبەهای نییە بیبەخشێت بۆ ڕزگار بوونی تەنها چاوەڕێی سۆز و بەزەیی تۆیە ئەی پەروەردگار.

[٣٩٦] دەریایەکی بێ پەی: دەریایەکی زۆر قووڵ

# سەیری سەنعەتی خوا بکە

ئەی نەفسی بەد بەسە کەم لە بۆ دونیا هەڕاکە
سەیری توانای خـوا و سروشتی جوانی دونیاکە

ئێمە هەمووومان ڕێبوار و دونیا سێبەری دارێکە
تەقوا لە سـێبەری ئەو دارە، چاکـترین کردارێکە

سەیری کار و سەنعەتی خـوا بکە چەند جـوانـە[٣٩٧]
گوڵ و خونـچە یەکـێکـن لەو بەڵگـە و نـیشـانانـە

کاتێك کـە خونچەیە چەنـد ناسـك و پەرێشـانـە
کـە بوو بە گـوڵ بولـبول لـە بـۆی سـەرگـەردانـە



کەلار

---

[٣٩٧] سەنعەتی خوا: دروستکراوی خوای گەورە.

# تەمەن ڕۆیشت و بەسەرچوو

تەمەن ڕۆیشت و بەسـەرچوو، ئـەی دیلی دەسـتی بێ ئاگـایـی
تەمەن بەهەل بزانە بۆ تەقوا، تــا نـەهــاتووە ڕۆژی دوایـی[٣٩٨]

ئـەی نەفـسـی بـەد هەتـاکـەی، لـە دەریای غەفڵەتا مەلـەوانی
هەموو هەوڵـت بۆ دونـیـایـە و، خەریکی پڕکـردنی گـیـرفـانی[٣٩٩]

دونـیـات بە هــەردوو دەســتت، گرتووە و مردنت ناوە بـەولاوە
هەموو هەوڵـت بۆ دونـیـایـە و، دوا ڕۆژت لـــە بـیـر نـەمـاوە[٤٠٠]



کەلار / تشرینی دووەمی ٢٠١٧

---

[٣٩٨] تەمەن زۆری نەماوە و وریابە ئەوەی ماوە لە چاکەکاری و خواناسیدا بەکاری بێنە تا ماوی.

[٣٩٩] ئـەی نـەفس و ئـارەزووی بـەد و خراپـەکار هەتاکـەی لـەم دونیـادا لـە غەفلـەت و بـێ ئاگایـدا دانـا و سەرمەشـقی) / هـەموو هـەوڵت و کۆشـشت بـۆ بەدەسـتهێنانی خۆشـی و ئارەزووەکـانی دونیایـە و سـەرقاڵی کۆکردنەوەی ماڵ و سامانی.

[٤٠٠] دونیات توند بە هەردوو دەست گرتووە و ژیانی دونیا زۆر لەلات گرنگە و مردنت فەرامۆش کـردووە و لە بیر کردووە،/ هەموو هەوڵت و کۆششت بۆ خۆشی و ئارەزووەکانی دونیایە و سزا و ئەشکەنجەی ناو گۆڕ و دوارۆژ (قیامە)تت فرامۆش کردووە و لە بیر کردووە.

١

دەی ساتێ با لە بازاڕی خەم لادەم
خەم بە نەسیمی شادی بە بادەم
دەغڵ و دانی خەم بسووتێنم
سەراپا بە گڕ و کڵپەی هەناسەم

٢

کام ئاشق لەڕێی ئەشقا تیا نەچوو
ڕێبواری ڕێگای باخی خەم نەبوو
یان وەك دێوانە تا دوا هەناسەی[٤٠١]
گیرۆدەی تیری برۆی شەم نەبوو

٣

ئازیز گەر باسی ناخمت بۆ بکەم
لە لایەکەوە پەردەی دڵ لادەم
ئەوسا ئەزانی من چۆن سووتاوم
چلۆن پڕ بووە دەروونم لە خەم

---

[٤٠١] دێوانە: لێرەدا مەبەست (وەلی دێوانەی) شاعیرە.

٤

کاتێ کـــــــە ویـژدان خـرایـە تـابـووت
دز دەوڵەمەند بوو دەستپاك ڕەش و ڕووت
پێم نـاڵێی ئـیـتـر، لـە کوێ چـاك ئەبێت
وڵاتـێـکـــی وا، وێــــران و پـــەرپـــووت

٥

کە خەمبارم بۆیە یادی ئازیزانم ناکەم
ئەڵێم نەوا خەمیش بە ئەوان ئاشناکەم
با هەر بە ماڵی دڵم ئاشنا و شارەزا بێ
نەك بە ماڵی دڵی، ئازیزانی شارەزاکەم

٦

بە جۆرێك سەیری ئەم دونیـا ئەکەین
وا ئەزانین کە هەرگیز بەجێی نایەڵین
لە بیرمان چوو، کە پێشتـر کەسانی تر
لێرە بوون، ئێمەیش ئەبێ لێرە بڕۆین

## ٧

بە برسی بژی هەتاکو ئەمری
بە مەردی بژی نەك بە نۆکەری
ببە خزمەتکار بۆم نیشتمانە
مەبە کوتەکی، دەست داگیرکەری

## ٨

تەمەنم هەموو، لە پێناوی دڵا لە دەستمدا
کە چی دڵ هەمیشە سەرگەردانە و شەیدا
دڵ وتی: بە فیڕۆ چوو ئەو تەمەنەت
بڕۆ داماو قوڕی پەشیمانی بکە بە سەردا

## ٩

چەندەها جوان لەسەر ڕووی زەوین[٤٠٢]
بەڵام جوانی ڕوخسار، جوانی نین
بەڵکو جوانی، ڕەوشت جوانییە
بەڵام زۆربەمان لێی بێ خەبەرین

[٤٠٢] تێبینی: ئەم چوارینە شیعرەم بە زمانی عەربیش نووسیوە بەناونیشانی ( کم من جمیل).

**١٠**

مەپرسن یاران لەبەر چی وا لێوبەبارم

بـۆ چی ڕەنگ زەرد و مـات و خەمبارم

لــە داخی بێکەسی ئـەم گەلـەیە بـۆیـە

هەمیشە دڵـپەرێشان و زۆر بێ قەرارم

**١١**

دادی خۆت مەبە بۆ لای کەس بێجگە ئەو[(٤٠٣)]

ئـەو بەئاگایە لـــە دەردت، بـە ڕۆژ و شـەو

تاك و بێ شەریکە، تەبیبـە بـۆ دەردی دڵ

زینـدووە و بیســـەرە، زانـایـە بـە بێ خەو

**١٢**

تەمەن چەند کورتە دونیا درێژە

ڕۆژێك تەختانە دەیـان ڕۆژ لـێژە

هـەوڵ و کۆششکە هـەتـا ئەتوانی

لـەو تەنها ڕۆژە هـەر گوڵ بنێژە

---

[٤٠٣] ئەو: وشەی (ئەو) لە زمانی عەرەبیدا مانای (هو)یە، لێردا مەبەست خوای گەورەیە.

**١٣**

دەنکە تۆویەك کە ئەینێژی لە زەویدا
زۆر ئـاســـانـە باڵـندەیەك قـوتی بـدا
بەڵام کە گەورە بوو ئەبێتە درەختێك
هـەزاران باڵـندە لـەسـەری پشـوو ئەدا

**١٤**

ڕازیبـە بـەوەی کـە خـوا پێت ئەدات
لە بۆ خواری خۆت بنوارە گشت کات
ئەم دونیا هەر وەك چارەنووس وایە
هـیچ کەسـێك بەشی کەسی تر نابات

**١٥**

قسەی دوژمن خۆڵەمێشە زوو نامێنێ
گــەر بـا نـەیـبـات، پـێـی پـێـائەنـرێ
چـاکـەکـار و لـێـبووردەبە، لــە ژیـانـا
زمانی بەد بێدەنگ نابێ مەگەر ببڕێ

## ١٦

سوپاس بۆ خوا خووڕەوشتێکی پێداوم
ماستاو ناکەم بۆ کەس لە ژیانا هەتا ماوم
عززەتی نەفسم لە هەمووی گرنگترە لام
شانازیە کە بەو شێوە بووم و خولقاوم

## ١٧

ئەی دادەی شیرین خوشکی ئیماندار
ئەی تاجی سەر و ئەی جوانی ڕەفتار
ئەی خاوەن شەرم و باڵا داپۆشراو
بەرزی و بەڕێزییت دیارە بە کردار

## ١٨

کەمە لەئاست جوانی تۆدا هەرچی بڵێم
فەرهاد ئاسا بێستوونە مەسکن و جێم
مەجنوونێکم لە کێوی تەنیایی ژینا
بە (لام) و (یاء)ی ناوی لەیلا ئەسووتێم

**١٩**

وا نـەزانی کـە ئـافـرەتی ئـیتـر کۆیلـەی
تۆ جوانترین بوونەوەری نێو ئەم ژینەی
کـەمە بۆ تۆ نـیـوەی کـۆمـەڵ تۆ زیـاتـری
تۆ ئـەوین و تۆ سـەرانسـەری کۆمەڵگـەی

**٢٠**

ڕەنگی خوێ و شەکـر هـەردوو هـەر سـپین
تـامی خـوێ سـوێرە و شـەکـریش شـیـرین
تاقیکردنەوە سەنگی مەحەکە ئاشکرا ئەکا
کە سوێر و شـیـرین هەردوو وەك یەك نین

**٢١**

ئـاواتی شـادی نەما دڵ، بەسـیە ئـازاری مـەدەن[٤٠٤]
غـار و دەشت و چۆڵی لەدووری کردە مەسکەن
وەیادی لەیلا دڵ وەکو مەجنون گـیرۆدەی داوە
سیاپۆش و بێ هۆشـە چ پێویسـتە ئـازاری دەن

---

٤٠٤ ئـەو پیتانـەی کـە بـە ڕەنگـی سـوور نووسـراوە ئەگـەر ڕیـز بکرێـت لەسـەرەوە بـۆ خـوار نووسـراوە (ئاغاوەیسی).

## ٢٢

کـەوتمەڕێ لـەنێو دەشـتی پـڕ خەیاڵما
کاتێك بینیم کە تابلۆیەك لەبەردەمما
لـێی نووســرا بـوو بـۆ چـەنـد سـاتێك
میوانمانبە لەنێو باخ و کێڵگەی خەما

## ٢٣

ئیلاهی لــە بەدکرداریم مەڕوانە
کـە نەفسم سـەراپا پڕ لـە تاوانە
دڵ دیل و گرفتاری داوی دونیایە
بەڵام سـۆزت دەریـایەکی فراوانە

## ٢٤

پێناسەی (دونیا)ت ئەگەر بۆ بکەم[٤٠٥]
فـانی و بێ وەفا پڕ خـەم و سـتەم
بۆیە وەك یەکە لە لام هەر هەموو
پادشـا و گـەدا و دارا و بێ دەرهـەم

---

[٤٠٥] ـ فانی: لە فەناوە هاتووە واتا: تیاچوو(تاسەر نەبوو).
ـ دارا: دەوڵەمەند. ـ بێ دەرهەم: هەژار (بێ پارە).

### ٢٥

دونیایە بەرین پڕ لە تەختی و لێژ[٤٠٦]
لەنێویا زۆر جار زینی سورمەڕێژ
ناخرێتە سەر پشت ماینی کەحێلە
ئەخرێتە سەر پشت پانی گوێدرێژ

### ٢٦

لەشکری خەمە کە واز ناهێنێ
ڕێ نادا بە دڵ ساتێ پێبکەنێ
بڕیاری داوە هەرگیز کۆڵ نەدا
هەتاکو ڕیشەی لەبن دەردێنێ

### ٢٧

هیلاکە لاشەی بێ هۆش و هەستم
لەنێو گێژاوی خەما سەرمەستم
تەمەن خەوێك بوو پێمان نەزانی
وەها بێ هوودە دەرچوو لە دەستم

---

[٤٠٦] بەرین: گەورە و فراوان. ــ تەختی: شوێنی تەختایی. ــ لێژ: شوێنی لێژایی. زینی سورمەڕێژ: زینی جوان ڕازاوە. ــ ماینی کەحێلە: ماینی ڕەسەن.

**٢٨**

هەموو شەو لای من، شەوی یەڵدایە[٤٠٧]
هێندە درێژە شەوانی تارم کۆتایی نایە
مەگەر هەر بۆ خەم ڕازی دڵ باس کەم
خەمە بۆ شەوی تار و درێژم وەکو چرایە

**٢٩**

ناخی دەروونم وا ڕاهێناوە
جێی ڕق و کینەم هەمووی تێکداوە
دڵم هەر هەموو کردووە بە بەشێك
ئەو بەشەیش ئاشتیم تێدا نێژاوە

**٣٠**

دڵ سەرمەشقە لە خەما وەکو مەجنوون
لە کێوی عەشقا فەرهادێکە لە بێستوون
ناخی ئەو بە ویردی زاتێك زاخاو دراوە
بۆیە کانی ئومێدی بێباکە لە وشکبوون

---

[٤٠٧] شەوی یەڵدا: درێژترین شەوە. ـ شەوی تار: شەوی تاریك(تاریکە شەو)

## ٣١

لـەوەتـەی هـەم و مـن بـە بیـرم دێ
نەمدیوە هەرگیز کە وا هیچ کوردێ
دڵ ئاسـوودە بێت، هەمیشـە نـەوەی
خەڵتانی خوێنـە لــە شـار و لــە دێ

## ٣٢

ئاخر پێم نـاڵـێن تاوانمـان چییە؟
بۆ چی کوشـتـنمـان زۆر ئـاساییە؟
تـەنها تاوانمـان ئـەوەیـە کـوردین
بـۆیـە وەك گـەلان مـافـمـان نییە

## ٣٣

گـەر بێت و ئەم دڵەی من لـە دەر بووایە
دۆست و دوژمن بە لای ئەوا تێپەڕبووایە
ئەوسـا ئـاشـکـرا ئـەبـوو بـۆ هـەمـووان
کـە چەنـد خـەمـی نیشـتمـانمی لەنێوایە

## ٣٤

با هەر تەنها بم، دوور بم لە نەزان

دوور بم لە کەسی هەرزە و دووزمان

دوور بم لە هەموو، ئا ئەو کەسانە

زمانیان شیرین، دڵ ڕەش قەتران

## ٣٥

ئەزانی چییە وشەی (لەگ لەگی)[٤٠٨]

بە بێ دوودڵی بەزمانی کوردی

واتا کەسێکی بێ ئەرزش و سووك

هەڵقون، هەڵەوەڕ، نەفام و خوێڕی

## ٣٦

چون لەگەڵ خەما دەست لە ملانم

من لەسەر شادی زۆر کەم ئەزانم

ئۆمێدم وایە، ڕۆژێ لە ڕۆژان

سەرپێی هەڵکەوێ، ببێتە میوانم

---

[٤٠٨] لەگلەگی: وەشەیەکی جلفی عیراقیە، دۆستێکم ئەم وەشەیەیە بیستبوو پرسیاری کرد مانای چییە منیش بەم چوارینە شیعرە پێناسەی وەشەکەم بۆ کرد.

## ٣٧

لـەم رەقس و سـەما سـەرم سـوور مـاوە
لـــەم ســـاڵـی تـــازە چیـمان گـۆڕاوە
تەنها بیست و یەك بوو بە بیست و دوو[٤٠٩]
چی تـرمـان دەسـتكەوت لـەوە بـەو لاوە

## ٣٨

ئای چەند بێ بەهایە خۆشی ئەم ژینە
بەڵام ئەفسوس لـە لامان گەلێ شیرینە
هـێنـدە هەوڵـی بـۆ ئەدەین وا ئـەزانین
هەتـا سـەر ڕۆژەكانی هـەر پێكەنینە

## ٣٩

ماڵ و سامان و خۆشی ئەم دونیا
نامێنی بۆ كەس تاسەر لـە تەكیا
تەمەنی لاوی و هـێز و جوانیش
ڕۆژگـار ئەیـبا لــە تـەكی خۆیا

---

[٤٠٩] واتا: هیچ شتێك نەگۆڕاوە بەرەو چاكە و خۆشگوزرانی تەنها ژمارە نەبێت كـە سـاڵی (٢٠٢١) دوو هـەزار بیست و یەك بووە بە ساڵی (٢٠٢٢) دوو هەزار بیست دوو.

**٤٠**

ئـای ئێش و زامی ئـەم نیشـتمانە
ئای دەردی سەختی چەندە گرانە
نەبوو دڵسۆزێ بۆ چـارەی دەردی
بۆیـە بێ نـازە و چاو بـە گریانە

**٤١**

وتم بە تەمەن پێم خۆشە ئەمڕۆ
بـە یەکۆ هـەردوو بکـەین گفتگۆ
بـزانـم بـۆ چـی تـۆ بــە ئـاســانـی
وا تێپـەڕ ئەبیت منیش ڕەنجەڕۆ

**٤٢**

لـەبەر یارە دەمەوێ لـە نەیار، سەرفـی نەزەرکەم[٤١٠]
لـەبەر حوبی ئیمان دەمەوێ کینە لە دڵ دەرکەم
دەمـەوێ هــەر وەکو داری بـەردار بـم هەمیشــە
کـە نەیار بەردم تێگرێ، منیش بەری بەسەرکەم

---

[٤١٠] سەرفی نەزەر: لێبووردن، چاوپۆشی کردن. ـ حوبی ئیمانە: خۆشەویستی باوەڕە.
بەری بەسەرکەم: بەروبووم بکەم بە سەریا.

## ٤٣

تاڵی ئەم نیشتمانە لەلام وەك شەكر شیرینە
دڕك و خاری لە لام وەك گوڵی لالە و نەسرینە
تۆزی خاكی وەك كل و سورمەیە بۆ چاوەكانم
دیمەنی جوانی دەوایە بۆم دڵە پڕ برینە

## ٤٤

لە دووری تۆ بەهارم وەرزی خەزانە[٤١١]
بە بێ تۆ بەهارم پایزە گەڵا ڕێزانە
نەما ئاوازی بولبول لەنێو باخی دڵ
مەزرعەی دڵ لەگەڵ بیابان یەكسانە

## ٤٥

ئازیز بۆ خۆشی هەرچەند تێكۆشی
لە ئازاری دڵ هەرچەند بێ هۆشی
خۆشەویستی تۆ پشكۆی لە دڵما
تابێ زیاد ئەكات هەر گڕ و جۆشی

---

[٤١١] ئەم چوارینە شیعرەم بۆ كاكە (محەمەد)ی كوڕم نووسیوە لە ١٧ / ٤ / ٢٠٢٢

**٤٦**

بلێی ڕۆژی بێ شەماڵی شادی شـنەیە هەڵکا

بەو شنە بایە خەم و پەژارە لە ناخم دەرکا

زامـی نـاسـۆری چـەنـد سـاڵـەی دەروون

ئێش و ئـازاری ئەو دابڕانـە تـەواو سارێژکا

**٤٧**

کە دەرکەوت دوو زوڵفی وەك سیامارت

وەك شـەو لـەدەوری مانگی ڕوخسـارت

دڵ شـەیدا بوو کـە بینی و هاواری کرد

بەسە کافر بۆ چی هـەر قەتڵە کردارت

**٤٨**

زۆر دڵـخـۆش مەبـە بـە پلـە و پـایە

پێنـج و دوو ڕۆژێ هاین لەم دونیایە

دونیا کەپرێکە و ئێمەیش ڕێبوارین

هـەر ساتێ کەسێك لـە سێبەریایە

**١**

**یـاران چەند خۆشـە کە سـادە بژین**

**بە بێ پێویستی بە نەوت و بەنزین**

**٢**

**بـە دەسـتهێنـان و بـەرێوەبردن**

**دووشتن کە زۆر لە یەکجیاوازن**

**٣**

**مێژووی دێرینی باب و باپیران**

**جێی شـانـازیـە بـۆ نەوەکانیان**

**٤**

**گەلـی کـوردە لــە هــەر چوار لاوە**

**بە نەیار و دوژمنانی دەورە دراوە**

**٥**

**کورد لە ڕابوردوو پەند وەرناگرێت**

**بـۆیـە دوژمنی بـە دۆسـت ئەزانێت**

**٦**

ئافرەت گەر ماڵی پاك و خاوێن بوو
بەختـەوەریـە بـۆ مـــاڵ و بـۆ شـــوو

**٧**

گەر لە نێو خەڵکا چرای چاکە کوژایەوە
ئیتـر بزانە کە (وەفا)یش وەفاتی کردوە

**٨**

زوو کۆچت کرد ژیـان هێشـتـا، زۆری مابوو
لە سەیری تۆ من تێر نەبووم، قەدەر وابوو

**٩**

نانێکی وشك بۆ کەسی برسی
لـەگـەڵ پلاوا نییـە جـیاوازی

**١٠**

بڵێی ڕۆژێك ئەم ئاواتەم بێتەدی
ببینـم نـەخشەی دەوڵەتی کوردی؟

**١١**

یەکەم دراوسێ دواتر شوێن و جێ
بۆ گەشت و بۆ ڕێ گرنگە هاورێ

**١٢**

پێنووست لە باتی مورەکەب گوڵاو ئەبارێنێ
شنەی شەماڵی شیعرت خەم لەدڵ ئەتۆرێنێ

**١٣**

وتم ساوەرە جارێ قوربان هەتا ببم بەمیوانت
ساوەرە یان قوبڵیە هەر بە تامە سفرەوخوانت

**١٤**

بە ماڵ و سامان مەنازە قوربان، دونیا بێ تامە
بەشی هەموومان لە کۆتاییدا، پارچەیە خامە

**١٥**

یاخوا بەخێر بێن ئازیزان، بە دیدارتان شادمانم
جێگای ئێوە نێوی دڵە، نەك هەر تەنها دیوەخانم

**١٦**

کەوتنە گفتوگۆ هەردوو پێکەوە دڵ لەگەڵ پیاڵە
کە کامیان زیاتر لە کێوی خەما شێت و عەوداڵە

**١٧**

زۆر دڵشادم کە ئەبینم، خزمانم لە دەورم جەمە
خۆشحاڵە دڵ، دوور لە پەژارە و لە خەمە

**١٨**

بێ ئومێد نابم هەرچەند دڵ پڕ بێ لە خەم
ئومێدم بە تۆیە ئەی خاوەنی سۆز و کەرەم

**١٩**

لافاو هەرچەندە کەف و لم بێنێ
کەف ئاو ئەیبات و لم هەر ئەمێنی

**٢٠**

سەرم بەرزە تۆ پێشەوا و سەردارمی
ڕۆژی دوایی تۆ شەفیعی کردارمی

**٢١**

دڵم بۆ چییە گەر جێگەی ڕازی تۆ نەبێت
سەرم بۆ چییە گەر بەردەبازی تۆ نەبێت

# خَوفٌ منَ اللهِ

فلیکن خَوفُ اللّه حصناً بَینَكَ وَ بینَ الذنوب[٤١٢]
وَ کُن کالثلجِ في بیاضها و ماءٍ عندما یَذوب

أو کُن کالقمرِ فِي ضیائها خالٍ من کُل العِیوب
أو کُن کالشمسِ جمیلاً حتی في وقت الغروب

لا تکُن کالهموم وَلکن کُن کالسعادة في القلوب
کُن مَسکیناً و لا تملي بالمال الحرام الجیوب

* * *

کلار / ٢٠١٦

---

[٤١٢] ئەم شیعرەم بە زمانی عەرەبی نووسیووە لە بارەی ترس لە خودا و گویڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی، مانای شیعرەکە بە کوردی واتا:

لە ترسی خوا ـ با ترسی خوا بەربەستێك بێت لە نێوان تۆ و تاوانەکاندا، وەك بەفر بە لە سپێتیدا و ئاویشبە کاتێ کە دەتوێتەوە، یان وەکو مانگ ڕووناکبە و پاك و بێ گەردبە، یان وەکو خۆر جوانبە تەنانەت لە کاتی ئاوابوونیشیدا، مەبە بە خەم و پەژارە بەڵکو ببە بە شادی لە دڵەکاندا، هەژاربە و بە سامانی حەرام پڕ مەکە گیرفانەکان.

# فَلابُدَ للموتِ

فـلابُـدَ للمـوتِ أن يَدركـكَ يَوماً
إِن كُنتَ سَعيداً أو كُنتَ مَهموماً

وَلابُدَ أن تـرحَلَ ظالماً أو مَظلوماً
فاحـذَر أن تخـرُجَ مِنها مَـذءُوماً [٤١٣]



کلار / ٢٠١٧

---

[٤١٣] مـذءوماً: ئـەم وشـە لـە قورئـانی پـیرۆز لـە ئایـەتی ( ١٨) ـی سـوورەتی (الاعـراف) کـە خـوای گـەورە فەرموویەت: (قال اخرُج مِنهَا مَذءُوماً مَدحُوراً) لـە بەهەشـت دەرچۆرە دورەوە بـە سەرشـۆڕی و ڕسـوایی و دەرکراوەی.
ئەم شیعرەم بە زمانی عەرەبی نووسیووە لە بارەی شیرینی زمان و ڕەوشتی جوان، پێویستە مرۆڤ هەمیشـە بە زمانی شیرین و ڕەوشتی جوان هەڵسوکەوت بکات لە گەڵ کەسانی بەرامبەردا، مانای شیعرەکە بە کوردی واتا:
ـ ئەبێ مردن ڕۆژێ یەخەت بگرێ ـ ئەگەر شادی بی و ئە گەر خەمبار ـ ئەبێ کـۆچ کـەی سـتەمکار بـێ یـان سـتەملێکراو ـ وریابـە سەرشـۆڕو ڕسـوا لێـی دەرنەچـیت (وریابـە لـەم دونیـا بـە تاوانبـاری کۆچـی دوایـی نەکەیت).

# كَم من جميلٌ

كَم مِن جَميلٍ على الارض يَمشون [٤١٤]

لكن ليس الجمالُ جمالَ الوجهِ و العيون

بَل الجمالُ ، جمالَ النطقِ و الكَلام

و لكن اكثرَ الناسِ بهذا الجمالِ لا يدركون



کلار / ٢٠١٧

---

[٤١٤] ئەم چوارینە شیعرەم بە زمانی عەرەبی نووسیووە لە بارەی شیرینی و جوانی قسە و گفتوگۆیە، چونکە جوانی مرۆڤەکان بە ڕەنگ و شێواز نییە بەڵکو بە شیرینی و جوانی قسە و گفتوگۆیانە، مانای شیعرەکە بە کوردی واتە:

چەندها جوان لەسەر زەویدا دەژین ـ بەڵام جوانی ڕووخسار و چاو جوانی نین ـ بەڵکو جوانی جوانی ڕەوشت و گفتوگۆیە ـ بەڵام زۆربەی خەڵك لەو جوانیە بە ئاگانین،

# كَيفَ لا أَسجدُ

كَيفَ لا أسـجُـدُ لِخـالـقـاً، يُداوي جَرحي وَ أحزاني[٤١٥]

كَيفَ لا أسـجُـدُ لِخـالـقـاً، إنـي لا أراهُ وَ هـوَ يَـراني

كَيفَ لا أسـجُـدُ لِخـالـقـاً، لِمَـن اسـمـهُ واحِدُ الأحد

كَيفَ لا أسـجُـدُ لِخـالـقـاً، لِمَـن اسـمـهُ اللّهُ الصَـمَـد

كَيفَ لا أسـجُـدُ لِخـالـقـاً، خالـقُ الكَونِ وَ الأسـباب

كَيفَ لا أسـجُـدُ لِخـالـقـاً، صاحبُ القلمِ يومَ الثواب



كلار / ١٤ / ٢ / ٢٠٢١

---

[٤١٥] كَيفَ لا أسجُدُ لِخالقاً: چۆن سوژدە نەبەم.

تێبینی: هەر ئەم هۆنراوەیەم بە زمانی کوردی نووسیوە بەناوی (چۆن سوژدە نەبەم).

# لَكَ مني

لكَ مني سلامٌ و خالص تحياتي[٤١٦]
نشيدُ انغامهِ من أجمل الأبياتي

رَقيقٌ كالقلبِ و ريحهُ كالأزهارِ
وَ جَمالُ نورهِ ساطعٌ بَينَ الأنوارِ



كلار ٢٠٢٠

---

[٤١٦] لكَ مني: لە منوە بۆ تۆ.

تێبینی: ئەم شیعرەم یەکێکە لە شیعرە عەرەبییەکانی بەندە (کەریم ئاغاوەیسی).

# من لا یقولُ ئەم سالّ؟

(من لا یقولُ) ئەم سالّ، هەزاران خۆزگەم بەپار[٤١٧]
خاكێكی (كُلَ نفطٌ)، (و شعبُهُ) هەژار[٤١٨]

(شَبابنا بدون) كار، (جالسین) لە بن دیوار[٤١٩]
(الناسُ) گشتی (حزین)، (في القريةِ أو) لە شار[٤٢٠]

(أكثرُ الناسُ) نییانە، نە جێگا (ولا دینار)[٤٢١]
(و العملاء) هەیانە، تەلار و (قصر) و دۆلار[٤٢٢]

(و الفقیرُ كُل) كاتێ، (یعیشُ) لە ژێری بار[٤٢٣]
(شَعبٌ نظیفٌ) دلّیان، (و أعدائه ُ) وەكو مار[٤٢٤]

---

تێبینی: ئەم شیعرەم (من لا یقولُ ئەم سالّ) وشەكانی عەرەبی و كوردیم تێدا تێهەلّكێش كردووە، گرنگی لەوەدایە كەسانی كورد و عەرەبیش لە ماناكەی تێدەگات.

٤١٧ من لا یقولُ: كێ نالّێ.

٤١٨ كُلَ نفط: هەمووی نەوتە. — و شعبُهُ: وە گەلەكەی.

٤١٩ شَبابنا بدون: لاوەكانمان بەبێ. — جالسین: دانشتوون.

٤٢٠ الناسُ: خەلّكی. — حزین: خەمبار. — في القريةِ أو: لە دێ بێ یان.

٤٢١ أكثرُ الناسُ: زۆربەی خەلّكی. — و لا دینار: نە دینار.

٤٢٢ والعملاء: داردەستەكان، خۆفرۆشان. — قصر: بالّەخانە.

٤٢٣ و الفقیرُ كُل: وە هەژاریش هەموو. — یعیشُ: دەژی.

٤٢٤ شَعبٌ نظیفٌ: گەلێكن پاكە. — و أعدائه ُ: وە دوژمنانی.

(قَومٌ كَثيرُ ال) ئەژمار، (و الحقوقُ) نا دیار[٤٢٥]
(الأعـداءُ) بەردوام، لە شەو (و في النهار)[٤٢٦]

دوژمنان (لا يُريدون)، لە بۆ ئێمە (استقرار)[٤٢٧]
(من أجل كُلِ هذا)، دڵمان پڕیە لە ئازار[٤٢٨]

***

کەلار / حوزەیرانی ٢٠١٧

---

٤٢٥ قَومٌ كثيرُ: نەتەوەیەکی زۆر. — الحقوق: مافەکان.
٤٢٦ الأعداءُ: دوژمنان. — في النهار: لە ڕۆژدا.
٤٢٧ لا يُريدون: نایان ئەوێ. — استقرار: ئارامی.
٤٢٨ من أجل كُلِ هذا: لە پێناوی هەموو ئەمەدا.

# پێنج خشتەکی کەریم ئاغاوەیسی لەسەر شیعری

## (م. بکر کانی هەمزەیی)

تەمەن هەلێکە مەیدە لە کیسە
لوت بەرزی خویە پیس و نەگریسە
لە دونیایش بەشی کوتەك و لیسە
خۆ بەزل زانین دەردێکی پیسە
گوڵی تەمەنی ژاکاوە و سیسە

خوو ڕەوشتێکە بە سەریا زاڵە
چاك بونی ئەوان گەلێك مەحاڵە
ئاسان ناگۆڕێ خوی ئەو چەند ساڵە[٤٢٩]
هەرچەندە هەوڵدا هەوڵی بەتاڵە
لەناو کۆمەڵگە، وەك زرکی تاڵە

لە هەر جێگایەك کە ئەوی لێیە
خەڵکی ناپرسێ شارە یان دێیە
کەس لێی ناپرسێ کە کوڕی کێیە
سووکە ڕسوایە، لە هەموو جێیە
خۆیشی نازانێ، مەنزڵی کوێیە

---

[٤٢٩] واتە: خووڕەوشتێك کە چەندین ساڵ لەسەری ڕاهاتبێ بە ئاسانی ناگۆڕێت.

لە ئاستی خەڵکی وەك کوێر و کەڕە[٤٣٠]
ئێسك قورس و درژ چارەی بێ فەڕە
سووك و بێ بەها وەك پووش و پەڕە
وتـەی بـێ ڕەواج وەك تـووری تـەڕە
پێشـینـان دەڵێت، عـاقیبەت شــەڕە
بەهۆی ئـەو خووە پیسـەی تێیدایـە
خـۆ بــــە زل زانـین ڕەوشـــتێ وایـە
قسـەی لای خەڵـکی زۆر بێ بەهایـە
وەك بەڵمی ژێـرپێی گـا گـیرە وایـە
لـە هەموو شوێنێ سوکـە و ڕسوایـە
خۆت چاك ئـەزانی ڕۆژگـار وەهایـە
ئـەمــە گـوزەران و حـاڵـی دونیــایـە
هـەزاران وەك تـۆ لـە ژێـر خـاکـایـە
کـاکـە لـوت بـەرزیت بـەکـارت نـایـە
تـالـوتت بـەرزبـێ، عەمـرت بـەبـایـە

[٤٣٠] واتا: لە ئاستی چاکە و پیاوەتی خەڵکی وەك کوێر و کەڕ وایە، (چاکە و پیـاوەتی کەسـانی تـری لەبـەر چاو نییە)

تاکەی خەریکی خواردن و خەوی
یان ستەم کردن لە ئەم و ئەوی
چەند مل ئەستووربی ڕۆژێ ئەکەوی

مەنازە بە خۆت برای مل قەوی
هەزاران وەك تۆ چەماوە و نەوی

هەزاران وەك تۆ جێما لە کاروان
نەیان ما نەباس نەناو نەنیشان
بوون بە خۆڵەمێش بنی ئاگردان

بۆ ئەوەی نەبی بە پەندی زەمان
خۆت بپارێزە لە تیری زمان



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ٢٩ / ٤ / ٢٠٢٠

## پێنج خشتەکی کەریم ئاغاوەیسی لەسەر شیعری

## کامرانی حەمە کوردە ( کامەران جاف )

دوژمنانی گەل لەوەتەی کە هەن
بە شەو و بە ڕۆژ هەر هەوڵ ئەدەن
بۆوەی ناسنامەی کورد لەناو ببەن
میللەت ڕێ نادا وڵات داگیرکەن
خاکی نافرۆشێ خۆی ناکا بە پەن

دوژمنی ئەبێ لە بۆی شاهیدبێ
ناوی لە هەموو دونیا واریدبێ
گەلانی تریش لێی موستەفیدبێ
میللەتێ کە وا کانگای شەهیدبێ
سۆزی بۆ وەتەن مارش و نەشیدبێ

هەتاکو ماوە دژی ستەمکار
ئەجەنگی دژی خائین و بەدکار
خەمخۆری گەلە لە دێهات و شار
بە پارە و بە پووڵ دۆلار و دینار
خاکی ناداتە دوژمن و نەیار

❋ ❋ ❋

کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ٣٠ / ٤ / ٢٠٢٠

## پێنج خشتەکی کەریم ئاغاوەیسی لەسەر شیعری

## (مامۆستا فایەق شێخ لەنگەری)

ئـازیـز بـۆ تـۆ پـەرێـشـــــانـم
دڵ پـەشـــێـو و ســـەرگــەردانـم
پێـشـکـەشــت بـێ دڵ و گـیـانـم
زۆر لـــــە مـێـژە چـــاوەڕوانــم
بـــۆ گـــوڵـــزاری حـــــەزەکـانـم

بـاچەند ساتێك خـەم بە باکـەم
لـەگـەڵ شـادی دەس لـە مل کـەم
بڵـێـم ئـۆخـەی دوورم لـــە خـەم
وەك پـەپـوولـــە گەشـــتێ بکـەم
هـێدی، هـێدی، ســـەفـەر بکـەم

لـەگـەڵ نـەسـیـمـی بـەربـەیـان
یـــان کــڕێـوەی وەرزی زســـتـان
کـــەوتوومـە ڕێ بـە بێ وچــان
ڕێـگـەش دوورە، ڕووەو کوێستان...
بۆ هەر چوار پارچەی کوردستان...

بۆ ئـــازادی ئـەبـێ هـەوڵــبـەم
بـە کـردەوە نـەك هـــەر بـە دەم
ئـەوسـا ئـەبـێ بـۆنـی گـوڵ کـەم
لـــە لالــــەزارێ پـشــــوو بـەم
لـەنــاو بــاخ و گـوڵـزار و چـەم
لـەنێـو گـوڵ و گـوڵاڵـەی سـوور
گـشـت بگـەڕێـم لـەخـوار و ژوور
سـنـە و سـابـلاخ، تـا شـارەزوور
بـە ئـــازادی و بـە بـێ ســـنـوور
بـــبـرم ڕێـگـــایـەکـــی زۆر دوور

❋ ❋ ❋

کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ٢٨ / ٦ / ٢٠٢٠

# پێنج خشتەکی (م. بەکر کانی هەمزەیی)

## لەسەر شیعری (کەریم ئاغاوەیسی)

لــەوەتـەی هــەم گـیـرۆدەی ئێش و دەردم
کـەسێ نـەبـوو بکا چـارەی ڕەنگـی زەردم
لـەنـاو لـیتاوی زەمـانەش هـەناسـە سـەردم
پـەشـیـمان نیـم لـە ئەو کـارەی کـە کـردم
چـیـم کـردووە، لــەوە زیـاتـر وتـم کـوردم

ســەری ڕمـی قینم لـەنـاخم چـەقـانـدووە
هـەمـوو جەستەم هـەوی خـەمی کـردووە
تەماشـا لەحاڵی دڵی ئـەم جەسـتە مـانـدووە
چ تـاوانێکم ئـەنجـامـدا، چـیـم بـردووە
دەسـا بـڵێ خـاکـی کێم داگـیر کـردووە

هەتاکـەی فـرت و فێڵت، نـاخم وەك ئـاگـرە
دەسـتـی زوڵـمت بـە نـەفـرەتبێت داگـرە
بـۆ نـەجاتی ئێشی گـیانـم، مردنم لا چـاترە
دووژمن بەسـە، لـە تـاوانـت دەست هەڵگرە
بـیـربـکـەرۆ لــە ڕابـردووت، پەنـد وەرگـرە

گەلێ خۆی گۆڕی و زانرا پێی لەو کەوڵەیدا
سەری بەشەقی لاونم، چووە ناو ئەو گلەیدا
ملی قرتا، نەما باوی کرا سەر ئەو چڵەیدا
زۆر کەسانێك لەپێشی تۆ ئەو هەوڵەیدا
کە گەلی کورد قڕ بکات و لەناوەیدا
نزای زەلیلیمان کارێکی وای پێ کردن
وەکو زەڕنەقوتەی بەر بارانی پێ کردن
لەسەر سەختی لە بێ عاری نەمردن
بەڵام خوا کارێکی وەهای پێ کردن
بوونە پەندی زەمانە، ئابڕووی بردن
لە مێژە ئەم گەلەم داماوە بێ پەنایە
ئالودەی دەستی زووڵمێ بێ هاوتایە
لەسەر سینەی شەڕ و غەوغاو هەرایە
ڕاستە گەلی کورد بێ کەس و تەنهایە
بەڵام کەسی هەموو کەسێك هەر خوایە



م. بەکر کانی هەمزەیی
١٢ / ١٢ / ٢٠١٩ قەزای شارەزوور

## نامەی شیعری کەریم ئاغاوەیسی بۆ شاعیر لەتیف هەڵمەت

نامەیەك لە پێدەشتی بەرینی گەرمیان
بۆ مامۆستا (هەڵمەت)ی، پیری شاعیران

لەپاینی قەڵای بەرزی شیروانەی شێران
لەکەناری ڕووباری دڵرفێنی سیروان

سڵاو بۆ نووسەر و ئەدیبی دڵفراوان
بۆ پیری دەست بە پێنووس و گۆچان

بۆ کانگای وشە و شیعر و پەخشان
بۆ پیری ڕوناکبیر و هزر و هەست جوان

بۆ لەتیفی شاعیر و دڵسۆزی نیشتمان
بۆ سومبول و شۆڕە سواری تێکۆشان

نەك هەر سڵاو، ڕێز و سڵاوی بێ پایان
بۆ تۆی شاعیر و نووسەری دەیان دیوان



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ١٤ / ٨ / ٢٠٢٢

## نامەی شیعری (لەتیف هەڵمەت)ی شاعیر بۆ کەریم ئاغاوەیسی

گوڵــدەســــــــــتەی وڵام
بۆ کاك کەریم ئاغاوەیسی برام

وشـــەی وڵامم گوڵـی ســپی یە
بۆ کاك کەریمی ئاغاوەیسی یە

سـومبولـی ئـاشــتـی وڵاتی گـەرمیان
خێرخوازی دیـاری هەموو کوردستان

شیعری شـیـرینە وەك ئاوی سیروان
هـــەر ئـاشــتـەوایـی دەبـا بـۆ مـاڵان

بـەدڵ و شـیعر و کـردار خـێرخـوازە
شـیعری پـڕە لــــــە خەیـاڵـی تـازە

کـۆتـری یـادتـان نـامەکـەی گـەیـانـد
بای باڵی .. دڵمی بەگوڵستان چانـد

دڵ بـوو بـە گوڵزار بەچلـەی هـاوین
یاخـوا ئێوەش هەر بە خۆشی بـژین

فـریـادڕەســتـانبـێ خـوای پـەروەردگار
ناوبانگتان گەش بێ وەك خۆری بەهار

زۆر زۆر دڵخۆش بووم بەنامەکەتان
بـەگـوڵ نـووســیـومە وڵامەکـەتان[٤٣١]

* * *

براتان - لەتیف هەڵمەت

١٤ / ٨ / ٢٠٢٢

---

[٤٣١] ئەم نامەشیعرییە شاعیری گەورەی کورد مامۆستا (لەتیف هەڵمەت) وەك وەڵامێك نووسیویەتی بۆ نامەکەی بەندە، کە لە هەمان ڕۆژدا لە ١٤ / ٨ / ٢٠٢٢ بەم نامە شیعرییە وەڵامی دامەوە.

## نامەی شیعری ( کەریم ئاغاوەیسی ) بۆ ( جوتیار مەردۆخی )

## بۆ برای بەڕێز: شێخ لەتیف شێخ کەریم ( جوتیار مەردۆخی ) شاعیر

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان
لە کەلاروە پایتەختی گەرمیان

بۆ برای بەڕێز، خەمخۆر و شاعیر
سڵاوێ بۆن خۆش لە گوڵ و عەبیر

برای بەڕێزم، (جوتیار مەردۆخی)
شاکاری شیعرت پڕشەنگ و شۆخی

دونیایەك ڕێز و تەقدیر و سڵاو
بۆ تۆی شاعیرو مەردو کەڵە پیاو

سڵاوێ جوان و ناسکتر لە گوڵ
فێنك کاتەوە کەف و کوڵی دڵ

لەپاشی سڵاو ئەی برای شیرین
یاخوا هەمیشە بە شادی بژین

هەر پایەدار بیت هەتاکو ماوی
شایەنی هەزار ڕێز و سڵاوی

هەرگيز وشك نەكا كانی ئەشعارت
هەميشـە گەش بێت گوڵی بەهارت

هـۆنـراوەكـانـت جـوان و شــاكـاره
سـۆزت بـۆ وەتـەن، تێـيـدا ديـاره

دڵسـۆزيت لـەبـۆ خاكـی نيشـتمان
ڕەنگ ئەداتـەوه لەنێـو شـيعرەكان

مـافـی خـۆيەتی دێـی شـيوی قازی[٤٣٢]
بـەكـەسـێ وەك تـۆ بكـات شـانـازی

ياخـوا قـەرداغ هــەر ئـاوەدان بێت
دووربێت لە ئافات دەشتايی و لادێت

دوو هەزارو بيست، لە هەشتی ئايار
(كەريم ئاغاوەيسی) لە شاری كەلار



كەريم ئاغاوەيسی / كەلار / ٨ / ٥ / ٢٠٢٠

---

[٤٣٢] شيوی قازی: يەكێكە لـە دێهاتـەكانی (گونـدەكانی) ناوچـەی قـەرەداغ، شـوێنی نيشـتەجێ بـوونی (شـێخ لەتيف شێخ كەريم)ی شاعيرە كە ناسراوە بە (جوتيار مەردۆخی) شاعير، وە ئەم نامە لـە كتـێبی شـيعری " ڕازی قەرەداغ نووسينی جوتيار مەردۆخی " لە لاپەڕە (٢٠٢ ) تۆمار كراوە.

## نامەی شیعری شێخ لەتیف ( جوتیار مەردۆخی ) شاعیر
## ( بۆ خاڵی بەڕێز و شاعیر خاڵە کەریم ئاغاوەیسی )

نامە ئەنوسم لە پەڕی گوڵ باخ
با نوێنەرمان بێت شەماڵی قەراخ

لەگەڵ کازیوەی بەیانی بەهار
هەتا ئەگاتە شارەکەی کەلار

بچێتە خزمەت شاعیری دڵ ساف
بەڕێز ئاغاوەیس لە خاڵوانی جاف[٤٣٣]

خاوەن قەڵەم و بەهرە و ئەدەبە
لە عەشرەتی جاف خاوەن نەسەبە

لەگەڵ خەمخۆران لەپێشۆ دیارە
خاکی و بە هەڵوێست خاوەن ویقارە

هەر لە دورەوە یەکمان ناسیوە
لە باخی ڕێزی، ڕێزی چنیوە

---

[٤٣٣] ئاغاوەیس: نازناوی بەندەیە (کەریم ئاغاوەیسی)، ئاغاوەیسی یەکێکە لە تیرەکانی ئێلی جاف.

جوتیار بەو ڕێـزە بەهرەمەند بووە
بـە ڕێـزی بەڕێـز، دەوڵـەمەنـد بووە

چونکە چەپکە ڕێز ئەکەن بەدیاری
چـەپکـێ هـات بـۆ من بـۆ یـادگـاری

ئـەم جـۆرە پـیــاوە مـانـدو دیــارن
بـۆ نـەتـەوەیــان خــاوەن کــردارن

خنجـەری دەبـان بـە زاخـاو جوانـە
دژی ســەرکـزی و دیـل و زیـنـدانـە

بـۆ جوتـیـار بـوون بـەهـۆی شـانـازی
لـەگـەڵ دیـدارت لـە شــیوی قـازی[٤٣٤]



جوتیار مەردۆخی ـ لە قەرەداغ ـ ٢٣ / ٥ / ٢٠٢٠

---

[٤٣٤] شیوی قازی: وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد یەکێکە لە دێهاتەکانی ناوچەی قەرەداغ.
وە ئەم نامە لە کتێبی شیعری " ڕازی قەرەداغ نووسینی جوتیار مەردۆخی " لە لاپەڕە (١٩٨ ) تۆمار کراوە.

## نامەی شیعری **كەریم ئاغاوەیسی** بۆ ( م. عبدالرحمن تاوگۆزی )

یەكەم بەناوی خوای تاك و تەنها
زانای نهێنی و ئاشكرا و پەنها

دواتر دونیایەك تەقدیر و سەلام
لە منەوە بۆ تۆ (تاوگۆزی) برام

هاوڕێی ئازیز و مامۆستای شیرین
لە خوام داوایە بە خۆشی بژین

هاوڕێی چاك ئەڵێن وەكو برایە
وەك كانزای زێڕە هیچی لێ نایە

خاوەنی عەهد و وەفا و پەیمانە
پشت و پەنایە ڕۆژی تەنگانە

بە تایبەت كەسی دڵپاك و دڵسۆز
جێی شانازیە بۆ گەل و بۆ هۆز

ڕاستە هەموومان كە بەندەی خواین
من ناڵێم هاوڕێین من و تۆ براین

***

كەریم ئاغاوەیسی / كەلار / ٢١ / ٨ / ٢٠٢٠

## نامەی شیعری (م. عبدالرحمن تاوگۆزی) بۆ کەریم ئاغاوەیسی

(( بەناوی خوای بەخشندە ))

بەنـــاوی زاتـی بـــەرزی کــــردگــار
چاکـەی بێ سـنوور نـایەتـە ئـەژمـار

ئـازیـزە بـرای شـیرین خولـق و خوو
لـــە دڵا پـەسـەنـد نـــازاری گـوڵـدوو

نـامـەی دڵسـۆزیت گـەیشـتە دەسـتم
چـرا بـۆ مــاڵ و تـەزوو بـۆ هەسـتم

پـیـتـی نــامـەکـــــەت وردە بـــارانـە
پـەیـڤـت شـەکـراوی کـۆڕی یـــارانـە

گـوفـتـــارت بـەڵـێ: بـــە زاری دڵـــە
بـەرامەی مـێـخـەك لـەڕەنگی گـوڵـــە

(ئاغاوەیسی) گیان بەو لوتف و ڕێزە
بـۆ بـــرایـەتـی هـــەوێـنـی هـــێزە

هـەر شەنگ و شۆخی بەهاری ژینت
گـوڵـی چـوار وەرزە گوڵـزاری ڤینت

( تاوگۆزی) بـە ڕۆح نـاردی سـڵاوی[٤٣٥]
مـــرواری مـیـهـرو، سـۆزی گـوڵاوی

*** 

عبدالرحمن تاوگۆزی
٢٧ / ٨ / ٢٠٢٠

---

[٤٣٥] تاوگۆزی: نازناوی شاعیر مامۆستا عبدالرحمن تاوگۆزی.

تێبینی: ئەم نامە شیعریە مامۆستا عبدالرحمن تـاوگۆزی شـاعیر لـە ٢٧ / ٨ / ٢٠٢٠ نووسـیویەتی بـۆم، وەك وەڵامێك بۆ ئەو نامەی کە پێشتر من بۆ ئەوم ناردبوو.

# نامەیەك بۆ حسەین عەلی بەگی سەلیم بەگی جاف

بـۆ بـرای بـەڕێـز کـاکـە حسـەین جاف
شـاعـیـری دیـاری مـەردی سـینـە سـاف

دڵـخۆشـم بـە ئـەو خەسـڵـەتەی هـەتـە
پـاکـی و دڵـــسـۆزیت مـێـژوو شـایـەتـە

هـەزاران ڕەحـمـەت لـە پێشـینـان وێ
وتیان گـیـا لەسـەر بنجی خـۆی ئەڕوێ

بـۆیـە خۆشـمەوێ کەسی مـەرد و چاك
چونکە دڵـسـۆزن بـۆ گـەل و بـۆ خاك

ئـەم هەســت و سـۆزە خـودا پـێـی داوم
هەمـیشـە لـە یـادی، نـاکـەم تـا ماوم

هەرکەس ئەو هەست و سۆزەی تێدابێ
بـۆم گـەل و خـاکـە وەکو خـۆم وابێ

وەکـو تـۆی بـەڕێـز، خۆشـەویسـتـە لام
جارجار دەینـێرم، بـۆی نـامە و سـەلام

❋ ❋ ❋

کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ٣٠ / ٦ / ٢٠٢٠

## نامەی شیعری (کەریم ئاغاویسی) بۆ (کەمال کۆڵنەدەر)

بـۆ بـرای بـەڕێـز کـەمـاڵ کـۆڵـنـەدەر
خـاوەنی دەنگـی پـڕ بـەهـرە و هـونـەر

پێـش هـەمـوو شـتێك بـرای بـەڕێـزم
پێشـکـەش بێ بـە تـۆ سـڵاو و ڕێـزم

دەنگی زوڵاڵـت هـەمیشـە خـۆش بـێ
گوڵی ژیـانـت هـەمیشـە گـەش بـێ

زۆربـەی دۆسـتـانـم وایـە بـۆچـوونیـان
دەنگت لـەگەڵ دەنگ شوکرەڵڵای بـابـان[٤٣٦]

هـەردووکتان دەنگتان وەکـو یـەك وایـە
ئەو بەهرە جوانەیش نیعمەتی خـوایـە

---

[٤٣٦] شوکرەڵڵای بابان: خاوەنی دەنگێکی خۆش دڵگیربوو کە شیعری زۆر لە شاعیرە گەورەکانی بە دەنگی خۆی تۆمار کردووە.

ئەم نامە شیعریە بەندە (کەریم ئاغاویسی) لە ٢٠/ ٦ / ٢٠٢١ لە ڕێگەی تۆڕی کومەڵایەتی (فەیسبوك)ـەوە نووسیومە بۆ شاعیر (کەمال کۆڵنەدەر)، شایەنی باسە کاك کەمال کۆڵنەدەر خاوەنی دەنگێکی زۆر خۆش و دڵگیرە لە خوێندنەوەی شیعردا، تا ئێستا چەندین شیعر بەندەی بە دەنگ و ئاوازە خۆشەکەی خۆی خوێندووەتەوە و تۆماری کردووە، دەنگی هاوشێوە و زۆر نزیکە لە دەنگی مامۆستا ( شکرڵڵای بابان)ـەوە.

لـــــە دەربـڕینـی وشـــــە و پیتـەکان
ســادە و دڵـگـیـرە و پـڕ ســۆز و ڕەوان

دەرمــانــە بــۆ دڵ، لابــەری خــەمـە
لـە ئێـسـتـا شـێوە و نـموونـەی کـەمـە

خـوڕەی تاڤگەیـە یان نەغمەی بولـبـول
یان قاسـپە قاسـپی کـەوی خـاڵ لـە مـل

وەك شـنـەی شـەمـاڵ بـۆ فێنكایـی دڵ
بولبول مەست ئەكا لـەسەر پەڕەی گوڵ

بـۆ دەنـگ و سـۆزت هـــەزار مـاشـەڵا
شـاد و سـەربـەز بـی، دوور بـی لـە بـەڵا



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ٢٠ / ٦ / ٢٠٢١

## نامەی شیعری (کەمال کۆڵنەدەر) بۆ کەریم ئاغاویسی

### کاك کەمال کۆڵنەدەر ئەڵێ:

زۆر سـوپاسـتەکەم بـرای شـیـرینم
هـەمیشـە شـادبی غەمبار نەتبینم

لە بیـرم ناچێ ئەو هەسـتە جوانـە
هەستی جوان دایمە لای شـاعـیرانـە

شـاعـیر ئـیـرەیـی نـابا بـە شـاعـیر
لـە خۆی باشتر بێ قەت نابێ دڵگیر

چـونکـە نیـەتـی شـاعـیر زۆر پـاکـە
دایمە هـەوڵ ئـەدا بـۆ کـاری چاکـە

بـەڕێـزم کــــە تـۆ دیـوەخـان داری
لانـەی لانـەواز خـەڵـکـی هــەژاری

لە هەموو جۆرێ خەڵك دێتە ماڵت
ســفـرەت ڕازاوە وەکــو جـەمـاڵـت

هـیـوام وەهـایـە بـە قـەڵــەم و دەم
بنوسـم و بڵێم هەرگـیز کۆڵنەدەم[٤٣٧]

بـرای شـاعـیـرم کـاکـە کـەریم گـیـان
شاد و لەش ساغبی تا های لـە ژیان

هەرچی بنوسم لە وەسف و سەنات
هێشـتا بـە نیوەی بـەرزی تۆ ناگات



برات / کەمال کۆڵنەدەر
سوید ٢٠ / ٦ / ٢٠٢١

---

٤٣٧ ئەم نامە شیعریەی شـاعیر کـەمال کۆڵنـەدەر وەك وەلاّمێـك نووسـیویەتی بـۆ نامـە شـیعریەکەی بەنـدە (کەریم ئاغاویسی) کە لە ٢٠/ ٦ / ٢٠٢١ لە ڕێگەی تۆڕی کومەلاّیەتی (فەیسبوك) ـەوە ئاراستەم کرد.

## نامەی شیعری مەلا سەید ( عبدالقادر تاوگۆزی ) نووسیویەتی:

**بۆ كاك كريم محمد أحمد،**
**پێشەکی سەڵاو لە کاك ( کەریم ئاغاویسی ).**

دەمەکەت خۆش بێت شیرین وەك شەکر
بۆ بەرهەمەکەت دەســـــــتت باڵاتر

گشتیم خوێندەوە ئەوەڵ تا ئاخر
بابەتەکانی یەك لە یەك جوان تر

تەواو تێفکریم ئەوەڵ تا کۆتا
دڵسۆزی بۆ گەل نەتکردووە خەتا

نووسیوتە تەواو بۆ هەموو بابەت
دەستانت خۆش بێ و بژیت سەلامەت

نمونەیەکە کۆتکردووە ڕەنجی چەند ساڵێ
من وام پێ باشە ببێ گشت ماڵێ

ئەرکی سەرشانتە بکەوە سەری
بێ بەش کەسێکە خۆی لێ بکا بەری

بۆ بەرهەمەکەت ئەڵێم دەستت خۆش
لە دوعای خێرم ناتکەم فەرامۆش

دیــارە لات ڕوونــە دەخـوێـنـم پـڕ تــاو
تـا بـۆم بـڕەخسـێ مـانـدوو دەکـەم چـاو

چـونـکــە دڵـنـیـام خـوێـنـدەنـەوەی زۆر
زانـیـن زیـاد دەکـا و ئـاگـا لـە چەنـد جـۆر

دیـفـاعـیـش لــە حـەق ئـەرکـی سـەرشـانـە
بـۆ هــەرکـەس کـە وا ئـەهـلـی ئـیـمـانـە

بـە پـاکـی هـاتـین بـۆ سـەر ڕووی دونـیـا
بـا هـەر بـەو شـێـوەیش بچـینـۆ لای خــوا

لار نـەبـیـنـەوە لـــــــە ڕێــبـازی ڕاس
سـودم لـێ وەرگـرت لـێت دەکـەم سـوپـاس

چـونـکـە لار لای خــوا دامــاوە و کـەسـاس
خـامـەت ڕەنگـین بـێ بـۆ تـوێـژینـۆ و بـاس

بـەرهـەمـەکـەیـشـــت بــەرز دەنـرخـێـنـم
تـوانــای هـــیـچ کــەس، دا نــابـەزێـنـم

بـۆ بـەرهـەمـی تـر دەکـەیـن ئـیـنـتـیـزار
بـە کـۆمـەکـی خـــوای زاتـی کـردگــار

پـیشـــــەی هــەر وایـە (فەقیر تاوگۆزی)[٤٣٨]
بـۆ دۆســـتـەکانی و خـاکـــی پـیـرۆزی

سـەلاوی خــوایـە لـــــە هـەمــوو لایـە
ئـەمـە ئـاخـــرین ووشـــەی کـۆتـایـە

داوام لـــە خــوایـە ئـەو لـەشـەت ســاغ بـێ
نـوســـــراوەکـانـت بـۆ دوژمـــن داغ بـێ

داغ و دەرد و ژان، زۆر لـــــە دڵ جـەمـە
گـشـتـی نـانـوسـرێـت بـەم ســاتـە کـەمـە

لــە نووسـین ئـیـتـر بــا هـەڵـگـرین دەس
خۆمـان بســپـێرین بـە خـودای ئـەقـدەس

بـەشــەر لــــە دوارۆژ نـیـیـەتـی عـیـلاج
ئـەگـــــەر نـەیـبـووبێ، ئـیـمـــانی ڕەواج



سید عبدالقادر تاوگۆزی پیرخضري
چوارشەممە / ٢ / ٦ / ٢٠٢١ زەڕاین.

---

[٤٣٨] ئەم نامە شیعریە لە لایەن مامۆستا مـەلا (سـید عبـدالقادر تـاوگۆزی پـیرخضـري) نووسـراوە بـۆ بەنـدە (کەریم ئاغاوەیسی) بە بۆنەی سەردانی کردنم و پێشکەش کردنی کتێبی (تیرەی ئاغاوەیسی و خێڵەکانی).

## پەیامی شیعری نێوان (م. بەکر و کەریم ئاغاوەیسی) [٤٣٩]

### پەیامی / م. بەکر کانی هەمزەیی:

بەخێرهاتی سەرچاوانم، تۆ منت بەسەر کردەوە
گرەوی گەورەیی خۆتت، لە برای بچووکت بردەوە
هاتنت خۆش حاڵی کردم، بە دیدارت دڵم شادە
گەورەیی خۆت بەجێهێنا، کوردوەتەنی بەکردەوە

=======================================

### وەڵامی/ کەریم ئاغاوەیسی:

هەر ئاوەدان بێت دارو دیارت
جێی شانازیە جوانی ڕەفتارت
هەر پایەدار و هەمیشە شاد بی
هەر گەشاوە بێ شیعر و شاکارت



٩ / ٨ / ٢٠٢٠

[٤٣٩] ئەم پەیامە شیعریەیی نێوانمان بۆ ئەو سەردان و دیدارە نووسراوە کە لە ٦ / ٨ / ٢٠٢٠ بەندە (کەریم ئاغاوەیسی) سەردانی ماڵی (م. بکر کانی هەمزەیی شاعیری)م کرد لە شارەزوور.

# شیعرێکی ( م. بەکر کانی هەمەزەیی ) بۆ ئەم وێنەیە[٤٤٠]



کەریم ئاغاوەیسی لەگەڵ بەشێك لە خزمانی

قوربان گەورەیی ئەبێ هەروابێ
لەگەڵ منالی عەشرەت گشت چابێ

تۆ خۆت شارەزای خزمەتی خزمی
دوورە پەرێزی لە نەفسیەت نزمی

---

[٤٤٠] ئەم شیعرە: یەکێکە لە شیعرەکانی ( مامۆستا بەکر کانی هەمزەیی ) شاعیر کە لە ( ١٠ ی ئەیلولی ٢٠٢٠ ز ) بۆ ئەو دیاردەی هەست و سۆز و تەبایی و یەکڕیزییە نووسیویەتی کە لەو وێنەیەدا دەرکەتووە و پێشکەشی کردووە بە بەندە( کەریم ئاغاوەیسی)، وە هەروەها ئەم وێنە کاتی پێشوازی کردنمە لە خزمانی عەشیرەتی ئاغاوەیسی لە فیستڤاڵی دەیەمی ئێلی جاف لە (٢٦ / ٤ / ٢٠١٩ ) لە گوندی باخانی قەرەداغ.

خـودای بـاڵادەس کـۆمـەك کـارت بێ
هــەر ڕاوەســـاو و بـەر قــەراریت بێ

تۆ خۆت شایسـەتەی ڕێزی خزمـانی
قـەدر و حـورمەتی خـۆشـت دەزانی

هـیوام وەهـایـە وەکـو چـەتـریـان بی
بۆگەورەو بچووك وەلی ئەمریان بی



م. بەکر کانی هەمەزەیی
١٠ / ٩ / ٢٠٢٠

## وەڵامی ( کەریم ئاغاوەیسی ) بۆ ( م. بەکر کانی هەمەزەیی )

بەنــاوی خــوای گـــەورە و بــاڵادەس
کە بەخشـندەیە لەگەڵ هەموو کەس

بۆ برای بەڕێـز مامۆسـتـا و شـاعـیـر
مامۆسـتـا بەکـر دانـا و ڕۆشــنـبـیـر[٤٤١]

دونـیــایـەك ســوپــاس بـۆ وتـەکـانت
لــە بـۆ پەیــام و هـۆنــراوەی جـوانت

هەمیشـە خۆش بێ سەر پەنجەکانت
بـۆ نەخشـاندنی شـیعر و پەخشـانت

بەرەکەتدار بێت خەلـە و خەرمـانت
خـەرمـانی شــیـعـر و هـۆنـراوەکـانت



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ١٠ / ٩ / ٢٠٢٠

---

[٤٤١] ئـەم شـیعرەم: وەك وەڵامێکە بـۆ ئـەو شـیعرەی کـە پێشـتر (مامۆسـتا بـەکر کـانی هەمـەزەیی) لـە ١٠ ی ئەیلولی ٢٠٢٠ بۆ وینەیەکی بەندە و خزمانی عەشیرەتی ئاغاوەیسی نووسیویەتی.

## پەیامی شیعری (م. عومەر جۆلانەیی) بۆ کەریم ئاغاوەیسی[(٤٤٢)]

سـڵاو لـە پیـاوی هـەرد و بنـارم
لـە ڕەئیسەکـەی دێهـات و شـارم

زانـا و دڵسـۆز و حەکیم و دەستپـاك
هەر بژیت شاد بیت پیاوی ئازا و چاك

فیـردەوسـی ئەعـلا ببێ بـە ماڵـت
هـەر نـورانی بێت ڕوی پـڕ جەماڵـت



م. عومەر جۆلانەیی ٢١ / ١٢ / ٢٠٢٠

---

[٤٤٢] ئەم پەیامە شیعریە مامۆستا عومەر جۆلانەیی لە ( ٢١ / ١٢ / ٢٠٢٠ ) لە ڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبوك) ـەوە ئاراستەی بەندە (کەریم ئاغاوەیسی) کردووە.

## وەڵامی ( کەریم ئاغاوەیسی ) بۆ ( م. عومەر جۆڵانەیی )[٤٤٣]

بـۆ بـرای بـەڕێـز مامۆسـتـا عومەر
بـرای بەڕێـزم شـاعـیـر و نووسـەر

گەلـێك دڵـخـۆش بووم بە دیدارتان
سـوپاس بۆ شیعر و وتەی جوانتان

تەمەن پڕ خێر و بەرەکەتدار بیت
لـەنـاو یـارانا هـەر پـایـەدار بیت

دوور بیت لـە دەرد و ئـافـاتی ژیـان
دڵـت پـاراو بێت بـە نـووری ئـیمـان

چاکان دیارن، بـە ڕەنگ و ڕوخسـار
ئـاکاریـان جوانـە بـە وتـە و کـردار



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ٢١ / ١٢ / ٢٠٢٠

---

[٤٤٣] ئەم شیعرەم وەك وەڵامێك نووسیومە بۆ ئەو پەیامە شیعرەی کە مامۆستا عومەر جۆڵانـەیی لـە ( ٢١ / ١٢ / ٢٠٢٠ ) لە ڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبوك) ـەوە ئاراستەی کردم.

## پەیامی شیعری ( خليل عبدالله حاجی ) بۆ کەریم ئاغاوەیسی

**لە پەیامەکەیدا ( خليل عبدالله حاجی ) دەڵێ:**

سـڵاو لــە بـەڕێـز لــە ئاغاوەیسی[٤٤٤]
پرسیاری خزمت زۆرجوان ئەپرسی

ئەڵـێن شـــاعـیری چۆنت ناناسـم
لـــــە زۆر بـوارا گـەلـێ حەسـاسـم



خليل عبدالله حاجی / ٤ / ٧ / ٢٠١٩

[٤٤٤] ئەم دوو دێڕە هۆنراوە خوا لێی خۆش بێت (خليل عبدالله حاجی) شاعیر لە ( ٤ / ٧ / ٢٠١٩) وەك پەیامێك لە ڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبوك) ـەوە ئاراستەی کردم.

## وەڵامی کەریم ئاغاوەیسی بۆ پەیامی ( خلیل عبدالله حاجی )

عەلەیکە سەلام برای بەڕێزم، سڵاویش لە تۆ
کە بۆن خۆشتر بێت لە لالە و شەوبۆ

ئەڵبەت قەدەری، خوا وەها بووە
کە وا نامناسی و منت نەدیووە

هەمووومان نەوەی (ئادەم و حەوا)ین[٤٤٥]
لەو بوارەوە، هەموو وەك براین

ئەگەر لە هۆز و تیرەم ئەپرسی
لە جافی جوانڕۆم لە (ئاغاوەیسی)[٤٤٦]

زیاتر لە سەد ساڵ پێشی ئێستاکە باوباپیرانمان
لە قەڵای جوانڕۆ زێدی گشت جافان

لەویَ ژیاون وەك هەموو هۆز و تیرە و خێڵەکان
بە مەڕ و ماڵات، (گەرمیان و کوێستان)[٤٤٧]

---

٤٤٥ ئادەم و حەوا: باوك و دایکی هەموو مرۆڤایەتی.

٤٤٦ ئاغاوەیسی: تیرەیەکە لە تیرەکانی هۆزی گەورەی جاف.

٤٤٧ گەرمیان و کوێستان: کۆچێکی وەرزییە، تیرە و خێڵەکانی عێلی جاف لە زستاناندا کۆچیان دەکرد بۆ گەرمیان، لە هاوینانیشدا کۆچیان دەکرد بۆ کوێستان (ناوچە سارد و شاخاویەکان).

بە ئاژەڵداری هەوار بە هەوار، کۆچیان کردووە
هـــاتـوونـە (ئـەم دیـوو)، قـســـــمـەت وا بـووە[٤٤٨]

دوای نـەهـــامـەتـی کـــورد و دابـەشـــبـوون
لــەم بـەشــەی باشــوور، وا نیـشـتـەجێ بـوون

کـــە نیـشـــتـەجێ بـوون لــــێـرە مــانـەوە
ئـێـمــەیـش مـــایـنـەوە نـــەوە دوای نـــەوە



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ١٠ / ٧ / ٢٠١٩

[٤٤٨] ئەم دیوو: دیووی عێراق (باشووری کوردستان).

ئەم شیعرەم وەك وەڵامێك نووسیومە بۆ ئەو پەیامە شیعرەی کە پێشتر خوا لێی خۆش بێت (خلیل عبدالله حاجی) لە ( ٤ / ٧ / ٢٠١٩ ) کە لە ڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبوك) ـەوە ئاراستەی کردم.

# شیعرێکی ( غەمناك بەرئاسۆیی ) بۆ کەریم ئاغاوەیسی

## (( هیواخوازی ))[٤٤٩]

هەمیشـە خامە هاوڕێی ژیـانت بێ

پەڕاو گوڵـدانی خامەی جوانت بێ

پێنوسـت نەمـام وەرزی بـەهــار و

ڕێگـات پڕ چرای شـەوی تـارت بێ

* * * *

فـێـنکـی بـەمـۆ جێی هــەوارت بێ

سـیـروان ڕامـاڵـی خـەمەکـانت بێ

شـێروانەی قـەڵای هـەوارانی جاف

تیانووسـی جوانی شـیعرەکانت بێ

* * *

غەمناك بەرئاسۆیی ٢ / ٣ / ٢٠٢١

---

[٤٤٩] هیواخوازی: ئەم شیعرە غەمناك بەرئاسۆیی شاعیر لـە ( ٢ / ٣ / ٢٠٢١ ) بـۆ بەنـدە (کـەریم ئاغاوەیسی) نووسیویەتی، دواتریش سەید حسەین بەرزنجی شاعیر بابەتەکەی دەوڵەمەندتر کردووە بە کورتە شیعرێك وەڵامی غەمناك بەرئاسۆیی شاعیری داوەتەوە.

## پەیامی شیعری ( سەید حسەین بەرزنجی ) لەسەر هۆنراوەکەی غەمناك بەرئاسۆیی کە بۆ ( کەریم ئاغاوەیسی ) نووسیویەتی سەید حسەین بەرزنجی ئەڵێ:

سڵاو لە خۆت و خامەی ڕەنگینت[٤٥٠]
شیعرت بۆ کەریم ئاغای سەنگینت

غەمناك بەرئاسۆی فەرمووت تەواوە
ئەستێرەی ئەدەب وان بە حەواوە



سەید حسەین بەرزنجی

٤٥٠ ئەم شیعرە (سەید حسەین بەرزنجی) شاعیر نووسیویەتی وەك دەستخۆشی لە (غەمناك بەرئاسۆیی) شاعیر بۆ ئەو شیعرەی کە لە ( ٢ / ٣ / ٢٠٢١ ) بەناوی (هیوا خوازی) نووسیویەتی بۆ بەندە (کەریم ئاغاوەیسی.

# شيعرێكی (كامەرانی حەمە كوردە) بۆ ئەم وێنەيە[٤٥١]



كەريم ئاغاوەيسی لەگەڵ خزمانی ئاغاوەيسی لە ٢٩ / ٩ / ٢٠١٨

جەژنتان پيرۆزبێ و هەرخاوەن، كۆڕ و كەرەم و جەم بن

چرای نور و شەمع و پەروانە و، لە تاری شەوا شەم بن

بەرزی لوتكە و كەژ و شاخ و، جامانی و تاجی سەربن

ئاڵا و عەلەم و عيرفان و، ليباسی بەربن

تاج و تەڵا و تاپۆ و، جەوهەر و زەڕبن



كامەرانی حەمە كوردە ( كامەران جاف) ٧ / ٨ / ٢٠٢٠

---

[٤٥١] ئەم شيعرە كاك كامەرانی حەمە كوردە ( كامەران جاف) لە تۆڕی كۆمەڵاتی فەيسبوك بۆ ئەم وێنە نووسيويەتی، وێنەكەيش پێشكەش كردنی وتەيەكە لە كۆبوونەوەی خزمانی ئاغاوەيسی.

# شیعرێکی ( کامەرانی حەمە کوردە ) بۆ کەریم ئاغاوەیسی

## (( بۆ ئاغاوەیسی ))

بـە خـێربێن بۆ هـەواری جاف
جوانـە ئـاغـاوەیسـی لــە جاف
بـەنـدە عـێـل بـەگـی شـاتـریـە
لـــە ئـەلـفـەوە هـەتـاکـو کـاف
****
بـە خـێربـێـن ئـاغـای نـەزەری[٤٥٢]
کـوردسـتـان و کـورد پـەروەری
لـــە جـافـی دولـــبــەری وەتـەن
نـیـگـاکـەن قـەڵا و قـەیـسـەری
****
جاف و قـەڵا و قـەول و قـەرار
ئـاغـاوەیـســی جـوانـڕۆی نـزار
جـافـی ئـەم دیـوو ئـەودیـویش
لـــە تـۆ مـەوجـودە بـە هـەزار
****

---

[٤٥٢] نەزەری (نەزەر): بەندە بە ڕەچەڵەك لە (خێڵی نەزەرخان)ی عەشیرەتی ئاغاوەیسی جافم.
ئـەم شـیعرە کـاك کامـەرانی حەمـەکوردە ناسـراو بـە (کامـەران جـاف) نووسـیویەتی لـەژێر ناونیشـانی (بـۆ ئاغاوەیسی) بـە بۆنـەی سـەردانی کردنـی بەنـدە (کـەریم ئاغاوەیسـی) بـۆ مـاڵی شـاعیر (کامـەران جـاف) لـە گوندی شاکەل لە گەرمیان.

ئـاغـاوەیســـی خـــان و دەوار
خـوانی بـۆ غـوربـەت و ڕێبـوار
چـــاو و دڵ و ســـیـنـە سـافـی
خـــەون و خـــاك و وڵات و وار
****
بـەخێـر بـێـی ووارم لـــەڕێـتـە
فەرشـی سـوورم لـەبـەر پێـتـە
ئـاغـاوەیسی و عـێلی شـاتریـم
بـــران و دڵـــیـــان ئـــاوێـتـە
****
ئـاغـاوەیسـی بـە ســــەروێـنـە
بـە بـەرماڵ و خان و شـوێـنـە
جـوان و جوانـڕۆ و جاڤی کوردە
بـە جـەور و جەفا و خـاوێـنـە

***

کامەرانی حەمە کوردە ـ کەلار ـ شاکەل ٢٠ / ١٢ / ٢٠٢٠

## وەڵامی (کەریم ئاغاوەیسی) بۆ (کامەرانی حەمە کوردە)

## ((هەر ئاوەدان بێ))

بـۆ بـرای بـەڕێـز کـاکــە کامــەران
هـــەر ئـاوەدان بێ مـاڵ و دیـوەخـان

یـاخـوا ژیـانت خۆشــی و بەهــار بێ
وتەی شـیرینت هــەر بـەرقـــەرار بێ

دووربی لە دەرد و لە ناخۆشی و خەم
پێگـە و مەقامت هەرگیز نەکات کەم

هـۆنـراوەت دوڕە، یـاقـوتـە، مـەرجـان
وتـە و کـەرەمـت پڕ مـانـا و عـیرفـان

خـاوەن دیوەخـان مەردی سـینە ساف
بـە هـۆز (شاتری) نـەوەی ئێلـی جاف

دانـا و بـە ئەزمـوون لـە گشت بـوارێ
لـــە نووکی پێنـووس گـوڵاو ئـەبـارێ

هەسـت و دڵسۆزیت بۆ خاکی وەتـەن
لـە هـۆنـراوەتـدا جوانـتـرین دیاردەن

❋ ❋ ❋

کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ٩ / ١ / ٢٠٢١

## شيعرێكی ( كامەرانی حەمە كوردە ) بۆ ( كەريم ئاغاوەيسی ) لەژێر ناوی :

## ( ئاغاوەيسی جاف )

لـە ئـاغـاوەيـسـی قـەڵــەم و قـەدر
شەوی تـار نييـە ڕوونـە وەك بـەدر
شەوی بە شەمە و شەوچرە و چرا
سارێژی خـەمە و عەزێت و زەجـر
****
هـەتـــا بـتـوانـێ كــەرەم و نـەزر
خاوەن فـەرهەنگ و عەلـەم و هـزر
لە ژووری بچووك بەخشينی بەرين
بـۆ ديـن و دونـيــا، بـۆ ژيـن وقەبـر
****
دوورن لـە دووڕوو، لــە درۆی قەزر
مەنسوبی جوانی و دەسماڵ و عەتر
جاه و جامانی و خان و موڕادخان
نـە بێ بەڵێنـە و نـە دەستی غەدر
****

ئـاغـاوەیسـی جـاف دەوارە و چەتـر[٤٥٣]
کـۆتـری ئاشـتیـە و شـمشـێری بەتر
ئـالــی مـوقـامـن بـە قـەدر و قـامـە
قـەومێکی جـوانن قـەت نـابـن بـزر



کامەرانی حەمەکوردە (کامەران جاف)
کەلار ــ بەردە سوور ١ / ١١ / ٢٠٢١

---

٤٥٣ ئەم شیعرە (ئاغاوەیسی جاف)، کاك (کامەرانی حەمە کوردە) ناسراو بـە (کامـەران جـاف) نووسـیویەتی بە بۆنەی سەردانی کردنی بـۆ مـاڵی بەنـدە (کـەریم ئاغاوەیسـی)، دواتـریش لـە ئـەکاوەنتی خـۆی لـە تـۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبوك) بڵاوی کردووەتەوە و نووسیویەتی:

بـە هاوڕێیـەتی جـەنابی شـێخ سـەعیدی شـاکەل کەسـایەتی دیـاری ناوچـەکە و جێگـری پێشـوی وەزیـری ڕۆشنبیری حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان لەسـەردانێکماندا بـۆ مـاڵی سـەرۆکی عەشـیرەتی ئاغاوەیسـی کـاك کەریم ئاغاوەیسی.

١__١١__٢٠٢١ kalar__Bardasur کامەرانی حەمەکوردە

## پەيامی هاوخەمی ( مەلا عبدالحميد ) بۆ كەريم ئاغاوەيسی [٤٥٤]

خوای گەورە خۆشبێ لە ڕۆڵەی لاوت
لــە جێگای هـەبـێ ڕوون بكا چاوت

مەرگی خۆشــەويســت گـەلـێ گـرانـە
بـەڵام پـاداشـــتـی زيـاتـر چـەنـدانـە

كـێ بـێ ڕۆڵــەكـەی كـاتێ كـۆچ ئـەكا
فرمێسك ڕوومـەتی تـەواو تـەڕ نـەكا

( اولادنا اكبادنا ) گـەورمان فەرمووی
من بە قوربانی تەنيا يەك تەڵ مووی

جـەزای بــە خـێـرت داوا لــە خـوايـە
ســـەبـر و ئــارامـی پــاداشــی تيـايـە

❋ ❋ ❋

مەلا عبدالحميد ـ بێلولە

٢١ / ١١ / ٢٠٢١

---

[٤٥٤] مامۆسـتا مـەلا (عبدالحميـد)ی بێلولـە ئـەم شـيعرەی لـە ( ٢١ / ١١ / ٢٠٢١ ) نووسـيوە وەك دەربـڕينی هاوخەمی خۆی بۆ يادی كۆچی دوايی بەرزان كەريم ئاغاوەيسی واتا: (بەرزانی كوڕم).

## بۆچوونی مەلا ( عبدالحمید )ی بێلولە سەبارەت بە شیعرێکی کەریم ئاغاوەیسی، مەلا( عبدالحمید ) ئەڵێ:

ئـای چـەن جوانـە شـیعری بـاشی تـۆ
ســـەڵاوم شـــەمـاڵ بـێرێتـی بـو تـۆ

بـێـزارەکـانـت ڕاســـــــت و ڕەوانـە[٤٥٥]
مـنیش زۆر ڕقـمـە، بـە خــوا لـەوانـە

زیـاتـر لـــــەوەی دزە و خـۆفــرۆش
بێگانە پەرست دور لە خزم و خوێش

ئیـمـان و دیـنـی، زەمــیـر و ویـژدانی
پـارەی حـەرامـە لـــە بـۆ گـیـرفـانی

زۆر کــەس بـووەتـە جاشـی بێگـانـە
تـا بـســووتێـنـێ ئـەم کوردســـتـانـە

نـەفـرەت لـەوانـەی کـە خاکفـرۆشـن
لـە بـۆ بێگـانـە حەڵـقـە لـە گـۆشـن

---

[٤٥٥] ئەمە شیعرە یەکێکە لەو شیعرانەی کە مامۆستا مەلا (عبدالحمید)ی بێلولە نووسیویەتی بۆ بەندە (کەریم ئاغاوەیسی)، وەك بۆچوونی خۆی لەسەر یەکێك لە پارچە شیعرەکانم کە نووسیومە لەژێر ناونیشانی (ئای چەند بێزارم) ، مامۆستا مەلا (عبدالحمید)یش بەم شیعرە بۆچوونی خۆی دەربڕیوە.

کاك (کەریم) حەزم وەك حەزت وایـە
هـەرچیت فـەرمـووە لـەنـاو دڵـمایـە

حەزم لـە کەسی ڕاستگۆ و ڕووخۆشـە
لـە هەڵسوکـەوتـا جوان و بێ غەشـە

لـە کـەسـی دووڕوو، گـەلـێ بـێـزارم
وەك دوپـشـك وایـە بـدا ئـازارم

نـیـشـتـمان پـەروەرێ کـە وا دز نـەوێ
خـوا شـاهـیـدە، زۆر خـۆشـم ئـەوێ



مەلا عبدالحمید ـ بێلولە
٧ / ١١ / ٢٠٢١

## شیعرێکی مەلا ( عبدالحمید ) بۆ ( کەریم ئاغاوەیسی ) [٤٥٦]

شــەوێکی دیـاری پـڕ لـــە مـحـەبـەت
یـەکـتـری ناسـین چاکــتـرین سـەروەت

تـەعـارف، سـەردان، پێویسـتـە بـۆ ژیان
ئـەوەی مەخلوقە پـێیّ ئەڵــێن ئینسـان

بەشێك خۆشیم بوو ئەمشەوی سـەردان
بـۆ مـاڵـی (کـەریم) هـۆزی وەیســیەکـان

بـرایــە بەڕێـز شـــاعـیـر و ڕووخــۆش
پێشـوازی کـردین بە ڕوویـە زۆر خـۆش

لـــەگـەڵ چـەن بـرای بـەڕێـز و جـوان
مامۆســتـای زەلـکـە، پـیـاوێ خـانـەدان

کـەســی نـاســراوی، نــازنـاو بـە جـاف
بـەڕێـز کـامـەران پـیـاوە بـێ خـیـلاف

---

[٤٥٦] ئـەم شـیعرە یەکێکە لـە شـیعرەکانی مامۆسـتا مـەلا (عەبدولحەمیـد بێلولـەی) کە لـە ڕێکەوتی ٢ ی شوباتی ٢٠٢٢ نووسیویەتی بە بۆنەی سەردانی کردنی بۆ ماڵی بەندە (کەریم ئاغاوەیسی) لەگەڵ کۆمـەڵێك کەسایەتی و مامۆستا ئاینی کە پێکهاتبوون لە ( مامۆستا مەلا کەریم زەلکەیی، مامۆسـتا حەسـەنی حەسـار، کاك کامەرانی حەمە کوردە ناسراو بە کامەران جاف).

کاك مەلا حـەسـەن دڵـسـاف حـەساری
گــەلـــێ بـەڕێـــزە لای بـێلـــولـــەی

چەن سـەعات لـە شـەو لـەو مـاڵـە ئـاوا
پێـكـۆ دانیشــتین، وەك هــاوڕێ و بــرا

بـاســی پیـاوچاك و شـــاعـیـر و زانــا
وێـنــەی یــادگــاریـش پێـكــەوە گــیـرا

دەسـتی سـەخـاوەت كاك كـەریم بـۆمـان
خـەڵات كـتێـب بـوو كـــەوا دای پێـمـان

چەن خـۆشـــە بــرا بــۆ خـــوا بـرا بـێ
مەجلیـسی گـەرمی جیێ ڕازی خـوا بـێ

بـە داخـۆ ئـەمڕۆ  مـەجلـیس گەرمەكەن
دوای درۆ و بـوهـتان سكیان پــڕ ئەكەن



مەلا عبدالحمید ـ بێلولە

٢ / ٢ / ٢٠٢٢

## نامەی شیعری ( عبدالله سووریێنی ) بۆ کەریم ئاغاوەیسی

هەر لـە شارەزوور هەتاکوو گەرمیان
ســـڵاوم پێشکەشـە بە تۆ برا گیـان

بـرای ڕێـزدارم کـەریم ئـاغـاوەیســی
هـەر لە خۆت جوانە پۆستی ڕەیســی

گـەر خـوا فرسـەتدا هـەر ئەتانبینم
ئـەوە ئـاواتـمـە کـــەســی شـــیـرینم

بـەرنـامـەم وابـوو کـە بێم بـۆ کەلار
بۆلای دۆسـتێکم دیسان تۆی ڕێزدار

بـەڵام بـۆم نەکـرا ئـەم هەفتە تــازە
بـۆ داهـاتـوو دێـم هـەروام نیـــازە

ئـەو دۆسـتەی کەوا من ئەچم بۆلای
تـۆ بـاش ئەناسـێ هـەروەکوو بـرای

کـاکـە عوسـمـانی ڕەئیســی شـاتـری
بـۆ کـارێ تایبەت ئەچـمـە خـزمەتی

بۆ سەردانی من ئەو هەر بەنیازبوو
کەچی نـازانـم بـۆ وا دیــار نـەبوو

بـۆیـە بڕیــارم داوە بــە ڕەســـمـی
ڕۆژێك بچم بۆ لای تۆش بەتـایبەتی



عبدالله سووریێنی ٢ / ٣ / ٢٠٢٢

==========================================================

## وەڵامی ( کەریم ئاغاوەیسی ) بۆ ( عبدالله سووریێنی )

یاخوا بەخێر بێن بەسەر دوو دیدەم
هـاوڕێی بـەڕێـزی بـە لـوتف و کەرەم

زۆر بـە داخەوە کـە لـە مـاڵ نەبـووم
ئینشـاڵڵا ڕۆژێ ســـەردانت ئـەکـەم

❋ ❋ ❋

کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ١٩ / ٣ / ٢٠٢٢

## پەیامی شیعری ( عبدالله سورێنی ) بۆ ( کەریم ئاغاوەیسی )[٤٥٧]

سـلاوت لـێبێ ئـەی پیـاوی جوانخاس
هەڵکەوتوی جاف و بەندەی خوداناس

زۆرم خـۆشــئـەوێـی لــەلام بـەڕێـزی
بـۆ بـیـنـیـنـی تـۆ ڕێـگـای دوورم بـڕی

ئـاواتـە خــوازم تـەشــــریـف بـهـێـنی
هـاوڕێ و دۆسـتـەکـەی بـرای سـورێنی



عبدالله سورێنی ١٨ / ٤ / ٢٠٢٢

---

[٤٥٧] ئەم شـیعرە (کاك عبدالله) وەك کۆمێنـت نووسـیویەتی بـۆ وێنەیـەکی بەنـدە (کـەریم ئاغاوەیسـی) لـە تۆڕی کۆمەڵایەتی (فەیسبووك).

## شیعری ( عبدالله سووریێنی ) بۆ سەردانەكەی كەریم ئاغاوەیسی [٤٥٨]

لەم شیعریدا ( عبدوللە سووریێنی ) نووسیویەتی :

**لە خزمەت كاك كەریم ئـاغاوەیسـی جاف**

سوپاس بۆ خودای بەخشندەی بەهێز
سـەردانی كـردم پـیاوێكی بـەڕێـز

سـەرۆك عەشـرەتی ئاغاوەیسی جاف
خۆشحالیان كردین خۆیان و ستاف

تەشریفیان هێنا ئەمشەو بەتایبەت
یاخوا بەخێربێن پیاوی بەحورمەت

بەڕێزیان شاعیر پیاوێكی ناودار
خاوەنی پێگەن دانیشتوی كەلار

شەوگارێكی خۆش لەخزمەت ئەوان
ڕووناكبوو ماڵ و شار و دیوەخان

سـلاوت لێبێ پیاوی نورانی
نموونەی مرۆڤی خاوەن ئیمانی

---

[٤٥٨] ئەم شیعرە كاك (عبدالله سووریێنی) لە كاتی سەردانەكەمدا بۆ شاری سەیدسادق لە شەوی ١٣ لەسەر ١٤ / ٦ / ٢٠٢٢ لە ماڵی خۆیان پێشكەشی كردم و بووی خوێندمەوە، هەرچەند كە پێشتر بۆی نووسیبووم و ئامادەی كردبوو بۆ ئەو سەردانەم.

سـەربـەرزە گەرمیان شارەکەی کـەلار
پیـاوی وەك ئێوەی تیـــایـە ڕێـــزدار

جێی شـــانـازیمە ئـێـوە ئـەنـاســم
جافـی ســەردار و بـرای خوانـاســم

سـەربـەرزم پێـتان ئـەی دۆسـتانی من
ئـێـوە نـاســـراون وەك پیاوی مـەزن

پێشکـەشت کـردم کـتێـب و دیـوانـی
تـیرەی ئاغاوەیسی و گشت خێڵەکانـی

تـیرەی نـــاوداری جـــافـی ڕێــزدارن
خـاوەنـی مـێـژووی هـــەزاران ســاڵن

دڵخـۆشـتان کـردم ئـابـەم ســـەردانـە
ئـەمـە سـیفەتـی پـیـاوی مـــەردانـە

ســـوپاسـتان ئـەکـەم هـاتـوون بـۆلام
دڵـــســـۆزی مـنن پـیــاوی بـەوەفان

هـەرکـەسێ نەیبێ وەفا وەکو پـیــاو
حەیفە ئـەو بـژی لـەسـەرخاك و ئـاو

خـاوەنـی وەفـان ئـەی جـافـی نـاودار
بـەتـایبەت بـۆ من لـەسـەختی ڕۆژگـار

بـۆیـە وەفـاتـان قـەد نـاکـەم لـەبـیـر
لـەگـەڵ دۆسـتـانـم مـەرد و ڕۆشنبیـر

ئیتر تادیدار خـوداتان لـــەگـــەڵ
پیاوی ڕۆشـنـبـیـر هـەر بژین بۆ گـەل

لـــە شـــارەزوورۆ هـەتـاکو کـــەلار
خـوا بتانپـارێـزێ ئـەی جافـی ڕێـزدار

گـەر خـوا فرسـەتدا دێمەوە گەرمیـان
بـۆ خزمەت ئێوەو کاکە عوسمان گیان



عبدالله سورێنی ـ سەیدسادق

## شیعری کەریم ئاغاوەیسی بۆ ( عبدواللە سوورێنی ) لەژێر ناوی:

## (( لە سەردانێکدا ))[459]

لـــە پێشـدا بـەنـاو خـوای باڵادەست
بـە توانا و زانـای دەروون و مەبەست

دیســـان هــەر وەکو جاری جارانم
لـــە ســـەردانێکـدا بـۆ لای یـارانم

چووم بۆ لای دۆستێك، شیرین لـە دڵا
شـــاعیری بەڕێـز کاکـە عەبـدوڵڵا

لـە سـەیدسـادقی نـاوچەی شارەزوور
بە کاك عبدوڵڵای سوورێنی مەشهوور

بۆ چەند سەعاتێك بووین بە میوانی
سـوپـاس بـۆ لـوتف و ئـاکاری جوانی

شـیعـرێکی جـوانـی کـردبـوو ئـامـادە
لـــە بـۆ ســـەردان و دیـداری بـەنـدە

---

[459] لە سەردانێکدا: ئەم شیعرەم بۆ ئەو سەردانە نووسیومە کە کـردم بـۆ لای کاك (عبداللە سـوورێنی) لـە شاری سەید سادق، وە هەروەها وەکو وەڵام و ڕێزێك بۆ ئەو شیعرەی کە پێشکەشی کردم لە ماڵی خۆیان.

هــەر لــەو دیـدارە بـۆی خوێنـدینەوە
بـە دەنگێکـی خـۆش، جـوان و ڕازاوە

هــەر ئــاوەدان بێت مـاڵ و دیوەخـان
هەمیشــە شــادبن تـا هـان لـــە ژیـان

کـات درەنـگ بـوو نـەمـتـوانـی زیـاتـر
شـادم بـە دیـدار چەنـد دۆسـتێکی تـر



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ١٥ / ٦ / ٢٠٢٢

## وەڵامی ( عبداللە سورێنی ) بۆ شیعرەکەی ( کەریم ئاغاوەیسی )

پێشـــــەکی ســــــڵاو بـرای شـاعـیرم
شــاکـاری بـەرت ئێـســـتاکـە بینیم

سوپاس بـۆ خـودای گەورە و بانیسەر
پارچە شـیعرەکەت بوو بە تاجی سەر

سوپاست دەکـەم ئـەی شاعیری دلێر
پارچە شیعرەکەت بەنرخترە لـە زێڕ

بـوو بە شانـازیم ئـەم شـیعر و نـامـە
دیـــاری پیـاوێکـی خـــاوەن پـەیـامـە

پێی بەخشیم ڕێز و حورمەت و شکۆ
ســوپـاس بـۆ خـودا نـاسـانـمی بـەتـۆ

خـوا پێی بـەخشیوی ڕێی هـیدایـەتی
لـەنـــاو خەڵکیـدا ڕێـزداری کـردویی

لـــە کـۆتـاییدا بـە هـەزاران جـــــار
ســــوپـاســت دەکـەم پـیـاوی وەفـادار

* * *

عبد اللە سورێنی ١٦ / ٦ / ٢٠٢٢

## نامەی شیعری ( تالب دەرباز ) بۆ کەریم ئاغاوەیسی نووسیویەتی :

## نامەی تالب دەرباز بۆ برای شاعیر کاك کەریم ئاغاوەیسی لە کەلار[٤٦٠]

سـلاوت لـێ بـێ درەنگ پێـم زانی
هاتیـە شـارەکەم بـە ڕوی مـیوانی

یاخوا بەخێربێی تـۆ بـۆ شارەزوور
دیوەخانی دڵ پڕ ئەکەیت لـە نوور

ئـازیـز بـزانـە، بـە سـیما دیـاری
بـەنـدەی ڕاسـاڵـی پـەروەردگـاری

لـەنـاو شاعیران زۆر بـە ویقاری
نـمونـەی گـەرمیان شـاری کـەلاری

لـەنشگـەی ژیـان لـە هـۆزی جافـی
دەروون فـراوان بـە سـینە سـافـی

پـیـاوی دیـوەخـان خـاوەنی نـاوی
تـەمـەن درێـژبـی هـەتـاکـو مـاوی

هۆنـراوەکانت بـاخچـەی گـەرمیانـە
نـالـێم ئـەمیانـە، یـاخود ئـەویانـە

---

٤٦٠ ئەم شیعرە کاك تالب دەرباز نووسیویەتی بۆ ئەو سەردانی کردنەی بەندە بۆ سەیدسادق.

هێندەی ئاشنات بم خامەڕەنگینی

لەناو شاعیران نرخ سەنگینی

بۆ ئاغاوەیسی شەنگە خەڵاتی

لەنێو ئەدەبدا شاسوار وڵاتی

خۆزگە ئەو شەوە فرسەتم بوایە

تێرلە خزمەتدا دانیشتمایە

لە ماڵی بەڕێز کاکە عەبدوڵا

خەندەڕێژ ئەبوین قەڵابەقەڵا

لە بری ئەوە ئابەم هۆنراوە

نازی دۆستانە بە بەدەم باوە

پێشکەشتان ئەکەم ئەم خونچەڕازە

نامەی دۆستانەی تالب دەربازە

هیوائەخوازم دڵشادو خۆش بی

لەکۆڕی یاران، هەروابەجۆش بی



تالب دەرباز ـ سەیدسادق

١٥ / ٦ / ٢٠٢٢

## وەڵامی (کەریم ئاغاوەیسی) بۆ نامەکەی (تالب دەرباز) [٤٦١]

### بۆ برای بەڕێزم کاک تالب دەرباز:

بەنـاوی خـوای گـەورە و بـە تـوانـا
بـەدیـهـێـنـەر و بیـســـــەر و زانـا

لـە گـەرمـیانـەوە لـە شـاری کەلار
ئەم نامە پێشـکـەش بە بـرای ڕێزدار

کاك تالب دەرباز نووسـەر و شـاعیـر
دانا و بە ئەزموون کەسی ڕۆشـنبیـر

سوپاس بۆ نامە و هۆنـراوەی جوانت
بەرەکەتدار بێـت خامە و خـەرمانت

هەر گەشاوە بێت پێنووست هـەردەم
شـادی بڕێژیت بەسـەر خامەی خـەم

کاتێك خوێـنـدمەوە نـامەی ڕەنگینت
ڕێـز و سـڵاو و شـیـعـری شـیـرینت

---

[٤٦١] ئەم شیعرەم وەکو وەڵام و ڕێزێك نووسیومە بۆ نامە شیعرییەکەی کاك تالب دەرباز کە لە ڕێکەوتی (١٥ / ٦ / ٢٠٢٢) نووسیویەتی بۆم.

گەلێك دڵشادبووم من بە ئەو نـامە
کـە بینیم ســەرجەم ڕێـز و سـەلامە

لـە کۆتایدا لـە ناخمەوە، ئومێدەوارم
شــاد و ســەربەرز بن بـرای ڕێـزدارم



کەریم ئاغاوەیسی / کەلار / ١٦ / ٦ / ٢٠٢٢

## دووبارە لە وەڵامێکدا (تالب دەرباز) نووسیویەتی:

## وەڵامی تالب دەرباز بۆ کاك کەریم ئاغاوەیسی

دەستەکانت خۆش بۆ وەڵامەکەت
دیاری بـــەپێزە لـەلام نامەکەت

بۆی عەتر ڕێزە پڕبـــەهەنـــاوم
دامناوە لـەسـەر ڕەفەی دووچـاوم

هەر لە سەیسادق تـا شـاری کەلار
سـڵاوبـاران بیت بە هەزاران جار

نــامەت شـانـازی و ڕێـزو شکۆیـە
ڕووی وەفاداری و ئەرزشی تـۆیـە

سوپاس گوزارم ئەی برای شـاعیر
خەڵات نـامەکـەت ناکرێت لـەبیر

لـەنــاو گوڵدانی سـابـات دامناوە[٤٦٢]
بۆ تالب دەرباز زۆر لـەبـەرچـاوە

[٤٦٢] سابات: کتێبی سابات یەکێکە لە بەرهەمەکانی کاك تالب دەرباز.

ئەپاڕێمەوە لـەخـوای میهـرەبان

هـەرپـــایـەداربـێ ، بـرایـەتیمان

بلْندبێ وشەی خامەی ڕەونەقدار

ئـــەدەبـی دڵان بکـــات پایـەدار

دیدگای کوێر بێت ئەوەی نەیارە

خۆشـی نـەبینێت لـەم ڕۆژگـارە

ئیـتـر ماڵـئـاوا هـاوڕێی بـــەوەفا

یادت هەمیشە پڕبێت لە سـەفا

❋ ❋ ❋

تالب دەرباز

سەیدسادق ١٦ / ٦ / ٢٠٢٢

## شیعرێکی ( دکتۆر حەمید ) بۆ کریم ئاغاوەیسی لەژێر ناوی:

## ( پەرتوکی عەشرەت )

بە دەستم گەیشت پەرتوکی عەشرەت[٤٦٣]
یاخـوا پیـرۆز بێ سـەد هـەزار کەڕەت

پەرتـوکی تـیرەی ئـاغاوەیسـی جـاف
تـیرەیـە دڵـپاك دیـنـدار و دڵـسـاف

تـیرەیـە ژیـر و سـەلـیقەدار بـوون
خـاوەن دیوەخان لادێ هەم شـار بـوون

خـاوەن پیـاوەتی بـۆ ئـاشـنا و نەنـاس
خـاوەن ڕاوێژ بـوون وەك لالـە هەیـاس

لـە شـاریش پیشـەی خـۆیان نەفەوتـان
خـزمـەتـیـان ئـەکـرد نـەیـانـدا وچـان

---

٤٦٣ پـەرتوکی عەشـرەت: کتـێبی (تـیرەی ئاغاوەیسـی و خێڵەکانی) بابـەتێکی مێژوویـیـە، ئـەم کتێبـە باسـی مێژووی عەشیرەتی ئاغاوەیسی دەکات کە لە نووسینی بەندە ( کەریم ئاغاوەیسی)یە.
ئەم شیعرە (پەرتوکی عەشـرەت) لـە ( ١٥ / ٦ / ٢٠٢١ ) لـە لایـەن کەسـایەتی دیـاری سـنووری گـەرمیان کـاك حەمید کانی پەموویی کە ناسراوە بە (دکتۆر حەمید) نووسراوە بۆ بەندە (کەربم ئاغاوەیسی)، بـە بۆنـەی سەردانی کردنم و پێشکەش کردنی کتێبی (تیرەی ئاغاوەیسی و خێلەکانی) بە بەڕێز (دکتۆر حەمید).

جوامـێری و ژیری خـاوەن شـەهامەت
خـاوەن حـورمەت و قـەدر و کـەرامەت

دڵخۆشم ئێـوەش وەك تـیـرەیـە جاف
هـاوخـەمی گـەلــن بـێ لاف و گـەزاف

بـەنــاو ئـاغـاوەیــس باپـیـرە گــەورە
لە گەل جێ نەمان لەم چەرخ و دەورە

هیچ فەرقی نییـە گەدا و شـاە و مـیـر
دروسـتی کـردوین عەلـیـم و خـەبـیـر

بە بـێ جـیـاوازی سـپی و ڕەش و بـۆر
بـە لاشــە یـەك و عەقڵ هـەزار جـۆر

بـە بـێ جـیـاوازی بنەمـاڵــە و هــۆز
بـە تەقـوا ئـەبـین ئیخلاس و دڵـسـۆز

چـاکـتـریـنـمـان، لای پــەروەردگـــار
تـەنـهـا بـە تەقـوا ئـەمـان بـێ ڕزگــار

چـۆن نییـە فـەرقی عـەرەب و عەجەم
پێکـەوە ئـەژین بـێ زوڵـم و سـتـەم

من لەشەئنی کەس هەرگیز ناکەم کەم
بـەنـدەی خـوداین و ڕێـڕەوی خـاتـەم

(اتقاکم) بـەسـە بـۆ هـەمـوو سـەردەم
چـییـە جـیـاوازی تـۆ بـەرز و من کـەم

بـۆ تـۆ گـەورە بی مـنیش ژێـردەسـتـە
گـەر بـیـر بـکـەیـتۆ (اتقاکم) بـەسـتـە

هـەمـوو زادەی خـۆڵ خـالـقی جەبـار
بۆ من زەلیل بم تۆش گەورە و سەردار

بـەڵام مەشـهـورە کـە بـوویـتـە گـەورە
بیـری دوات هـەبێ ژیـن دەوران دەورە

دونـیـا بـۆ کـەسێ نـەمـاوە تـا سـەر
پـیـاوەتـی بـکـە گـەر بـۆت چـوە سـەر

گەورەیـە نەیـبێ سێبەری بـۆ خەڵـك
گەندەڵ و بێ فـەڕ، نەزان و بێ کەڵك

یاخـوا ئـەو گـەورە سـەر بێ کـڵاو بێ
خـواردنی زەهـر و پیسـی و تـاڵاو بێ

سووك بێ ڕسوا بێ، بێ جل و پێڵاو بێ
دایم هەڵپەی بێ، چرووك و داماو بێ

باقی وە سەلام ڕیش سپی سەردەم
یاخوا سەربەرز بی برام هەموو دەم

با نەهێنی بێ چاکەی ڕۆژگار
لای خوا گەورە بی باشترە لە هەزار

خەڵکی فشەکەر بە فیز و دەمار
لە ڕوو وەك برا لە پشتۆ وەك مار

پشتت ببەستە، بە خالق ئەکبەر
عیزەت ئەو ئەیدا نەك وڵاخ و کەر

زەلیلی و عیزەت، مردن و ژیان
بە دەستی ئەوە عەتای کات پێمان

باکت هیچ نەبێ لە مرۆڤی ئەمڕۆ
یەك ڕاستی هەیە، هەزاران درۆ

زۆرم پێماوە، بەڵام دڵ پڕم
وام لێ مەڕوانە زۆر کپ و کڕم

داخی زەمـانە، هەم هەرچی و پەرچی
خوێڕی و هەزەلی کۆیلـە و ماستاوچی

نیـفــاق و درۆ غـەیـبـەت و بـوهـتـان
پیشـەی زۆریـانـە خـۆ بـە گـەورە زان

مل قەوی فرەخۆر، مووشەك و چەورە
نـموونـەی زۆرە لــەم چــەرخ و دەورە

جـاریٚ نوێـنـەری حـیزبـە و حکـومەت
جـاریٚ بـراگـەورەی هـۆز و عەشـیـرەت

جـاریٚ خـڕ ئـەکـات عەرەب و عەجـەم
خۆ بە زل زانـە و من و تۆش بە کـەم

چۆن خۆم ڕزگارکەم لەم هەموو داخـە
کـۆیلــەی ســەردەمـە، بـەرزە دەمـاخـە



حمید کانی پەموویی
کەلار ـ ١٥ ی حوزەیرانی ٢٠٢١

**شیعرێکی (م. بەکر کانی هەمزەیی) لەژێر ناوی:**

**((بۆ دیوانی کەریم ئاغاوەیسی))**

بەناوی خودا پەنای گشت کەسێ
کەسی بێکەس و هەم فریارەسێ

پاشان سلاوات لەسەر رەسولێ
شەفاعەتکەری هەموو مەلولێ

رێز و سلاوم بۆ ئاغاوەیسی
کەوا بەرێزتان بوونە رەئیسی

برام پیرۆزە دیوانی تازەت
تۆمار کردنی ئەو هەموو رازەت

لەناو کۆمەڵا قەدر گرانی
جێگای شانازی جاف و گۆرانی

گوڵاوی وشەت بۆنی دای لەسەر
سەرت بلند بێ تارۆژی مەحشەر

لەبەینی خۆف و رجادا ماوی
زۆرخەم بەشیعر دەکەی تەداوی

* * *

م. بەکر کانی هەمزەیی

١٨ / ٥ / ٢٠٢٢ چوار شەممە / قەزای شارەزوور


1

وتەیەکی کورت دەربارەی
شیعرەکانی
کاک کەریم ئاغاوەیسی

وێنەی دەستنووسی: لەتیف هەڵمەتی شاعیر ( ١ ـ ٧ )



٧

دارستان و باغ و بێستان و گوڵستان
دەیان و سەدان و هەزاران جۆر دار و
درەخت و شەتڵ و نەمام و دەوەن و
گوڵی تێدایە و دەیان و سەدان جۆر میوەی
جۆربەجۆر دەگرن و هەموو درەختێک و
هەر میوەیەک تایبەتمەندێتی خۆی و
خەسڵەتی جیاواز و رەنگ و تام و بۆن و
بەرامەی تایبەتی خۆی هەیە...
هەروەها گوڵزاری شیعریش پڕاو پڕە
لە گوڵی رەنگاو رەنگ و هەمەچەشنی
شیعر و هەر جۆرێک لە جۆرەکانی شیعر
تام و چێژی تایبەتی و خەسڵەتی و

وێنەی دەستنووسی: لەتیف هەڵمەتی شاعیر ( ٢ ـ ٧ )



٣

مۆرك و ئەدگار و ریتم و ئاوازی
جیاوازی خۆییە..
شیعری کوردیش لقێکی گەورەیە
لە شیعری جیهانی و گەلێ هۆنراوەی
شاکار و دەیان شاعیری داهێنەری
بە مرۆڤایەتی بەخشیوە و نالی
شێعر و هەڵبەستی کوردی لەسەر
ئەوەندە بەرزە کەلەنێوانیاندا دەشەکێتەوەو
سەرنجی عاشقانی شیعری راکێشاوەو
شیعری دەیان شاعیری کورد وەرگێڕدراونەتە
سەر دەیان زمانی جیهانی و بە شکۆمەندی و
رێزەوە خوێنەران پێشوازیان لێکردووە..

وێنەی دەستنووسی: لەتیف هەڵمەتی شاعیر ( ٣ ـ ٧ )



کاک کەریم ئاغاوەیسی شاعیر
کەسایەتییەکی دیار و ناسراوی
دەڤەری گەرمیانە و باغ و گوڵزاری
شیعرەکانی پڕاوپڕن لە دەیان جۆری
گوڵی گەشی شیعر وەکو:
شیعری نیشتمانپەروەری و
کۆمەڵایەتی و ئامۆژگاری و ڕێنمایی و
ئایینی و جوانی سروشت و دیمەنە
سەرنجڕاکێشەکانی کوردستان و
ژینگە پارێزی و ئازادی مرۆڤی..
هەروەها دەیان شیعری تەرخانکردووە
بۆ داکۆکی کردن لە تەبایی نێوانی

**وێنەی دەستنووسی: لەتیف هەڵمەتی شاعیر ( ٤ ـ ٧ )**



٥

خێڵ و هۆز و عەشرەت و گشت تیرە و توێژ و
چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگای کوردەواری و
مرۆڤایەتی
کاک کەریم ئاغاوەیسی شابەشانی
شیعرەکانی لەگەڵ دەیان کەسایەتی
دیکەی دەڤەرەکەدا بوون بە سونبلی
خێرخوازی و ئاشتی و لە هەر شوێنێ
کێشەیەک رووبدات و ناکۆکی و ململانێ
بخاتە نێوانی دوو هۆز یا دوو تیرە و
خانوادەوە دەبن بە پەیکی ئاشتەوایی و
خۆشەویستی و هەوڵی چارەسەرکردنی
کێشەکە و چەسپاندنی تەبایی و

وێنەی دەستنووسی: لەتیف هەڵمەتی شاعیر ( ٥ ـ ٧ )



٦

پێکەوە ژیان دەدەن...

واتا کاک کەریم ئاغاوەیسی وەکو

چۆن لە ژیانی ڕۆژانەیدا هەمیشە هەوڵی

بەرپابوونی تەبایی و برایەتی و دۆستایەتی و

پێکەوە ژیان لە دەڤەری گەرمیاندا دەدات

بە هەمان شێوە شیعرەکانی کردووە

بە پەیامی ڕاگەیاندنی بەرپابوونی

ئاسوودەیی و ئاشتەوایی لە هەموو

کۆمەڵگاکانی باشووری کوردستاندا...

لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم و

بە گەرم و گوڕی پیرۆزبایی لێکردن و

بڵاوبوونەوەی ئەم دیوانە شیعرەی لێدەکەم و

**وێنەی دەستنووسی: لەتیف هەڵمەتی شاعیر ( ٦ ـ ٧ )**



٧

دەڵێم دەستان خۆش بێت و
هەزار جار پیرۆزبێت و گوڵزاری
شیعری رەنگاو رەنگتان هەمیشە
گەش و دەم بە خەندە بێ ..و دەیان
دیوانی دیکە و کتێبی جۆر بەجۆر
چاپ بکەن و کتێبخانەی عاشقانی
شیعر و بەیتی جوانی پێ برازێننەوە و
خوای میهرەبان پشتیوانتان بێ..

براتان
لەتیف هەڵمەت
١٦/٦/٢٠٢٢
سلێمانی

وێنەی دەستنووسی: لەتیف هەڵمەتی شاعیر ( ٧ ـ ٧ )

[ کاک کریم ئاغاوەیسی ]

فریا جاف
لەندەن 2022

جاران ئەگەر جاف وە یاخود هەر عەشرەتێکی تر
پێویستی بە سەرۆکێکی گورز وەشێن و ئازاو تووڕە و ئینجا
نان دەخوان جوان و میوان دۆست و چی و چی تریشی بوایە
کە لە ڕاستیشدا بۆیە و دەورو زەمانەی کە ڕابوردا سەرۆک
عەشرەت بەو خەسڵەت و سیفاتانە کە لە هەموو کەسدا
نەبوە تواناییەتی بە ڕێک و پێکی کاروبارو ئیدارەی عەشرەتەکەی
بە سەرکەوتوی ببات بە ڕێوە، ئەتوانم بڵێم زوربەی زۆری
ئەو سەرۆک عەشرەتانەی هەڵماندان سەوادێکی ئەوتۆیان
نەبوە چونکە لەو دەورەدا سەرۆک عەشرەت زیاتر ئەبوایە
دنیا دیدەو قسەزان و لێزان بوایە نەک ئەبوایە سەوادێکی
ئەوتۆی هەبوایە.
لەم قۆناغەی ئیمڕۆدا هەر کوڕە جاف و کچە جافە یەکی
ئایپادێک و مۆبایلێک بە دەستییەوە یەتی و ئەتوانێ
هەموو جیهان لە سەر پەنجەی بسوڕێنێتەوە و لە کوێ
گەرمە هەواڵێک هەبێ ئەتوانێ بیقۆزێتەوە و ئەگەر
بوارێ لێدوان و کۆمێنتیشی هەبێ، وەیا سڵەمینەوە
هاوبەشی خۆی تیا ئەکات و ئەمەش ئەو کوڕو کچە

**وێنەی دەستنووسی: فریا جاف ( ١ ـ ٣ )**

(2)

جافەن کە لە ڕابوردودا شوانی مێگەل و چێشت و نان
و خوان لێنەر و جل شۆریا لایەکی زۆر لە کەس و کاریان
بون، بەڵام ئێمڕۆ ئەوەتا بەو ئەفەندەی خۆیانەوە
ئەتوانن نامەزیان ببەنە سەر دەریاو بە تێوەیەتیش
بیانگەڕێننەوە، کەواتە سەرۆک عەشرەتی ئێمڕۆ
ئەبێ لەو کوڕو کچە جافانە وریاتر و بە تواناتر و ڕۆشنبیر
تریش بێت، بێ گومان ئەمانەش سەرباری زمان
زانینێکی تەواوی بۆ سەوادەکانی ناوعەشرەتەکە پێشی،
بە بێ ڕوپامایی ئەم خاڵانە لە برای بەڕێزمانا، سەرۆکی
تیرەی ئاغاوەیسییەکان کاک کریم ئاغادا بە ئاشکرا
دەبینرێ، ئەم کەسایەتییە خاوەن قەڵەمی خۆیەتی، بۆ
خۆی نوسەر و شاعیرە و نەک هەر ئەوەندەش بەڵکو بە
خوێندنەوەی بە - هەمەکانی ئەتوانێ بە جوانینەیەک
لە شیعرەکانی گوزارشت لە ئاستی تێفکرینی خۆی و ئاستی
ڕۆشنبیریەکەی خۆی بداتەوە و لەمانەش هەموی گرنگتر
بۆ ئێمەی کوردی موسڵمان ئەبینین کاک کریم ئاغا
موسوڵمانێکی تەواوە و لە مزگەوت و فەراسییە
ئاینییەکاندا ئەبینرێ و بە ئیمانێکی تەواوە هاوبەشی
خۆیا تیادا ئەکات، بۆیە دیسان بە بێ ڕوپامایی

وێنەی دەستنووسی: فریا جاف ( ٢ ـ ٣ )

3

ئەڵێم لەشتی ئەم تیرە بەناوبانگەی جاف
کە ئاغاوەیسیەکان لە دەستی کەسایەتیەکدایە کە
ئەویش کاک کەریم ئاغاوەیسییە و ئەتوانێ
ئەو لەشتیە بە سەلامەتی بگەیەنێتە ئاکار و
کەناری دور لە هەموو مەترسیەک بۆ عەشرەتەکەی
و ئەمەش شانازیە بۆ جاف هەموی کە توانیویەتی
ئەم بەرگە نوێیە بپۆشێ و ئیتر کاتی ئەوەستی
هاتوە لەلایەن هەموو سەرۆک عەشرەتەکانی
جافەوە نە هێلرێ جاف لەمە زیاتر هەر چەپڵە
کوتی بێ بۆ ئەملاو ئەولا، بەڵکو جاف ئەبێ
خۆی حسابێ بۆ ئەو هێزەی خۆی بکات کە لە
ئیستیقلالی دبوتە جیا جیاکاندا ئەبینرێ، هەر لێرەوە
جارێکی تر دەستخۆشی لە تێکڕای ئاغاوەیسیەکان
ئەکەم کە متمانەیان بەم سەرۆکە ڕۆشنبیرە داوە و لێرەدا
بەگەرمی پیرۆزبایی لە کاک کەریم ئاغا ئەکەم بۆ
لە چاپدان و وەبەرهەم هێنانی ئەم دیوانە ئایابەی
فەرحان بەرەکەت.

وێنەی دەستنووسی: فریا جاف ( ٣ ـ ٣ )

برای بەڕێزم کاک کەریم ئاغاوەیسی

سلاو و ڕێز....

شیعرەکانم خوێندەوە، پێشتریش لە ڕێی واڵی جە ناپتانەوە لەفەیسبووک ئاشنای شیعرەکانتان بووم، دەستت ماندوو نەبێت دەکوشم شیعرەکان جوانن، چێژبەخشن، هەڵقوڵاوی کۆمەڵی کوردەوارین. ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئایینی، پەند و ئامۆژگارییان... ڕەنگدانەوەی ئەزموون و دونیابینی ئێوە و گوزارشتن لە کەتوار (واقع)ی کۆمەڵ.

زمانی شیعری بەشێک لە تێکستەکانی کوردییەکی تاراددەیەکی باش پەتی و سادەن، ئەمەش زیاتر خەسڵەتی شیعری میللی بە شیعرەکان دەبەخشێت، بە شێکی تری شیعرەکانیش سەرباری کێش و سەروا، بەبوونی ڕەگەزەکانی سۆز و خەیاڵ و ئەزمێشە و ئاواز ئینجا هونەرەکانی جوانکاری و ڕەوانبێژی تێیاندا دەچنە قاڵبی شیعری گۆرانی (لیریکی)یەوە.

بە دڵ پیرۆزبایی لە چاپدانی دیوانەکەتان لێدەکەم هیوام تەمەن درێژی و بەردەوامیتانە، لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیدا.

برایان
د. دارا حمید محمد
ی. پ. د.
٢٠٢٢/٥/١٣

وێنەی دەستنووسی: ی. پ. د. دارا حمید محمد



وێنەی دەستنووسی: شێخ سەعید شاکەلی ( ٢ ـ ٤ )



٣

سەیوان ئەم دەریایە [illegible] کەنار ئاسیشی ئەوی [illegible]
قوڵای کات و [illegible]، لەم ڕێبوارییەدا لە توانایدا
لە هەموارێکدا [illegible] دەزگای کەسی [illegible] بە کەسێتی [illegible]
گونای [illegible] لەسەر [illegible] — ئەوی ڕەفیقانی تەریقەت
هەرچی [illegible] بە دەوروپشتدا — [illegible]
ئەوی ڕەفیقانی تەریقەت ئەڵێن. وە [illegible]:
بۆ بەها بوونی مرۆڤ لە [illegible] یاساکانی ژیانی
میهرەبانی [illegible] پاکی عیشق و
جوانی یانە [illegible] .. کاری وایان کردووە
هەریەک پەیامەکەو [illegible] پەیامەکە بەکارنەهێنێ
بۆ [illegible] مرۆڤ و ڕەهاکردنی کۆیلایەتی
هێندێک [illegible] عەقڵ [illegible] کردووە، [illegible]
[illegible] سۆزی [illegible] پیرۆز [illegible] خزمەتکاری [illegible]ەکان
[illegible] لە ئاستی [illegible] سنووری لێبووردەیی
[illegible]، [illegible]، تەنیا

وێنەی دەستنووسی: شێخ سەعید شاکەلی ( ٣ ـ ٤ )

بە ناوی خوای مەزن

ئەم دیوانە شیعرە بەرهەمی هزر و قەڵەمی یەکێکە لە کەسایەتییە دیار و هەڵکەوتووەکانی ئێستای کۆمەڵگای گەرمیانی ئازیز، ئەم برا بەڕێزەمان؛ کاک کەریم ئاغاوەیسی، سەرۆکی تیرەی بەمەنی ئاغاوەیسی سەر بە ئێلی گەورەو پایە بەرزی جاف، خاوەنی ئامادەبوون و ڕۆڵێکی کاریگەرە لە زۆربەی هەرە زۆری بۆنەو کۆڕ و کۆبوونەوە عەشایەری و کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەکەدا، بەتایبەتی دانیشتن و گردبوونەوەکانی تایبەت بە پرسی ئاشتەوایی و پێکهێنانی نێوان هۆز و بنەماڵە جیاجیاکان و بەدیهێنانی ئاشتی و تەبایی لە نێوانیاندا.

هەروەها کاک کەریم پاڵپشت بە هەڵسوکەوتی جوانی و هۆشیاری و میهرەبانی و خۆشی گفتاری خۆی توانیویەتی لەگەڵ خەڵکانێکی زۆری ناوچەکە و دەوروو بەریدا، هەڵبەت بە زۆر ڕێگە لە کەسایەتیی دیار و خانەدان و پیاوانی ئایینی و ڕۆشنبیرانیشەوە، پەیوەندیی تووندی دۆستانە ببەستێت و ببێتە ناسیاو و ئاشنای نزیک و خۆشەویستیان.

هاوکات جگە لەو ڕۆڵ و پێگە عەشایەری و کۆمەڵایەتییەی ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو کەسێکی تێگەیشتوو و کراوەو خاوەن قەڵەمێکی بەبڕشت و توانا و سەلیقەیەکی ئەدەبیشە لە بواری نووسین و هۆنینەوەی شیعری جوان و فرە مەبەستیشدا. بەمەش شیاوی خۆی سەلماندووە لەوەی ببێتە یەکێک لە میراتگرە وەفادار و بەتواناکانی ئەو دەستە بژێرە بەهرەمەند و ناودارانە لە سەرۆک هۆز و پیاوماقوڵانی جارانی کورد، کە لە سەردەمی زێڕینی خۆیاندا خولیای دنیای زانست و ئەدەب و کلتوور بوون، لە سروودنیان و شیعر و مێژوو، بۆ خۆشیان لەو مەیانەدا شوێن دەستیان درەوشاوە بووە و میراتێکی نایابیان بۆ گەل و هۆزیان بەجێ هێشتووە.

هەڵبەت ئەم دیوانەی کاک کەریمیش، لەم قەبارە شایستە و ناوەڕۆکە دڵگیرەیەوە. هەروەها پێشتریش دانان و بە چاپ گەیاندنی کتێبە دانسقەکەی سەبارەت بە تیرەی ئاغاوەیسی، سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن کە ئاماژەمان پێدا.

مایەی سەرنجیشمانە، کەوا کاک کەریم دەڵێ چۆن لە پەیجەکەیدا (لە فەیسبووکدا) هەواڵی زۆربەی کار و چالاکییەکانی لە بواری عەشایەری و

وێنەی دەستنووسی: عمر علي شريف ( ١ ـ ٢ )

کۆمەڵایەتیدا بڵاودەکاتەوە، ئاوەها ماوە ماوە بەیەکەی بە
ئەو پێنینیانەی لە شیعر و هۆنراوە و نووسینەکانی دەڕێژێتەوە و دەیانخاتە
پێش چاوی هاوڕێی و دۆستانی. هەڵبەتە لە هەردوو حاڵەتیشدا کارێکی
باش و بەسوود دەکات و مایەی ستایشە.
بەندە ماوەیەکە ئەم بڕایە دەناسم و دڵخۆشم بەپەیوەندیی دۆستانەی نێوانمان.
هەروەها ئاگاداریشم لە زۆرێک لە کار و خزمەت و چالاکییەکانی، هەڵبەتە بەو
شیعر و نووسینانەشەوە کە بڵاویان دەکاتەوە. بەهەمان شێوە ڕێز و حورمەتیشم
هەیە بۆ بنەماڵە و خزمەکانی، کە لەگەڵ بنەماڵەکەماندا ماوەیەکی دوور و
درێژە یەکدی دەناسین و ئاشنای یەکەین بەوەی کە لە زۆر بار و دۆخی جیاوازدا
و لە ڕابردوودا هاوکار و هاوغەم و هاوسۆزی یەکتر بووین.
لێرەشدا منیش لێک سوپاسگوزاری ئەو بانگهێشتنامەیەی برا بەڕێزم،
کە ئاراستەی کردم بۆ نووسینی وتەیەک بۆ ئەم دیوانە بەنرخەی. هەڵبەت
مایەی بەختیاریی زۆرمە، کە بەراستییان بەپەسەندی زانیوە وتەیەک بە ناوی منەوە،
لە دووتوێی دیوانەکەدا هەبێت. جا بەندە ئومێدەوارم بەم وتە سادە و ساکارەم
توانیبێتم شتێک لە حەقی ئەو بانگهێشتنامەیەو خەڵک و میهرەبانیی خاوەنەکەی
(کاک کەریم)م دابێتە، هاوکات داوای لێبوردنیشی لێدەکەم، لە هەر
کەم و کوورتییەکی نووسینەکەم، کە کەمالیش هەر تەنها بۆ زاتی پەروەردگارە.
لە کۆتاییشدا هیوادارم ئەم بەرهەمە بەپێزە شوێنی شیاوی خۆی لە
کتێبخانەی کوردیدا بگرێتەوە و لەنێو هۆنەر و شیعردۆستانی کوردا
جێگای خۆی بگرێت و بەرز بنرخێندرێت. داواکاریشم لە خوای میهرەبان
ئەوەیە کە کەریم ئاغاوەیسی تەمەن درێژ کات و توانا و تاقەتی پێ ببەخشێت
بۆ پێشکەش کردنی خزمەت و بەرهەمی زیاتر و زیاتر.

عمر علي شريف
٢٠٢٢/٥/١٧

وێنەی دەستنووسی: عمر علي شريف ( ٢ ـ ٢ )

کاکە کەریم ئاغاویسی

سڵاو و ڕێزم هەیە

دەست خۆشیم بۆ بەڕێزتان هەیە کە شان بە شانی ئەرکی وەزارە کۆمەڵایەتییەکان شانت داوەتە بەر خزمەتکردنی کۆمەڵگا لە بواری هەڵبەست و هۆنراوەدا کە لە هەموو کایەکاندا دید و بۆچوونی خۆت بە ڕاشکاوانە خستووەتە ڕوو، بە هۆنراوە جوانەکانت گوزارشتت لە نەهامەتی و دەردەسەرییەکانی کۆمەڵگا و نەتەوەی کورد کردووە، بە سۆز و هەستێکی جوانەوە دەربڕینەکانت نمایش کردووە.

دەست و خامەت خۆش هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم

لەگەڵ حورمەتی بێ پایانم

دکتۆر

حسین اسماعیل خان دەلۆ

٢٩/٥/٢٠٢٢ ز

وێنەی دەستنووسی: د. حسین اسماعیل خان دەلۆ

Year: Month: Date:

« بەناوی خوای بەخشندە »

بەناوی زاتی بەرزی کردگار
چاکەی بێ سنوور نایەتە ئەژمار
ئازیزە برای شیرین خولق و خوو
لە دڵێ بەپەند ئازاری گوڵدوو
نامەی دڵسۆزیت گەیشتە دەستم
چرا بۆ ماڵ و تەزوو بۆ هەستم
پیتی نامەکەت وردە بارانە
بە یەقین شەکراوی کۆڕی یارانە
گوفتارت بەڵێ: بە زاری دڵە
بەرامەی مێخەکی لە بۆنی گوڵە
(ئاغاوەیسی) گیان بە لوتف و ڕێزە
بۆ برایەتی هەوێنی هێزە
هەر شەنگ و شۆخی بەهاری ژینت
گوڵی جوان وەرزە گوڵزاری ڤینت
(تاوگۆزی) بە ڕۆح ناردی سڵاوی
مرواری میهر و سۆزی گوڵاوی،

عبدالرحمن تاوگۆزی
٢٠٢٠/٨/٢٧

وێنەی دەستنووسی: مامۆستا عبدالرحمن تاوگۆزی شاعیر

# پێڕست